# کاروانی پێنووس

(شاعیران و نووسەرانی مەریوان وهەورامان)

کۆکردنەوە و ئامادەکردنی:

فاتح مستەفایی

- له دایك بووی ۱۹۷۲ گوندی «زەکریان»ی مەریوان.
- کوڕی سەید محەممەد (له بنەماڵەی سەیدەکانی چۆڕ) و سەلما خاتوون.
- مامۆستای قوتابخانەکانی مەریوان له ۱۹۹۳ەوە.
- ۱۹۹۶ دەرچوون له زانکۆی کەرەج بە پلەی بەکالۆریۆس له بواری «پەروەردە»دا.
- له ساڵی ۱۹۹۹ەوە هاوکاری لە گەڵ گۆڤارەکاندا بە نووسینی وتارگەلی کۆمەڵایەتی.

# کاروانی پێنووس

(شاعیران و نووسەرانی مەریوان و هەورامان)

کۆکردنەوە و ئامادەکردنی:

فاتح مستەفایی

| | |
|---|---|
| سرشناسه | : مصطفایی، فاتح ۱۳۵۱. |
| عنوان نام پدیدآور | : کاروان پینووس / فاتح مصطفایی |
| مشخصات نشر | : سنندج، آراس۱۳۸۹ |
| مشخصات ظاهری | : ۳۲۵ ص |
| شابک | : ۹-۳۰-۵۸۵۶-۶۰۰-۹۷۸ |
| فهرست‌نویسی | : فیپا |
| موضوع | : شاعران کرد -- ایران -- قرن ۱۴ سرگذشتنامه |
| موضوع | : نویسندگان کرد -- ایران -- قرن ۱۴ سرگذشتنامه |
| رده‌بندی کنگره | : PIR۳۲۵۶ ۱۳۸۹ ۶م۲۱آ/ |
| رده‌بندی دیویی | : ۸فا۹/۲۱ |
| شماره کتابشناسی ملی | : ۲۲۳۲۵۸۸ |

## ناسنامەی کتێب

| | |
|---|---|
| نێوی کتێب | : کاروانی پێنووس |
| کۆکردنەوە و ئامادە کردنی | : فاتح مستەفایی |
| پێداچوونەوە | : عەزیز ناسری |
| ڕوو بەرگ | : هێمن کانی سانانی |
| بڵاوکردنەوە | : ئاراس ـ سنە |
| نۆرەی چاپ | : یەکەم – ۱۳۹۰ |
| نرخ | : ٦٥٠٠ تمەن |
| تیراژ | : ۱۰۰۰ دانە |

**ناوەندی بڵاو کردنەوە:**

**سنە ـ پاساژی عێزەتی ـ بڵاو کردنەوە ئاراس**

**تەلەفوون ۰۸۷۱-۲۲۲۸۳٤١**

پێشکەش بە:

**ڕۆحی باوک و دایکم کە گەورەییان لە «وشە»دا ئەزانی.**

## پێڕست

ناوەرۆک | لاپەڕە

**پێشەکی ئەحمەد قازی**

تێڕوانینێکی ورد لەو ڕووداوانەی بە دەور و بەرماندا تێ دەپەڕن و خۆمانیش دەوریان تێدا دەبینین، پێمان دەڵێن: بنەمای ژیان لە سەرەتای جیهانەوە تا ئێستا پرۆسەی فەوتان و هەستانەوەیە. ژیانی زۆربەی زیندەوەران بەوە دابین دەبێ کە بە هێزەکان بێ هێزەکان بخۆن و زۆردارەکان بێ زۆرەکان لە ناو بەرن.

ئەوە ڕەوەندی چەرخی زەمانە و تەنانەت ڕووەک و گیا و ئاوەژی ناو دەریا و ئادەمیزادەکانیش دەگرێتەوە.

کێشەی زاڵ بوونی «ئەم» بە سەر «ئەو»دا بە کوشتار و قەڵاچۆ کردن، تواندنەوەی گەلانی ژێردەست، بە گۆڕینی زبان و ئایین و فەرهەنگ و شێوەی ژیان و دەیان جۆری دیکە هەروا درێژەی هەیە. بێجگە لەوانە زۆر هۆکاری دیکەش هەن کە ڕەوتی ئەو گۆڕان و توانەوە و تێداچوونە بە تەوژم تر دەکەن، دژواری و گیروگرفتەکانی بەرێچوون، کۆچبار بوون بۆ دووره وڵات، ژیان لە مەنفادا و کاریگەری فەرهەنگە زاڵەکان و نغرۆبوون لە ناو بابەتی جۆراوجۆر و ئاسان بوونەوەی پێوەندی و تێکەڵاوی دەگەڵ هەموو جیهان بە هۆی ئەو گشتە ئامراز و کەرەسە جادوویی یانەوە ـ ئینترنێت، کامپیۆتێر، فەیس بووک، موبایل، کەناڵە زۆر و سەرنج ڕاکێشەکان ـ زۆر بە ئاسانی دەتوانێ «خۆت» لە خۆت بسڕێتەوە و بتکاتە بوونەوەرێکی ئاگا لە خۆنەماوی هەڵواسراو لە فەزایەکی خاڵی لە بوون و بنەچەک کە ناهومێدی و سەر لێشێواوی بەرهەمەکەیەتی.

هۆکارەکان بۆ سەر هەڵدانی حاڵەتێکی دەروونی لە خۆ بێگانە بوون، بێ ژمارن کە دەتوانین ئاماژە بە دەیان نموونە بکەین. دیتنی ژیانی پێشکەوتووی پڕ لە جم و جووڵ و هیوا و شانازی لە لای بەشێک لە وڵاتانی جیهان لە جەمسەرێک و داماوی و کڵۆڵی و چەق بەستوویی و تاریکی و نادیار بوونی ئاسۆی ژیانی داهاتوو لە جەمسەرەکەی تری جیهان دا کە تۆشی لە گەڵ دای، بەرەی تازەی پێگەیشتووی چاوکراوە لەم جەمسەرە دەباتە سەر هەڵدێری بێ هیوایی و دابڕان لە خۆی و

فەرهەنــگ و کەلەپــوورەکەی. ئەم حــاڵەتە دەروونــی یە هەر ئێــستا یەکێــک لە گیروگرفتەکــانی جیهــانی سـێهەمە کە ئـێمەی کـوردیش تێـی دا دەژیــن و وای لێکــردووین تەنــانەت نەتــوانین بە باشــی کەڵــک لە ئــاڵ و گۆڕەکــان و هەڵە هەڵکەوتووەکان وەربگرین. کورتەی کەلام: خۆ لە بیر بردنەوە و خۆ بە هێند نەگرتن بۆ تاک و بۆ کۆ، بۆ گەل و نەتەوە، هۆکاری سەرەکی فەوتان و تێداچوونە و ئەرکی ڕووناکبیری دڵسۆز و زانا بەرگری کردن لە پەرەگرتنی بارودۆخی لەم چەشنەیە.

لە بــارودۆخێکی وەهــادا، خۆناســینەوە، بە خۆداهــاتنەوە و گەڕانەوە ســەرخۆ، دەتوانێ وەک دژکردەوەیەکی کاریگەر وەبەرچــاو بگیرێ. هەر بزوتنەوەیەکـی لەم چەشنە بە تایبەتی زیندووکردنەوەی فەرهەنگ و زبــان و کەلەپـوور... دەتـوانێ ببێتە چەکی بەرگری لە دژی تێداچوون و توانەوە و خاشەبڕ بوون.

بەختەوەرانە، جەماوەرێکی بەرچاو لە ڕووناکبیرانمــان، لەو بــابەتەی بە کـورتی لە سەرەوە باسمان کـرد، تێگەیـشتوون و بە ویجـدانێکی مرۆڤـانی و بە شـێوەی مەدەنـی ئاوڕیان لەم ئاستەنگە داوەتەوە و تێکۆشاون پێش بە تێـداچوونی فەرهەنـگ و زبـان و شارستانەتی کورد بگرن کە جێگەی سپاس و ڕێزی هەموو دڵسۆزانی ئەم نیشتیمانەیە.

لەم ڕۆژانەدا چەپـکە گوڵێـک کە بریتـی بـوو لە کـورتە ژیـان نـامە و ئاسـەواری فەرهەنگـی بە هەمـوو سـیماکانیەوە ـ شـێعری، هـونەری، زانـستی ـ ئائینی و ... ـ کە نزیکەی سێ سەت کەسی لە نووسەران، شاعیران، هونەرمەنـدان و زانایـانی هەرێمـی هەورامان و مەریوانی لە خۆ گرتبـوو گەیـشتە دەسـتم. ئەم کتێـبە بە نـاوی «کـاروانی پێنووس» بە هیمەت و تێکۆشانی بەڕێز فاتێح مستەفایی بەرهەم هاتووە و هیوادارم زۆر زوو بگــاتە دەســت خـوێنەران. نووســەر بـۆ بەرهەم کردنـی ئەم گەنجینـەیە ئەرکـی گەورەی ڕاپەڕاندووە، سەری بە هەموو ماڵباتی هەورامان و مەریـوان دا کـردووە و لە هەر شوێنێک تووشـی قەڵەم بە دەسـتێک یـا خـاوەن هەسـتێک لە هەر بەسـتێنێک دا هــاتبێ هەڵـی قۆسـتۆتەوە، دەرفەتـی لە دەســت نەداوە و ڕاسـتگۆیانە بە سـەرهات و ئاسەواری ئەو کەسانەی تۆمار کردووە.

ئەوەی سەرنجی منـی ڕاکێشا ئەوەیە کە زۆربەی ئەم خۆشەویستانەی ناویـان لەم کتێـبەدا هــاتووە کەســانێکن لە بنەمــاڵە هەژار و نەدارەکــانی نــاوچە و زۆربەیـان بە زەحــمەت و لە ژێـر تەق و تـۆق و هاشــەی بۆمبـا و گوللەبــارانی گونـد و شـاری

ناوچەکاندا خۆیان پێگەیاندووە و بە پلەی بەرز و ورەی بەرزەوە درێژەیان بە خوێندن و کار وچالاکی خۆیان داوە، تا پێگەیشتوون و بوونەتە ڕۆڵەی بە ئەمەگی ئەم وڵاتە و ئاوڕیان لە فەرهەنگ و زبان و هەویەی خۆیان داوەتەوە. بە ڕاستی ئەوە دەرسێکە کە خوێنەر لەم کتێبە وەریدەگرێ و ئافەرین بۆ نووسەریش کە بە وردی ئاوڕی لەم لایەنە داوەتەوە.

ئەحمەد قازی ـ مەهاباد

٧ی ئاوریل ٢٠١١

## پێشەکی نووسەر

زانایان و ڕۆشنبیرانی کۆمەڵگا، چرا بەدەستانی ڕێگای ڕزگاری لە شەوەزەنگی نەزانی و تاریکین و ڕچەشکێنانی ڕێگای پڕ هەوراز و نشێوی کۆمەڵگان بەرەو پێشکەوتن. ئەوانن کە بە هەوڵ و تێکۆشانی بێ‌وچان، کۆمەڵگا لە زەلکاوی دواکەوتن ڕزگار ئەکەن و بەرە و ئاسۆی ڕوونی دەبەن.

بە وردبوونەوە لە ژیان و بەسەرهاتی زانایان و گەورەکانی هەر وڵاتێک، ڕادەی شارستانییەت، ئاستی زانست، هۆکارەکانی دواکەوتن و پێشکەوتنی ئەو گەلەمان بۆ دەرئەکەوێت.

کۆمەڵگای کوردەوەرای وەک هەموو کۆمەڵگاکانی‌تر خاوەنی پێنووس و بیر و هزری تایبەتی خۆیەتی و بە پێی هەل و مەرجەکان، لە هەرقۆناغێکدا کەسانێک خۆبەخشانە و دڵسۆزانە چوونەتە ژێر دارەلۆسی[1] فەرهەنگ و هونەری ئەو کۆمەڵگایە. خزمەتی خۆیان بە پێی هەل و دەرفەت و تواناکان درێخ نەکردووە.

مەریوان ئەودەڤەرە زانا پەروەرەیە کە لە مێژە بە «دارالعلم» ناسراوە. ئەگەر چاوێک بە کتێبخانەی کوردی و کتێبخانەی گەلانی‌تریشدا بخشێنین لە ناوی کەڵە زانایانی مەریوانی خاڵی نیە. کەسانێک وەک ئەستێرەی پرشنگدار لە ئاسمانی زانست و هونەر و عیرفاندا ئەدرەوشێنەوە. ئەم مەڵبەندە بە پێزە، هیچ کات بێ‌بەش نەبووە لەو سامانە کۆمەڵایەتییە. بەڵام سەد مەخابن لە بەر هەتیو بوونی نەتەوەکەمان و ئاستی نزمی خوێندەواری جەماوەر، وەک شیاو ڕێز و بایەخیان پێنەدراوە و تەنانەت زۆر جاریش ناو و ناتۆرەی خراپیان بۆ هەڵبەسراوە. ژیانیان پڕ بووە لە تەنگ و چەڵەمە و تاڵی و سوێری و ئاوارەیی. ڕاوەدوونان بووە بە بەشێک لە ژیانیان. وڵاتانی پێشکەوتوو و گەلانی تێگەیشتوو تا کاتێ زاناکانیان زیندوون، ڕێزیان لێئەگرن و کۆڕ و کۆبوونەوەیان بۆ ساز ئەکەن و بە ناوی ئەوانەوە شەقام و کۆڵان ئەڕازێننەوە. بەڵام بە

---

[1]. دارە لۆس: دارێکی ئەستوور و قورس بوو، پێشتر کە کەرەستەی گوساتنەوە نەبوو خەڵکی بە یارمەتی یەکتر ئەیانگواستەوە و لە خانووسازیدا بە جێگای تیرئاسنی ئەمڕۆ کەڵکیان لێ وەرئەگرت.

داخەوە ئـێمە دوای خۆیـان لە بەر بڕێـک بەرژەوەنـدی نـاوی هەنـدێکیان ئەبەیـن و ئەگەریش پێمان کرا لەبەر گلەیی کۆبوونەوەیان بۆ ساز ئەکەین و...

ڕێبوارانی زانا و دڵسۆز و لێهاتووی ئەم ڕێگا پڕ هەوراز و نشێوە، وێڕای کۆسپ و تەگەرە، لەو پەڕی زەحمەت و تێکۆشاندا، ئەم کاروانە درێژە پێئەدەن.

وڵاتی ئێمە وێڕای تایبەتمەندی ڕۆژهەڵاتییانەی خۆی لەم سەردەمەدا، بـێ بەهـرە نییە لەو ئـازیزە زەحمەتکێـشانە کە بـۆ هێـشتنەوە و پەرەپێـدانی فەرهەنـگ و تـۆرەی نەتەوەکەیان خەویان لە خۆ زڕاندووە و بە پشت کـردن لە زۆرێـک لە خۆشـییەکانی ژیان ئەو ڕێبازەیان درێژە پێداوە.

بە هەسـت کـردن بەم بۆشـاییە و بـاوەڕ بە کـاریگەری ئەرێنیـی نووسـەران و ڕووناکبیران، بە باشم زانی کە بە کەڵک وەرگرتن لە زانـست و گەورەیـی خۆیـان لە زەمانی خۆیانەوە بە کۆمەڵگایان بناسێنم، بۆ ئەوەی لە هزر و بیری ئەوان زۆرتر کەڵک وەربگرین و بیانکەین بە نوێنەرێک بۆ نەوەکانی سبەینێمان و تا دوای خۆیان خەڵکی بە مەیلی خۆیان بۆیان نەبڕن و بۆیان نەدروون.

لە ماوەی ئەم چوار پێنج ساڵەدا کە خەریکی کۆکردنەوەی ژیان و بەسەرهاتی ئەو ئازیزانە بووم، زۆر شتی شـیرین و تـاڵم بینـی کە کـاریگەری زۆریـان لە سـەر دانـام: شیرین ئەوە بوو کە هەرکامێ لەو پێنووس بەدەستانە لەو پەڕی گەورەیی و دڵسۆزی و دڵپاکیدا، هیچ شتێکیان لێ نەئەشاریمەوە و دڵە گەورەکانیان بۆ ئـاوەڵا ئەکـردم و هەر کامیان بە تەنیا، بۆ من کتێبخانەیەک بوون. بەڵام ئەوەی کە تاڵ بوو:

**یەکەم:** دژوار بوونی باری ژیانی زۆربەیان، هەڵنەسوڕانی ژیانی ئاساییان تا بگاتە بە چاپ گەیاندنی بەرهەمەکانیان.

**دووهەم:** هاوکاری نەکردنی هەندێکیان.

**سێهەم:** کۆچی دوایی چەند کەسێکیان هاوکات لە گەڵ کۆکردنەوەی ئەم بابەتە، کە زۆر لە سەر دڵم گران بوو.

ناوی کتێبەکە!

لە دوای بیروڕا گۆڕینەوە و خۆماندوو کردنی زۆر بۆ ئەوەی چ ناوێک لەم کتێبە بنێم، «کاروانی پێنـووس»م بە چـاک زانـی. لە بەر ئەوەی کـاروان دایـم لە چـوون و نەسرەوتنە و کۆتایی پێ نایەت. جێگای ئاماژەیە نووسەرانی مەریوان و هەورامان تەنیا

ئەم کەسانە نین کە من ناوم هێناون، بەڵام ئەوانەی وا ناویان نەهاتووە لە بەر چەند هۆیەکە:

**یەکەم:** خۆ دەرنەخستن و نادیار بوونی بڕێکیان.

**دووهەم:** وێڕای هەوڵ و تێکۆشانی خۆم، پێم نەزانیون.

**سێهەم:** خۆیان نەیان ویستووە ناویان ببەم.

**ڕوونکردنەوە:**

نووسەر لەم کتێبەدا کەسێکە، لە بوارەکانی ڕۆشنبیری و فەرهەنگیدا هەوڵی دابێت و نوسراوەی هەبێت. مەریوان و هەورامان لە باری فەرهەنگییەوە ئەوەندە تێکەڵاون کە وەک دوو برای دوانە یەکیان لە ئامێز گرتووە و جیاکردنەوەیان ئەستەمە. مەبەستیش لە هەورامان لەم کتێبەدا «هەورامانی تەخت»ە.

ئازیزی خوێنەر!

زۆر هەوڵمدا کە ئەم بەرهەمە کەمتر هەڵەی تێدا بێ و بەڵام بێگومان هیچ کارێ بێ هەڵە نییە و تەنیا خودایە کە بێ هەڵەیە. هەر بۆیە داوا لە خاوەن بیران ئەکەم بۆ پشت ڕاست کردنەوەی هەڵەکان یارمەتیم بدەن و بۆ ئەوەی لە چاپەکانی داهاتوودا ڕچاو بکرێ.

لە کۆتاییدا جێگای خۆیەتی سپاسی گشت ئەو ئازیزانە بکەم کە لە کۆکردنەوەی ئەم کتێبەدا ڕێنموونیان کردم و لە هیچ هاوکارییەک خۆیان نەبوارد، بە تایبەت کاک ئەحمەد قازی، نووسەر و وەرگێڕی لێهاتوو، دۆستی شاعیر و خۆشەویستم عەزیز ناسری و هەروەها هاوسەرم کە یارمەتیدەری بێوچان و هاندەری سەرەکی بوو بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ئەم بەرهەمە.

فاتح مستەفایی ـ مەریوان

٢٠١١ ی زایینی

# شاعیران و نووسەرانی بەر لە سەدەی ١٤ی زایینی

## سەید محەممەد زاهید

نازناوی«زەهیرەدین» و ناسراو بە «پیر خزری شاهۆ»، یەکێ لە خواناسان و زانایانی گەورەیە کە ڕەچەڵکی زۆربەی سەیدەکانی کوردستان بۆلای ئەو ئەگەڕێتەوە. ئەم زانا پایە بەرزە لە سەدەی حەوتەمی کۆچیدا ژیاوە[1] و گۆڕەکەی لە گوندی پیرخزرانە. یەکەمین کوردێکی کە وشەی «پیر»یان بۆ بەکار هێناوە، ئەم کەسایەتییە بووە[2].

## شێخ عەبدولڕەحمان ڕوکنەددین کاکۆ زەکەریایی[3]

شێخ عەبدولڕەحمان ناسراو بە «روکن الدین» کوڕی شێخ ئەحمەدی سامت کوڕی شێخ محەممەد سادق فازڵ و لە بنەماڵەی شێخەکانی کاکۆ زەکەریا و لە خواناسانی سەدەی نۆهەمە کەخاوەنی کتێبی«فرض و سنت[4]»ە.

لەکاتی منداڵیدا لە گەڵ باوکی ئەڕوات بۆ سەفەری حەج، لە کاتی حەجدا باوکی ماڵئاوایی لە ژیان ئەکات. شێخ عەبدولڕەحمان تا تەواو کردنی خوێندنی لە وڵاتی حیجاز ئەمێنێتەوە و پاشان بۆ زێدەکەی خۆی «کاکۆزەکەریا»ئەگەڕێتەوە.

## پیرشالیاری یەکەم[5]

کوڕی جاماسب، پیاوێکی زانا و گەورە بووە و لە سەر ئەوەی کە لە سەدەی یەکەم یان پێنجەمدا بووبێت جێگای باسە. لەم نووسەرە کتێبێک لە ژێر ناوی «مارەفەتو پیری» کە بریتییە لە پەند و ئامۆژگاری و داب و نەریتی ئایینی کۆن وەک

---

١. تاریخ مشاهیر کرد، بابا مەردۆخ رۆحانی، بەرگی یەکەم، ل ٦٣.

٢. نورالانوار، سەید عەبدولسەمەد توداری، ل٩٣.

٣. هەمان سەرچاوە، ل ١٣٧.

٤. هەمان سەرچاوە، ل٧١.

٥. تاریخ مشاهیر کرد، بابا مەردۆخ ڕۆحانی، بەرگی یەکەم، ل ٢.

یادگار بە جێماوە ئەم کتێبە زۆر نایابە و تەنیا لە بیر و هۆشی بڕێک لە خەڵکی ئەو ناوچەیەدا ماوەتەوە.

وەوریێ وەوارۆ، وەورە وەرێنە — ورێسە بڕێو، چوار سەرێنە
کەرگەی سیاوە، هێڵە چەرمێنە — گۆشڵێ مەمەڕێۆ، دوەبەرێنە

## پیرشالیاری دووهەم[1]

ناوی سەید مستەفایە و بە ناو پیرشالیاری دووهەم بە ناوبانگە. ئەم زانایە هاوچەرخی شێخ عەبدولقادر گەیلانی (١٠٥٠- ١١٤٠ز.) بووە. سەید مستەفا لە ساداتی حسێنییە. لە سەر خواستی خەڵکی هەورامان، پێداچوونەوەیەک بە سەر کتێبی «مارەفەتو پیری» پیرشالیاری یەکەمدا ئەنجام ئەدات.

## شێخ نیعمەتوڵڵا کاکۆ زەکەریایی(یەکەم)[2]

کوڕی شێخ کەمالەددین زەکەریا و لە شێخەکانی کاکۆ زەکەریایە و بە «وەلی» ناسراوە. ساڵی١١٠٦ی زایینی چرای ژیانی کوژاوەتەوە. خواناسێکی گەورە و زانایەکی پایەبەرزی سەردەمی خۆی بووە و لە ئەدەبیاتی عەرەبی و فارسیشدا زۆر شارەزا بووە و شێعری هۆنیوەتەوە و ناز ناوی «سەید»ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە.

حمد بی حد خدای یکتا را — آن که جان داد و عقل و دین ما را
ذات پاکش ز عیب و عار بری است — خالق آدمیّ و جنّ و پری است
هر چه ظاهر شد از ارادت او — نیست مقصود جز عبادت او
حق پرستی تو را سر دین است — به یقین راه مستقیم این است
پیرو پاک دین احمد شو — تابع ملت محمد شو
احمد مرسل است فخر بشر — گرد نعلین اوست، کحل بصر
آدم از قرب احمد است کبیر — عالم از نور احمد است منیر
صد هزاران درود بی پایان — باد بر مصطفی و بر یاران
این کتاب کفایة الاسلام — هر کسی یاد کرد، یافت نظام

---

١. تاریخ مشاهیر کرد، بابا مەردۆخ ڕۆحانی، بەرگی یەکەم، ل ٤٧.
٢. هەمان سەرچاوە، ل ١٢٢.

**له درێژەی هۆنراوەکەیدا ئەڵێ:**

یارب از فضل خویش رحمت کن / جای «سیّد»، مقام جنت کن
«نعمة الله» را ببخشایی / که سمیع و بصیر و دانایی
«نعمة الله» راست در دو سرا / حل هر مشکلی به فضل خدا
وآنکه خواند دعا طمع دارم / زانکه من بنده ی گنه کارم

## شێخ نیعمەتوڵڵای کاکۆ زەکەریایی(دووهەم)[1]

له شێخەکانی کاکۆ زەکەریایە، پیاوێکی زانا و شاعیرێکی پایەبەرز بووە. له کتێبی «تاریخ مشاهیر کرد»دا نووسراوە که ساڵی له دایک بوون و کۆچی نادیارە و بابا مەردۆخ بە پێی هۆنراوەیەکی خودی "شێخ نیعمەتوڵڵا" ئەڵێ که له کەسایەتییەکانی سەدەی دەوانزەهەم بووە.

به پیش گلشن رویت نزاکت گل چیست؟
به پای زلف رسای تو گوی سنبل چیست؟
به بزم مجلس میخوارگان ندارم کار
چو چشم مست تو باشد گوارش مل چیست؟
گرفته شهر دلم، پیچ و تاب زلف کجت
هجوم رشتەی کافردلان کاکل چیست؟
شهید غمزەی خود کرده ای دو عالم را
به کشتن من بیچاره این تأمل چیست؟
به رغم مدعیانم نواختی اول
بگو در آخر کار این همه تغافل چیست؟
در آن زمان چو کشم آه و نالەی سوز
ز هجر گلشن رویت فغان بلبل چیست؟
ترا به بندکشد، تا کُشَد، شبی «نعمت»!
وگرنه حلقەی زلف پر از تسلسل چیست؟

١. هەمان سەرچاوە، ل ٢٥٥.

## محەممەدی کوڕی مەلا ڕەزای مەریوانی

ساڵی ١١٨٢ی زایینی لە مەدرەسەی بیارە لە فەرمانڕەوایی محەممەد پاشادا کتێبی «العدة المبارکة»ی نووسیوە[1]، بەڵام شوێن و ساڵی لە دایک بوون و کۆچی دوایی نادیارە.

## پیر یۆنس هەنجیران

کوڕی شێخ زەکەریا کوڕی شێخ عەبدولڕەحمانی «ئەدهەل»ە. لە سەدەی سێزدەهەمی زایین دا ژیاوە.

بنازید ای مسلمانان بباب من که سلطانم
بلطف خود کنم اعطا، چرا سلطان دورانم
نبارد قطرەای باران که خارج باشد از امرم
تعالی الله چه سان نافذ نمودە حکم و فرمانم
گهی با باد می‌آیم گهی با ابر می نالم
گهی من جوهر فردم گهی من مهر تابانم
زمان و هم مکان محکوم حکم من شدە، بی شک
همین فضل از خدا باشد که من از جان جانانم
برادر کو بود شه نعمت الله ولی بی شک
پدر باشد زەکەریا جد ادهل شاه دورانم
همه فرع شاذلی کز سبط پیغمبر
امام مجتبی یعنی حسن آن شاه شاهانم
اگر پرسی زمن، «یونس» منم سلطان این دوران
کریم ابن الکریم ابن الکریم و خاص خاصانم[2]

---

١. "بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد"، محەممەد عەلی قەرەداغی، بەرگی دووهەم، ل ١٨.

٢. نور الانوار، سەید عەبدولسەمەد توودەری، ل ٦٣.

# شاعیران و نووسەرانی سەدەی ١٤ی زایینی

## مەولانا محەممەدی گوشایش[١]

ناسراو بە گوشایش، کوڕی میر محەمەدی مەردۆخ(بابامەردۆخ)ە و ساڵی ١٣٦٩ی زایینی چاوی بە ژیان هەڵێناوە. سەرتای خوێندنی لە هەورامان دەست پێکردووە و بۆ فێر بوونی زانست لە هەر لایەک ناوی زانایەکی گەورەی بیستبێ، ڕۆیشتووەتە خزمەتی و لە خەرمانی زانستی گوڵی چنیوە و بەهرەی بردووە. دوای وەدەست هێنانی خەرمانێک لە زانست و ئەدەب، گەڕاوەتەوە هەورامان، واتە زێدەکەی خۆی.

ئەم زانایە دوای خزمەتێکی زۆر بە خەڵکی هەورامان لە بواری ئایین و زانستدا، ساڵی١٤٥٢ ماڵئاوایی لە ژیان ئەکات.

## شێخ عەبدولڕەحمان جانەوەرە

کوڕی شێخ محەممەدی کوڕی شێخ مەحموود لە شێخەکانی بنەماڵەی بست و شێخ حەسەن مەولاناوایە کە لە سەرەتای سەدەی چواردەهەمدا لە گوندی «جانەوەرە» ژیاوە و برای شێخ عەزیزی شاعیرە. شێخ عەبدولڕەحمان ئەدیب و شاعیرێکی بە توانا بووە کە دیوانێکی شێعری بە زاراوەی هەورامی داناوە و نازناوی «ڕەحمان»ە. ڕەحمان لە سەرەتای لاویدا ئەوینداری کچە شۆخێک لە خێڵی جاف بە نێوی «ئەمان»بووە کە ئەو کچە جوانەمەرگ ئەبێ. زۆربەی هۆنراوەکانی ئەم شاعیرە بۆ ئەو ئەوینە ناکامەیە.

دیدەم دیسان چەرخ چەواشەی بەدخۆ
سازان فێڵێ پەی دووری من و تۆ
ئەوجار وەتاقێق دووری ؟! تۆ سەردان
منت وێنەی قەیس کەردەن سەرگەردان

---

١. تاریخ مشاهیر کرد، بابا مەردۆخ ڕۆحانی، بەرگی یەکەم، ل ١٣١.

هەنــی مــن وەکــێ خــاتر کەرۆ شــاد
وەبــۆنەی کێــوە غەم بــدەم وەبــاد
حەیــفەن ڕاز نەرم کــێ نە گۆشــم بــۆ؟
شــەوان دەســت کــێ نە ئاغۆشــم بــۆ
ســـا بـــا بنـــاڵووم مـــن وەی زامەوە
وەی زام کـــــاری بـــــێ دەوامەوە
پـــاڵ بـــدەم وە ئـــێش زام ســـەختەوە
وەی زام کـــاری شـــوومی بەخـــتەوە
شــەڵڵای ڕۆی ئەزەڵ دیــدەم کــۆر بیــا
دیــدەم! تــا دیــدە دیــدەی تــۆ نەدیــا
نەوینـــام وەچەم لادێ خـــاڵ تـــۆ
نەبۆســام ســەرخەد، لیمــۆی کــاڵ تــۆ
نە گـــێلام چەنیـــت شـــەوان کەرۆم ڕاز
ســەرم جە ســەودات نەبیــان ســەرئەفراز
چـــون وەی تەور تەقـــدیر کەردش حەواڵە
هەنـــــی دیـــــدەنی بـــالات محـــاڵە
ئـــازاد کەر گەردەن، ئـــاخر لـــوامەن
کـــــــۆچ نەوەدڵ ئەوەونامـــــــامەن
مــن خــودا حــافیز، تــۆیش بنــیش وە شــاد
داخ بەردم وە گــڵ، منــیش چــون فەرهــاد

## شێخ عەزیز جانەوەرە

کوڕی شێخ محەممەدی کوڕی شێخ مەحموود لە شێخەکانی بنەماڵەی بست و شێخ حەسەن مەولاناوایە کە لە گوندی «جانەوەرە»ژیاوە. پیاوێکی زانا و شاعیرێکی پایەبەرز بووە. شێخ عەزیز هاوچەرخی مەولەوی تاوەگۆزی بووە و دۆستایەتییەکی نزیکیان لەنێواندا هەبووە. شێخ عەزیز لە سەرەتای سەدەی چواردەهەمدا، کۆچی دوایی کردووە.

## پیر ناری هەورامی[1]

لە سەدەی چواردەهەمی زایین‌دا ژیاوە. پیرناری هەورامی لە هەورامان لە دایک بووە و هەر لەوێش پێگەیشتووە. بە شوێن زانست و فێر بووندا زۆر شوێن و مەڵبەند گەڕاوە و دواتر گەڕاوەتەوە زێد و مەڵبەندەکەی خۆی و هەر لەوێ کۆچی دوایی کردووە.

یاران مزگانی شام نە کۆی مێرەن
میرم نۆشزادەن سەرمایەی خێرەن
شاهم شاپوورەن پوور ئەردەشێرەن
پەرێ دوژمنان چون وەچکە شێرەن
میرش سەنجنی وە چەشمەی یاری
نەبەرەش ئۆرمزد وێش دا دیاری
چاقا وارما وە ئاشکاری
مێردانش جەم بین پەی رەستگاری
مەولام ڕەنگبازەن ڕەنگ مەدۆ وەکۆچ
کۆچش تاری شەو مەکەرۆ وە ڕۆچ

## کابل[2] مەریوانی

ئیبراهیم ناسراو بە کابل بەرزنجی کوڕی سەید مەحموودی کوڕی سەید عەبدولکەریمی سەید عیسای بەرزنجییە. لە گوندی «بەرزنجە» لە باکووری سلێمانی لە دایک بووە. سەرەتای خوێندنی بە قورئان و کتێبە سەرەتاییەکانی ئەو سەردەمەوە دەست پێئەکات و بۆ گوڵ مژین لە گوڵستانی زانست ئەچێتە وڵاتی «میسر» و دواتر دێتەوە مەریوان و لە گوندی «نولۆ[3]» نشیتەجێ ئەبێت و تەدریس و ڕێنموونی خەڵک بۆ لای ئایین دەست پێئەکات. لە سەردەمی ئەمیر حەمزەی باباندا ئەبێ بە مودەڕیسی

---

١. بڕوانە کتێبی "مێژووی وێژەی کوردی"، سدیق بۆرەکەیی (صفی زادە) بەرگی یەکەم، ل ٢٦٩.

٢. کابل، کورت کراوەی «کاکە بلە» یان «کاکە ئیبراهیم»ە.

٣. گوندێک بووە لە پشت گوندی«دەرەتفێ»وە کە ئێستا تەنیا گۆڕستانەکەی ماوەتەوە.

قوتابخانەی «مزگەوتی سوور[١]» و لەو پەڕی ڕێز و حورمەتدا ئەمێنێتەوە. کابل خاوەن ڕێبازی «نووربەخشی[٢]» بووە و ئەو ڕێبازەش شوێنکەوتووانی خۆی هەبووە.

ساڵی ١٤٠٢ی زایینی ماڵئاوایی لە ژیان ئەکات و لە سەرخواستی خۆی لە گۆڕستانی تایبەتی «دەرەتفێ» بە خاك ئەسپەردە ئەکرێت.

### فازڵ کاکۆ زەکەریایی[٣]

شێخ محەممەد سادق ناسراو بە «فازڵ» کوڕی شێخ نیعمەتوڵڵای وەلی کاکۆ زەکەریایە. زانایەکی پایە بەرز بووە و لە زۆربەی زانستەکاندا شارەزایی هەبووە. کتێبی «قاموس الانساب»ی لە سەر بنەماڵەی سەیدەکانی کوردستانی نووسیوە.

## شاعیران و نووسەرانی سەدەی ١٥ی زایینی

### مەلا ئەبووبەکر موسەننیفی چۆڕی

مەلا ئەبووبەکر موسەننیفی چۆڕی، محەممەد حەسەن کوڕی سەید هیدایەتوڵڵا کوڕی مەولانا یۆسف جان کوڕی سەید حسێن لە پشتی پیرخزری شاهۆیە. ساڵی ١٤٨٨ی زایینی چاوی بە ژیان هەڵێناوە. زانایەکی پایەبەرز و نووسەرێکی بەتوانا و شاعیرێکی گەورە بووە. لەبەر زۆر بوونی نووسراوەکانی بە موسەننیف ناسراوە. موسەننیف زۆر بەرهەمی بۆ دوارۆژ بە جێهێشتووە، بۆ وێنە دەتوانین ئاماژە بکەین بە: الوضوح، طبقات الشافعیه، سراج الطریق و ریاض الخلود.

ئەم زانایە لە گوندی چۆڕ کۆچی دوایی کردووە، بەڵام ڕێکەوتی وەفاتی لە "هیدایة العارفین " و چەند سەرچاوەیەکی تردا ساڵی ١٥٧٨ی زایینی نووسراوە

---

١. مزگەوتی سوور، لە پشت گوندی «بەرقەڵا» و پەنای کێوی «ئیمام» هەڵکەوتووە، کە بە داخەوە دارو پردووەکەشی لە ناو چوون و تەنیا برێ خشتی برژاوی لێ بە جێماوە.

٢. ڕێبازی «نووربەخشی» لە سەربنەمای "کتێب" و "سوننەت"و سەر لە بەیانی و دەمەوئێوارن بەردەوام بوون لە سەر "اذکار و اوراد".

٣. تاریخ مشاهیر کرد، بابا مەردۆخ ڕۆحانی، بەرگی یەکەم، ل ١٢٩.

وسەرچاوەگەلی تریش وەک "الاعلام" ١٥٩٣یان دیاری کردووە.

ای زبـان هـم خـازن گنجینـەای / وی زبـان هـم آفـت دوشـینەای
ای زبـان هـم قفـل معنـی آمـدی / همچـو دشـمن هـم بـدعوی آمـدی
گـاه چینـی خوشـە از بهـر تـنم / گـاه آتـش میزنـی در خـرمنم
گـاه در بـازار، صـرّافی کنـی / گـاه در تزویـر، حلّافـی کنـی
گـە بـری مـا را بـاوج اصـطفا / گـە بـری در چـاه اغـواء جفـا
گـە کنـی مـا را بعـالم سـربلند / گـە کنـی مـا را بعـالم مـستمند
گـە ز تـاج اجتبـا افـسر کنـی / گـاه افـسار شـقی بـر سـر کنـی
گـە بعلیـیّن بـری مـا را چـو مِهـر / گـە بـسجین مـی بـری از روی قهر
گـە شـود «ابـن هـدایت» شـاد دل / از زبـان، گـە میشود خـوار و خجـل

# شاعیران و نووسەرانی سەدەی ١٦ای زایینی

## شێخ ڕەزا موعینەددین کاکۆ زەکەریایی[1]

کوڕی شێخ مووسا کوڕی شێخ مەحموود شوجاعەددین کوڕی شێخ عەبدولڕەحمان لە شێخەکانی کاکۆ زەکەریایە. ئەدیبێکی پایەبەرز و خواناسێکی گەورە بووە و کتێبێکی بە نێوی «مسلک السالک» لە چۆنییەتی ئادابی تەسەووفدا بە زمانی فارسی نووسیوە. ئەم زانایە لە سەدەی شانزەهەمدا چرای ژیانی کوژاوەتەوە.

دشـمنان جهـان بـە مـذهب مـن / دوسـتانند و دوسـتان دشـمن[2]

## شێخ شەهابەددین کاکۆ زەکەریایی[3]

کوڕی ڕەزیەددین کوڕی شێخ ڕەزاموعینەددین کاکۆ زەکەریایە. ساڵی ١٥٨٢ی زایینی چاوی بە ژیان هەڵێناوە و ساڵی ١٦٥١ لە گوندی «کاکۆ زەکەریا» ماڵئاوایی لە ژیان کردووە. شێخ شەهابەددین شاعیرێکی پایەبەرز بووە. وەک سەیدی لە

١. تاریخ مشاهیر کرد، بابا مەردۆخ ڕۆحانی، بەرگی یەکەم، ل ١٦٢.
٢. بڕوانە کتێبی نورالانوار، سەید عەبدولسەمەد توداری، ل٧٤.
٣. تاریخ مشاهیر کرد، بابا مەردۆخ ڕۆحانی، بەرگی یەکەم، ل ٢٠٤.

هۆنراوەکانیدا لە کێشی عەرووزی کەڵکی وەرگرتووە. لە کاتی هێرشی هێزەکانی قزڵباش بۆ مەریوان و ڕاوڕوت کردنی ناوچەکە بەتایبەت گوندی «کاکۆ زەکریا» بە شێعر گلە و گازەند بەرز ئەکاتەوە:

پیــر یــۆنس هانــا! پیــر یــۆنس هانــا
مەزڵوومــان دایــم لای تۆشــەن هانــا
نەبیـــرەی ئەکـــرەم شـــاەمەردانی
فرزەنـــد دڵبەنـــد شـــێخ زەکریـــانی
پەی وایەمەنـــدان عەجەب دەرمـــانی
چـــون شـــێر کەمین،حـــازر مەیـــدانی
ئینتقـــام جـــاگەی بابـــای ئەکرەمـــت
بە شـــەپۆل کـــین قەلـــب قولزمـــت
بـستان جە لەشـکر دوژمـن بـێ ئەنـدێش
نمـــازی یەکـــێ بـــشۆ وەجـــای وێـــش
«شـەهاب»هەر چـی هەن نەسـڵ ڕەسـووڵەن
زورڕیەی تـــاهیر عەلـــی و بەتـــوولەن

**خەیاڵی**

ناوی محەممەد کوڕی شێخ حەیدەر لە بنەماڵەی شێخەکانی «کۆنەپۆشی»یە. لە سەردەمی دەسەڵاتی سەفەویدا ژیاوە و دانیشتووی گوندی «سەڵەسی» و شاعیرێکی پایەبەرز و خەت خۆش بووە. لە پێشەکی دیوانەکەی مامۆستا قانعدا نووسراوە «سەید محەممەد کۆنەپۆشی مەریوانی، نازناو خەیاڵی، لە سەدەی دەهەمی کۆچیدا ژیاوە. قورئانێک و دیوانێکی شێعری بە خەتی خۆی لێ بە جێماوە. چەند بەرگ لە هەرکامیان ماوەتەوە کە دڵۆپە، بەشی زۆریانی خراپ کردووە و ناخوێنرێتەوە». بە زاراوەی سۆرانی شێعری هۆنیوەتەوە. لە شێعرەکانیدا باسی هێرشی سەربازانی قزڵباش و ئەزیەت و ئازار و خراپیی ڕۆژگاری کردووە[١].

١. هەمان سەرچاوە، ل ٢٠٤.

# شاعیران و نووسەرانی سەدەی ١٧ی زایینی

## مەلا یۆسف جانی چۆڕی[1]

کوڕی مەلا ئەبوبەکر موسەننیفی چۆڕییە. ناوی ئەم مامۆستایە بە شوێنی ناوی باوکیدا دێت و یەکێ لە چوار کوڕەکەی مامۆستا موسەننیفی چۆڕییە و لە سەدەی حەڤدەهەمدا ژیاوە. ئەم نووسەرە پلەی خوێندەواری بەرز بووە و مامۆستایەکی بەڕێزی سەردەمی خۆی بووە و فەقێ و قوتابی و شەیدایانی زانست پەروەر لە دەوری خڕبوونەتەوە و لە بەرهەمی بەهرەمەند بوون. لە بواری نووسیندا، بەرهەمی ڕەنج و زەحمەتی ئەم زانایە کتێبی«اعلام التصریف»ە.

## مەلاعەبدولغەفاری دووهەم[2]

کوڕی شێخ شەمسەددینی وەلی مەردۆخییە. ساڵی ١٥٤٨ ی زایینی لە گوندی «دەگاشێخان» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. لە زانستی بیرکاری(ریاضی) و پزشکی و ئەستێرە ناسیدا زانایەکی کارامە و لێهاتوو بووە. لە سەر خواستی هەڵۆخانی ئەردەڵان ئەڕواتە سنە و ساڵی ١٦٠٥ لە حەسەن ئاوا کۆچی دوایی ئەکات.

## شێخ ئیبراهیمی هەورامانی[3]

ئەم زانا پایەبەرزە بۆ فێر بوون و زانست زێدەکەی بە جێ هێشتووە و لە وڵاتی حیجازدا گیرساوەتەوە و تا کۆتایی ژیانی لەوێ ماوەتەوە. ساڵی١٦٧٧ی زایینی کۆچی دوایی کردووە.

## مەلا سەید عەبدولکەریمی چۆڕی[4]

کوڕی مەلا ئەبوبەکری موسەننیفی چۆڕییە. ساڵی١٦٢١ی زایینی ماڵئاوایی لە ژیان

---

١. "بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد"، محەممەد عەلی قەرەداغی، بەرگی یەکەم، ل٣٤١.
٢. تاریخ مشاهیر کرد، بابا مەردۆخ ڕۆحانی، بەرگی یەکەم، ل ١٧٨.
٣. هەمان سەرچاوە ل١٨٦.
٤. هەمان سەرچاوە، ل ١٨٧.

کردووه. لەم زانایە ئەم کتێبانە ماونەتەوە: تەفسیری قورئانی پیرۆز تا سورەی «النحل» لە سێ بەرگدا، المتوسط، الاوضح و انزال الاخوان لە پەند و ئامۆژگاریدا.

### شێخ ئیبراهیمی شارانی

کوڕی شێخ حەسەن کوڕی شەهابەددین نەوەی پیر خزری شاهۆیە و بە «ئیبراهیم گۆرانی شارانی شارەزووری» ناسراوە. ساڵی ١٦٠٤ی زایینی لە گوندی «شارانی» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. زانایەکی پایە بەرز و خواناسێکی گەورە بووە. بیست و هەشت بەرهەمی وەک کتێب نووسیوە. بە پێی کتێبی «علمائنا فی الخدمة العلم و الدین» دوانیوەرۆی ڕۆژی چوارشەممەی ساڵی ١٦٨٠ لە شاری مەدینە کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی بەقیع ئەسپەردە کراوە.

### مەلا جامی چۆڕی

کوڕی مەلا عەبدولکەریم کوڕی مەلا ئەبووبەکر موسەننیفە. ساڵی ١٦٦٢ی زایینی لە سەر خواستی بداق سوڵتانی کوڕی شێرخان کوڕی حەیدەرخان حاکمی موکریان، چۆڕی بە جێ هێشتووە و چووەتە سابڵاخ. بداق سوڵتان "مزگەوتی سوور" دروست ئەکات و مەلا جامی بەڕێوەبردنی کاروباری ئایینی و مامۆستایی ئەو حوجرە و مزگەوتە بەئەستۆوە ئەگرێ و تا کۆتایی ژیانی لە مەهاباد ئەمێنێتەوە. گۆڕی ئەو زانایە ئێستا لە مەیدانی مەلاجامی شاری مەهاباد هەرماوە.

## شاعیران و نووسەرانی سەدەی ١٨ی زایینی

### مەلا خزری ڕووار

کوڕی مەلا ئەحمەد کوڕی مەلا محەممەد کوڕی میرزا حەکیمی حەککایە. بەپێی وتەی زانای ڕەچەڵەک ناسی کورد مامۆستا «عەبدولسەمەدی تووار» تا هەشت پشتی هەر لە کوردستان ژیاون. خەڵکی گوندی «ڕووار» لە ناوچەی هەورامانە. لە کتێبە مێژووییەکاندا بۆ ساڵی لە دایک بوونی مەلا خزر، جیاوازییەک

هەیە. مامۆستا «مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس» لە کتێبی «علمائنا فی الخدمةِ العلم و الدین»دا ئەڵێت: مەلا خزر لە ساڵی ١٧١٩ی زایینی لە دایک بووە. کەچی بابا مەردۆخی ڕۆحانی لە مەشاهیری کورددا ئەڵێت ساڵی١٧١٧ی زایینی لە دایک بووە. «مەلای ڕووار» بۆ خوێندن ناوچەکانی سنە، سابڵاخ، لەیلاخ، سلێمانی و قەڵاچوالان گەڕاوە و هەر لە قەڵاچوالان لای زانای پایەبەرز شێخ محەممەد وەسیمی تەختەیی مەردۆخی ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە و پێش ئەوەش لای مەلا محەممەدی بیارە خوێندوویەتی. بە پێی هەندێ بەڵگە ماوەیەکیش لە وڵاتی میسر بووە و چەند کتێبی گەورەی لەوێ نووسیوەتەوە. یەکێ لەوانە کتێبی گەورەی «قاموس المحیط»ی زانای وشەناس «فیرووز ئابادی»یە کە دوو جار نووسیویەتەوە[1]. ئەم زانا پایەبەرزە ساڵی ١٧٨٤ ماڵئاوایی لە ژیان کردووە. مەلاخزر پیاوێکی زانا و شاعیرێکی پایە بەرز بووە کە نووسراوە و پەرتووکی بە زمانی عەرەبی و کوردی هەبووە و لە چەند بەرگدا بە نێوەکانی ڕۆڵە بزانی، دەوڵەت نامە، زەمانە ئەندەن، عەقیدەی کوردی و ئیقباڵ نامە بە زەحمەتی نووسەر و لێکۆڵەر «جەمیل فارۆقی» چاپ و بڵاوو بوونەتەوە.

| | |
|---|---|
| ڕۆڵە بزانی، ڕۆڵە بزانی | فەرزەن وەر جەگشت مەبۆ بزانی |
| ئەسڵ و فەرع و دین چەنی ئەرکانی | چەنی ئەحکامان پەی موسڵمانی |
| مەبۆ بزانی، هەریۆ پەنجەنێ | ئەرچی پەنجەنێ، ئەمما گەنجەنێ |
| ئەسڵ و دینمان، زاتەن و سیفات | مەبدەئوو مەعاد، پەنجەم نوبووات |
| فەرع دینمان نمانە و ڕۆچێ | زەکات، حەج، غەزا، بزانە تۆچێ |

## مامۆستا فەخرەددین[2]

کوڕی ئەحمەد کوڕی مەلا خزری ڕوواره. مامۆستا فەخرەددین زانا و شاعیر و خەت خۆش بووە و بە باپیریەوە شانازی کردووە. کتێبێکی بە نێوی (تذهیب المرام فی ترجمه تهذیب الکلام) بە زمانی فارسی داناوە.

---

١. بڕوانە کتێبی "پەراوێزێک لە سەر ژیانی مەلا خزری ڕواری، جەمیل فارۆقی، ل ٤٩.

٢. هەمان سەرچاوە، ل ٢٠.

## مەلا محەممەد سلێمان (سەیدی)

مەلا محەممەد سلێمان (سەیدی)، ساڵی١٧٧٨ی زایینی لە گوندی «سەرپیر» چاوی بە ژیان هەڵێناوە و ساڵی ١٨٤٤ هەر لە زێدەکەی خۆی ماڵئاوایی لە ژیان کردووە.

سەیدی، شاعیرێکی پایەرز بووە. کاتێ سەیری دیوانە شێعرەکەی ئەکەین وەک تابلۆیەکی ڕەنگاوڕەنگ وەهایە کە هەموو شتێکی تێدا پیشان درابێ. وشەی سۆرانی و هەورامی(کۆن و نوێ) فارسی و ...

سەیدی بێجگە لەوەی شاعیرێکی بەتوانا بووە، لەدەرمانگەری و گیاناسیشدا خاوەن زەکا بووە.

**«هارە سەختەنی»**

هارە سەختەنی، هارە سەختەنی
تۆ خۆ کەم قیمەت سەنگی سەختەنی
چی بوڵەند ئێقباڵ ساحێب بەختەنی
یارئامان وەلات جەهەد و جەختەنی
تراشیدەی دەست سەر ئوستادی باش
جەستەت پوڕ جە زەخم قوڵنگەی سەنگ تاش
یادگار ئۆسای قەدیم زەمانان
دەس ئاسی دەس کێش خیاتەی خانان
چمان تاشیای تێشەی فەرهاد بێ
دەستت جە نەمام داری شمشاد بێ
ئارۆ قیبلە و من بە لەنجە و لارە
تەشریفش وەلای تۆ ئامان هارە
شیرینەن نیشتەن دانە مەدۆ پێش
هارەش هار کەردەن دەور مەدۆنە وێش
مەگێڵۆ بە دەو چون چەرخی چەپگەرد
هەیاهووش گەرمەن مەناڵۆ جە دەرد
دوو لیمۆی وەش بۆش تەرحی شەمامە
جمە جمشانا نە یەخەی جامە

کەس چوون تۆ ئازیز جە لای یار نەبی
هارە چی وەشی ساچی هار مەبی
تای تورەی زولفان سیای عەنبەر بۆ
سەر ئاویز کەردەن تا وەبانی تۆ
دەخیلەن دەستت بە دەستی یارەن
پەنجەش ڕێش نەبۆ هارە هاوارەن
شیرین بە سەد ناز مەکێشۆ دەستە
دانە مەدۆ پێت چوون ئاوات واستە
دانەش مەسانی چوون ستەمکاران
مەکەریش وەگەرد توتیای شاران
تاقەت شی جە لام واتم ئەی هارە
بە مەودای ئەڵماس بای پارە پارە
تۆ دەستی شیرین دەستە کێشتەن
ئاواتت بڕیان ناڵەی چێشتەن؟
تۆ پەنجەی شیرین کەفتەنت وە سەر
چی سارێش نەبی زامانی خەتەر
با من بناڵوو ڕوان تا شەوان
زەدەی هیجرانم دەردم بێ دەوان
هارەی هەراسان هەردەی هەردە گێڵ
کەم دەور دەنەوێت چوون دێوانەی وێڵ
ئانە شیرینەن دوڵبەر دوڵستان
دڵ چێت مەسانۆ بە مەکرو داستان
بە بەین و بەقاش هیچ مەبە خەڕە
جەفاش سەد بارەن وەفاش یەک زەڕە
چەنی کەس تا سەر هەرگیز یار نییەن
یاری ساحێب شەرت وەفادار نییەن
کاتێ مەزانی هۆر ئێزا بە قەس
چوون بێ بەینتان جە تۆش کێشا دەس

شـــی بە مـــاوای وێـــش تەشـــریف بەردەوە
تـــــــۆش ئاســـــــتی وەلای داخ و دەردەوە
کۆتـــا بـــێ ســـەداو نەعـــرەتە و دەنگـــت
بـــێ قـــیمەت گنـــای کەســـاس بـــی ســـەنگەت
بە دڵەی پـــورِ ســـۆز مەیـــنەت بـــارەوە
پێچیـــــــــــای بە دەرد دووری یـــــــــــارەوە
ئەوســـــا چەنـــــی زام بـــــێ دەوای خەتەر
مـــات مەبـــی بـــێ دەنـــگ جە «ســـەیدی»بەتەر

## ئەحمەد بەگی کۆماسی

ســـاڵی١٧٨٩ی زایینـــی لە نـــاوچەی کۆماســـی چـــاوی بە ژیـــان هەڵێنـــاوە. لە گەڵ مەولەوی تـــاوەگۆزی هـــاوچەرخ بـــووە و دۆســـتایەتی گەرم لە نێوانیانـــدا هەبـــووە. مەولەوی لە شێعرەکانیدا بە خاڵۆی کۆماسی ناوی لێئەبات. لەم شاعیرە دیوانێکی شێعر لە ژێر ناوی «دیوانی ئەحمەد بەگی کۆماسی»کەوتۆتە بەردەست خوێنەران. شـێعری «گڵکۆی تازەی لەیل»کە بۆ کۆچی خێزانەکەی هۆنیوەتەوە وەک شاکارێکی ئەدەبی باسی لێ ئەکرێت. ساڵی ١٨٧٣ ماڵئاوایی لە ژیان ئەکات و لە گۆڕستانی تـاڵە سـواری گوندی «بەردی سپی» بە خاک ئەسپەردە کراوە.

چراخم!شـەو بـۆ، چـراخم شـەو بـۆ شەوێ جە شەوان، چراخم! شەو بـۆ
هەراس بیم جەداخ شەو بـۆی زولـف تۆ ناعەلاج چنیم دەسەی شەو بۆی کـۆ
تا کە بۆی زوڵفت کەمێ بەیۆ لـێش بەڵـکەم زامـانم کەمتـر کەرۆ ئـێش
چەنـد وە دڵ نیـام، ئەو بـۆی شـەوبۆ بۆ مەدا ئەمما نەک چوون زوڵف تۆ
فـــدای ئەو دەس بـــام تـــۆش زوڵفانـــت گـرەو نە شـــەوبۆ بەردەن
ئەر شەوبۆی زوڵفت بدەم وەشـەوبۆ دەیری بوون نە جەمع دەیریـان کـۆ
«ئەحمەد»تازیندەن هەرسەرگەردانن پەی شەوبۆی زوڵفت وێڵ هەردانەن

## مەلا عەبدولعەزیمی سەوڵاوا[1]

کوڕی مەلا مەحموودی کوڕی مەلا محەمـمەد و دایکـی خـاتوو ڕێحـانە. سـاڵی ١٧٩٩ی زایینی لە «سەوڵاوا» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. مەلا مەحموودی باوەگەورەی لە نــاوچەی خۆشــناوی هەولێــرەوە هــاتوونەتە کوردســتانی ئێــران و لە ســەوڵاوا گیرساونەتەوە. مامۆستا عەبدولعەزیم سەرەتای خوێندنی بە قورئان و کتێبە وردەکانی ئەو سەردەمەوە دەست پێئەکات. بۆ تێراو کردنی بیر و هزری لە کانیاوی زانست، زۆر ناوچەی کـوردەواری گەڕاوە و لە گـوڵزاری زانایـانی ئەو سـەردەمە گـوڵی زانـستی چنیوە. ساڵی ١٨٢٨ لە خزمەتی «مامۆستا شێخ عەبدوڵڵای قەرەداغی» ئیجازەی زانستی وەرئەگرێت. ئەگەڕێتەوە زێدەکەی خـۆی و وەک مامۆسـتای مـزگەوت کاروبـاری ئایینی لە ئەستۆ ئەگرێت. ئەم زانایە ئەبێ بە سەرچاوەیەکی زانـستی بـۆ مامۆسـتایان و خەڵکی ناوچەکە و هاوکات کاری نووسین دەست پێئەکات. مامۆستا دوای تەمەنێک خـزمەت بە ئـایین و زانـست، دەوروبەری سـاڵی ١٨٩٩ ماڵئـاوایی لە ژیـان ئەکـات و گۆڕستانی «شێخ کەریم»ی سەوڵاوا ئەبێ بە دوا هەواری ژیانی.

لە بواری فەرهەنگی و نووسین دا زۆر نووسراوەی هەبووە بە داخەوە کە دەسـتی ڕۆژگار و خەم ساردی بەشێ زۆریانی لێ فەوتاندووە و ئەوانەشی کە مـاون لە چـاپ نەدراون؛ ئەم نووسراوانەی بە یادگار لێ بەجێ ماوە:

١ـ منقول الاکراد: پەرتووکێکی بە نرخە لە چوار بەش فیقهی ئیمـامی شـافێعیدا و حەوت سەد لاپەڕەیە. هەروەها بریتییە لە چەندەین نووسراوە لە سەر عیلمی حەدیس، عەقایـد، ئوسـووڵی فـێقهە و فتـوای خـۆی و چەنـدین وتـار و نووسـراوەی زانایـانی کوردیشی تێدا بڵاو کراوەتەوە.

٢ـ تفسیری قورئان، تەفـسیری ئـایەتە «مـشکلە و متـشابە»کـان، چوارسـەدو هەشـتا لاپەڕەیە.

٣ـ کورت کردنەوەی کتێبی «الصواعق المحرقە»ی شێخ ئیبنی حەجەر.

٤ـ نووسینەوەی ناوەرۆکی پەراوێزی مەلا عەبدوڵڵای یەزدی.

٥ـ شیکردنەوەی عەوامیلی جورجانی.

---

١. ژیان و بەسەر هاتی ئەم زانایەم لە مامۆستا «سەعدی عەزیمی» وەرگرتووە کە جێگای ڕێز و پێزانینە.

٦ـ الاتحاف فی معرفة ما فی الاوقاف.
٧ـ کورت کردنەوەی بەشەکانی «عبادات و منجیات»ی کتێبی کیمیای سەعادەتی ئیمام غەزاڵی و ...

## شاعیران و نووسەرانی سەدەی ١٩زایینی

### شێخ سەعیدی دۆڵاشی[١]

کوڕی شێخ محەممەدی دۆڵاش لە سەیدەکانی کابلی مەریوان و باوەگەورەی شاعیری بەناوبانگی کورد «مامۆستا قانع»ە. شێخ سەعید پیاوێکی زانا و شاعیرێکی پایە بەرز بووە و زۆربەی شێعرەکانی بە زاراوەی هەورامی هۆنیوەتەوە. دوو پەرتووکی لە سەر عیلمی تەجوید یەکێ بە فارسی و یەکێ بە کوردی نووسیوە. لە نێوەی دووهەمی سەدەی نۆزدەهەمدا ماڵئاوایی لە ژیان کردووە.

### مەلا عەبدولسەمەدی بالکی

ساڵی١٨٣٩ی زایینی لە گوندی «هەجیج» چاوی بە ژیان هەڵێناوە و ساڵی١٩٠١ کۆچی دوایی کردووە.

### حاجی سەید حەسەنی چۆڕی

زانایەکی پایە بەرز لە سەیدەکانی «چۆڕ»ە و باوکی سەید عەبدولقادر کوڕی سەید ئیبراهیم کوڕی سەید عەبدولڕەحمانە. لە گوندی «چۆڕ» مودەڕیس و شێخولئیسلامی مەریوان بووە. ساڵی ١٩٠١ی زایینی چرای ژیانی کوژاوەتەوە و لە بواری فەرهەنگدا خزمەتێکی زۆری کردووە و بەری ڕەنجی چەند ساڵەی ئەم کتێبانەیە:

١ـ پەراوێز لەسەر «تهذیب المنطق».
٢ـ پەراوێز لەسەر «جلال منطق».

---
١. تاریخ مشاهیر کرد، بابا مەردۆخ ڕۆحانی، بەرگی یەکەم، ل ٣٧٩.

٣ـ پەراوێز لەسەر «تەسریفی مەلاعەلی شنۆ».
٤ـ پەراوێز لەسەر «گلنبوی بورهان».
٥ـ پەراوێز لەسەر «عەبدوالحکیم شرح شمسیە».
٦ـ پەراوێز لەسەر «منظومە فریدە لە نحودا».
٧ـ الرسالە الکلامیە
٨ـ تعلیق لەسەر تەفسیری بەیزاوی تا سوورەتی«القیامە»

### مەلا عەبدوڵڵا قازی شەیدا

کوڕی مەلا عەبدولعەزیزی کوڕی مەلاحسێن لە بنەماڵەی قازییەکانی هەورامانە. ساڵی١٨٤٣ی زایینی لە هەورامان چاوی بە ژیان هەڵێناوە و ساڵی ١٩٠٦ لە گوندی «توتمەر» کۆچی دوایی کردووە. بە پێی نووسراوەکان چل و شەش کتێبی نووسیوە و تەنیا ئەم کتێبانەی کەوتوونەتە بەردەست خوێنەران.
١ـ مێژووی شارەزور لە چوار بەرگدا.
٢ـ مێژووی سلاتینی هەورامان لە هەشت بەشدا.
٣ـ مێژووی هەورامان، بە زاراوەی هەورامی.
٤ـ رجال من الاکراد، ژیان نامەی ناودارانی کورد بە زمانی عەرەبی.
٥ـ عەوالان، ژیانی هەڤالانی پێغەمبەر(د.خ.) و کەسایەتییە کوردەکان، بەتایبەت کەسایەتییەکانی ناوچەی هەورامان.
٦ـ کەماجاڕ، پەند و ئامۆژگاری و قسەی نەستەق و شێعر بە زمانی فارسی.

### مەلا شەریفی مەردۆخی[1]

کوڕی «مەلا محەممەدی هەورامی» برای «مەلا حەسەنی دزڵی»یە. ساڵی١٨٤٤ی زایینی لە هەورامان لە دایك بووە. بە شێوەی خوێندنی ئەوسەردەمە خراوەتە بەر خوێندن و لە خزمەتی «مەلا عەبدوڵڵای شەیدا قازی توتمەر» چۆکی فەقێیەتی داداوە. لە هۆنینەوەی شێعردا دەستی هەبووە بەڵام بە داخەوە لە بەر کەمتەرخەمی دوای خۆی

١. دیوانی مەلا حەسەنی دزڵی، ئەحمەد نەزیری، ل١٦٦.

شێعرەکانی فەوتاون. لە لایەن «شێخەلئیسلام تاڵش» لە باکووری ئێران بۆ دەرس وتنەوە بانگهێشت کراوە و بە واتای خۆی لە هیچ شتێک کەمی نەبووە، بەڵام دووری لە زێد و مەڵبەندەکەی ئازاری داوە و ئەو بێتاقەتییەی ئاوەها هۆنیوەتەوە.

ئەگەر جە غوربەت حاکم بی و پڕزۆر
هەورامان وەشەن وە لوقمەی نینۆر
پۆشاکت نمەد، تەوەن پەی باڵش
وەشتەر جە پلاو و دۆشەکەی تاڵش
جە شەحم و لەحم و جە گەشت و سەیران
هیچش کەم نیا شیمالی ئێران
مەشرق و مەغرب، جنوب و شیمال
سەراسەر ملکو خوای لایەزال
مامەڵە کەرۆ چەنی هەورامان
مەفارۆشەوە بە هەزار قورئان
مەر جە باقی‌نە بەهەشتیچ بەروو
ئەو وەختە دڵو وێم رەزا کەروو

## مەلا حەسەن دزڵی[1]

کوڕی مەلا محەممەدی کوڕی محەممەد ڕەزایە. نازناوی «هیجری»یە. ساڵی ١٨٥٤ی زایینی لە گوندی «وەیسیا»ی هەورمان چاوی بە ژیان هەڵێناوە و لە بنەماڵەی مەردۆخییەکانە. دایکی ناوی شاپەروەرە و ئەویش لە بنەماڵەی مەردۆخییەکانی هەورامانە. مەلا حەسەن وێڕای ئەوەی لەو پەڕی نەبوونی و هەژاریدا ژیاوە زۆریش نەفەس بەرز بووە و پێنووسی لە خزمەت هیچ دەسەڵاتدارێکدا نەبووە.

ئەم شاعیرە لە تەمەنی پیریدا نەخۆشی فەرامۆشی ئەگرێت و تووتن ئەکاتە ناو نووسراوەکانی و وەک گەڵا جگەرە کەڵکیان لێ وەرئەگرێ. دیارە کە بەشێ لە شێعرەکانی لە ناوچوون. ساڵی ١٩٤٣ ماڵئاوایی لە ژیان کردووە. دیوانێکی شێعری لە ژێر ناوی «دیوانی مەلا حەسەنی دزڵی» کەوتووتە بەر دەست خوێنەران.

---

١. سەرچاوەی پێشوو.

مەلا حەسەن ئەم شێعرەی بۆ موجتەهیدی کوردستانی ناردووە:

دل مـــی رود زدســـتم صـــاحب دلان خـــدا را
دردا کـــه حـــبّ پنهـــان خواهنـــد آشـــکارا[1]

بـاد صبا «دە خیلـک» از حـد گذشـت شـوقم
بهـــر عزیمـــت شـــهر، «ئـــاخێز» کـــن زجـــا را

پـرواز کـن بـه افلاک تـا مـی رسـی بـه سمّاک
یـــک چـــرخ زن بـــه مثـــل طیـــاره بـــر هـــوا را

بـــر فـــرق ســـه عناصـــر «ئەهلـــیلە جـــی»محاصـــر
غوغـــا بـــه عـــالم افکـــن تخریـــق کـــن هـــوا را

از عاشـــقان گـــذر کـــن وز «ئاویـــە ر» نظـــر کن
بنگـــر بـــه آن نـــواحی و آن شـــهر دلربـــا را

بگـــشای چـــشم عرفـــان در جـــستجوی یـــاران
دریـــــاب آســـــتان «عبـــــدالعظیم» مـــــا را

## محەممەد ئەمین (خیتلە)[2]

سۆفی محەممەد ئەمین کوڕی محەممەد کـوڕی حسێن کـوڕی عوسـمان، سـاڵی ۱۸۵۹ی زایینی لە گوندی «بارام ئاوا» چاوی بە ژیان هەڵێناوە و لە گونـدی «کەڵـێم[3]» ژیاوە و بە نێوی خێڵی «باڵ پان» ناسراون. لە تەمەنی شەش ساڵیدا بـاوکی ماڵئـاوایی لە ژیان ئەکات. دایکی لە گەڵ مامەی بە نێوی «شامار» ژیانی هاوبەش پێک دێنن، بەڵام بەهەر هۆیەک «خیتلە» ناچێتە لای دایک و مـامەی. ئەرکـی بەخێـوکردنی ئەکەوێـتە ئەستۆی ماڵە خاڵوانی لە گوندی دەگاشێخان و یانزە ساڵ لەو گوندە ئەمێنێتەوە. پاشان ئەڕواتە بیـارە و لە سـەر دەسـتی خواڵێخۆشـبوو «شـێخ عـومەری بیـارە» تەمەسـووک دەکـات[4]. بـۆ مـاوەی حەوت سـاڵ لە خانەقـای بیـارە ئەمێنێـتەوە. پاشـان ئەگەڕێـتەوە

---

۱. ئەم بەیتە شێعری حافزی شیرازییە کە مەلا حەسەن بە سووکە دەسکارییەکەوە هێناوییەتی.

۲. ژیان و بەسەر هاتی ئەم زانایەم لە «کاک عادل»ی کوڕە زاری شاعیر وەرگرتووە کە جێگای ڕێز و پێزانینە.

۳. گوندێک بووە لە نزیک بارام ئاوای ئێستادا کە تەنیا دارو پردووی ماڵە ڕوخاوەکـانی لـێ بە جێمـاوە و ئەو دۆڵەی کە لە پەنای گوندی بارام ئاوادایە بە نێوی «دەربەن کەڵێم» ئەناسرێ.

۴. واتە دەبێ بە سۆفی و ڕێبازی نەقشبەندی هەڵئەبژێرێت.

گوندی «دەرەکێ» و لەو گوندە ئەگیرسێتەوە و ئاشقی کچێک بە نێوی «زوبەیدە» ئەبێت. بەڵام براکانی زوبەیدە بێجگە لە یەکێکیان بە نێوی «ساڵح» دژ بەم پەیوندە ئەبن و خیتلەش ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| هەرسو[1] چەمەکات، با تەڕە ساڵە | دوور بۆ ساڵحی نەبۆت براڵە |
| «ساڵح» ساڵحەن برادەرمەن | چون حەمە ئازیز[2] خەم بەرکەرمەن |

لە ئاکامدا هەر ئەیخوازێ. دوای ماوەیەک لە گەڵ بنەماڵەی خانەکانی ئەوگوندەدا ناکۆکیان لێ پەیدا ئەبێ و بە ناچار دەرەکێ بە جێ دێڵن و بنەڕەتی گوندێکی تر لە مەزراکەی خۆیان کە دێمی جۆ بووە دائەمەزرێنن بە نێوی «دەیمەیەو[3]».

سۆفی محەممەد ئەمین ساڵی١٩٤٢ لە «دەیمەیەو» ماڵئاوایی لە ژیان ئەکات و گۆڕستانی «دەروێش گومار» ئەبێ بە ماڵی هەتاهەتایی.

ئەم شاعیرە زۆر هەڵبەستی هۆنیوەتەوە بەڵام بە هۆی ئەوەی لەو سەردەمە و لەو ناوچەیەدا نووسینێک لە ئارادا نەبووە، زۆربەیان فەوتاون و ئەوەی ماویشەتەوە لە سەر زاری خەڵک بووە و هەرکەسیش بە پێی حەز و خواست و توانایی خۆی هەڵی گرتوون. مامۆستا باوەشێخی ئەڵمانە لە ڕێگای دەربەندی کەڵێمەوە ئەڕوات بۆ بیارە و چاوی بە سۆفی محەممەد ئەمین ئەکەوێت و ئەزانێت کە پیاوێکی خاوەن بەهرەیە و شاعیرە. دوای گەڕانەوەی لەو سەفەرە فەقێیەک ئەنێرێ بۆ ئەوەی هۆنراوەکانی «خیتلە[4]» بنووسێتەوە، بەڵام بەداخەوە کاتێ فەقێکە ئەگاتە دەیمەیەو، سۆفی شاعیر ماڵئاوایی لە ژیان کردووە و هۆنراوەکانی لە گەڵ خۆی بردۆتە دووتوێی خاکەوە. سۆفی محەممەد ئەمین لە ئەستێرەناسی و فەلەکییاتدا زۆر شارەزا بووە.

لە هۆنراوەیەکدا لە گەڵ دار توویەکی کۆن وتوویژ ئەکا و مێژووی ئەو وڵاتەی لێ ئەپرسێ، ئەڵێ:

---

١. هەرس: فرمێسک.

٢. یەکێ لە دۆستانی نزیکی بووە.

٣. دەیم: دێم، یەو:جۆ.

٤. لە بەر کورتە باڵا بوون، «خیتلە»یان پێوتووە، بەمانای خیتۆڵە یان گچکە.

ئـــارۆ ڕاگەم کەوت، شـیم وە پـــای باخـــات
دڵـــم ڕاگەی غەم، دەرونـــم بـــی مـــات
جە قەراخـــی بـــاخ داریێ دیـــم وە چەم
پیـــر بـــێ، پوویـــا بـــێ، دەروون پـــڕ جە خەم
شـیم وەڵای درەخـــت، چـی داری تـــوو بـــێ
عـــومرش وێـــردە جە قەدیـــم زوو بـــێ
شـــیم وەڵای درەخـــت بە ئەســـرینەوە
بەدیـــدەی نمنـــاک بە بـــرینەوە
واتـــم: داری تـــوو چـــۆنەن قامەتـــت
ڕەفیقـــان بڕیـــان چەنـــین تاقەتـــت
هەڵای هامنـــــــــا، مەکەری خەزان
لقـــت نەمەنەن تۆکڵـــت ڕێـــزان
هەروێـــت مەنێنـــی مـــاوات بیـــیەن چـــۆڵ
لقـــت نەمەنەن دڵێـــت بـــی قـــرۆڵ
حەز کەروو پەرســـوو پەرێ پیـــری تـــۆ
ئێـــشی دەروونـــم تـــا ســـاکن بیـــۆ

وەڵام:

مـــوحەممەد ئەمـــین؛ دیـــدەی دڵ ســـیفەت
ســـەرمات جە عەزاب پەروەردەی مەیـــنەت
خەمـــانی وەڵـــین نەبـــێم جەلاوە؟!
کـــۆنە زامانـــت تـــۆ چـــی کولنـــاوە؟!
جە زاتـــی بـــێ چـــوون، تـــۆ چـــی مەتەرسی؟!
پەرێ پیـــری مـــن پەی چـێش مەپەرســـی؟!
واتـــش: ئەی کـــۆدە هەرزەی نابەکـــام
بـــێ وادە و مـــوراد، عەقـــڵ ناتەمـــام
ئـــارۆ بنیـــشە تـــاقەت بـــۆ جەلام
ڕازانـــی وەڵـــین، پەیـــت کەروو تەمـــام
وەختـــێ مـــن بێنـــێ، چەنـــی ڕەفیقـــان
لقـــم نەمەنەن، تـــۆکڵم ڕێـــزان

ئـاکەس مـن نیـا سـاحیب دەمـاخ بـێ
بـێخم تەڵان بـێ دەورم گـرد بـاخ بـێ
کـۆن شـەماڵ شـانۆ لەقـی بەکـارم
کـۆن کەیـف و ئاهەنـگ خەڵفـی وەهـارم
چنـنە نـازارێ چەم سـیای ڕەنگـین
چەن جاهێـڵ گەردێ جـوانێ شـیرین
جە سـای سـەحەنم مەکەردشـا سـەیران
گەلە جە هەردە هـۆبە جە مەیـدان
کـۆن بەرزە چـڕەی سـەرتەرزی چنـار؟
کـۆن ئـاوازەی وەش سـەدای هەرزەکـار
کـۆن قەتـارەی قـۆخ گـوڵ و گـوڵاوی
تـف و سـوورە تـف هەڵـووچە و سـاوی؟
کـۆن بەرزە چـڕی سـەرتەرزی هەنگـوور
تـف چەنـی بـادام سـاوا بێنـێ سـوور؟
کەم تەرینـی وەش هەوارو زبـێ
ئەو بـاقی مەنـدەش گـرد سـاحیب ڕەز بـێ
سـەیری سـێبەران مەیـدان گوڵەنگـا
مەلا مەنیـشا جە هەڵاوەگـا
واچە بە مەدی چەنـی مەیـدانی
سلاّمـشا کیـانوو چەنـی داڵانـی
بـاخی پیراڵـی خـاڵیەن خـاڵی
کـۆن مەخـوولە شـەل کـوانێ زەبـاڵی
کـۆن بە ناهـانەی هەزار قەرانـی
کـاولش کەردەن بە زەکریـانی؟
کـۆن هـانەنەوە بـیەن وێـرانە
کـۆن بـاخی هەنگـوور جە بەناهـانە؟
دەسـکاری ترخـان کـۆنە زەمـانە
کـۆن ڕەزو دەیمـی جە بەناهـانە؟

کۆگـــای جیاشـــا تەمـــام بـــی تەمـــام
کــۆن ئەلــی کەچەڵ کــۆن حەمەوەش نــام؟
کـــۆن حەمەدەبەق خەمـــان دێ وەبـــاد؟
کــۆن بابــا ســمێڵ کــۆن فەقــێ فەرهــاد؟
بــاخی بــلەڕووت بــی بە جــای پــاڵین
هەرشـــەو تــا بەیــان مەگــرەوۆ خەمگــین
قـــاقبەی ژەرەژا ئێـــــشی ئادمـــــا
دەنگـــــو نــــازارا هەر جە یادەمـــــا
کــۆن تەقەی تفەنــگ جە گڵــوە ســەردا؟
کــۆن دەنگــی وســەین، ســەرچەمەی زمــڕا؟
ســەرچەمەی زمــڕا بــی بە جــاگەی مــۆڵ
داخــی داخــانم بــاڵ پــان کەردش چــۆڵ
هەروێــت مەنەنــی چــوون خەڵــفە وی کــۆڵ
دوور جە خەڵیفەیــت ئەرهــۆ بــاوان چــوڵ!
کـــۆن حەمەوەش نـــام مـــاواش زهـــۆرە؟
کــۆن مامــا فــاتێ؟ کــۆن هــۆزە کــۆرە؟
کــۆ جــامی جەمــشید ســاحیب بــاخی زەل
کــۆن بــلە قلیــان؟ کــۆن مەخــوولە شــەل؟
ســـەیری ســـێبەران تەپـــۆڵە نـــسار
دیــدەم مەگــرەوۆ پەی دەروێــش گومــار
ناســك ســەر دەربەن گــوڵ و گوڵبــاخ بــێ
مزگـــی و عەمـــارەت وەش و پەرداخ بـــێ
حـــوجرە و فەقێیـــا پـــڕ عـــیلم و تـــاقەت
ئیمـــام خـــزر بـــێ جـــومعە و جەمـــاعەت
حـــاكمی ئەو شـــارە ئەحـــمەد بەگ نـــام بـــێ
پڕهـــۆش و پڕفـــام مەشـــهوری عـــام بـــێ

## حاجی مەلا عەزیز

کوڕی سولەیمان ساڵی ١٨٥٩ی زایینی لە گوندی «هەرگینە»ی پێنجوێن چاوی بە ژیان هەڵێناوە و خوێندنی لە خزمەتی مامۆستا پێنجوێنیدا تەواو ئەکات. پیاوێکی زانا و نوکتەزان بووە و لە گوندی «دەرەتفێ» ئەبێ بە مەلای مزگەوت و تەدریس ئەکات. ساڵی ١٩١٦ ماڵئاوایی لە ژیان کردووە.

## مەلاعارف

**مەلاعارف**، کوڕی مەلا عەبدولسەمدی هەجیجی دەوروبەری ساڵی ١٨٦٠ی زایینی لە گوندی «بالک» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. لە خزمەت باوکیدا کە مەلای بالک بووە خوێندنی دەست پێکردووە. زانایەکی نوکتەزان، خەت خۆش و دەنگ خۆش بووە. زۆر کەس لە کانیاوی زانستی بەهرەیان بردووە. ساڵی١٩٠٩ چرای ژیانی کوژاوەتەوە.

## کاک حەمەی بێلوو (ناری)

کاک حەمەی بێلوو(ناری[1])، مەلا محەمەد ناسراو بە کاکە حەمەی بێلوو کوڕی مەلا ئەحمەد کوڕی مەلا محەممەد کوڕی مەلا عەبدولڕەحمان و دایکی لە بەگزادەکانی گوندی «کیکن»ە، ساڵی ١٨٧٠ی زایینی لە گوندی «کیکن» چاوی بە ژیان هەڵێناوە و نازناوی «ناری»یە. لە تەمەنی شەش ساڵیدا لە خزمەت باوکی قورئان و بڕێ لە کتێبە سەرەتاییەکانی خوێندووە. ناری بە شوێن خوێندن و فێر بووندا زۆر شوێن گەڕاوە، وەک: سنە، پێنجوێن، سلێمانی، بانە، سابڵاخ، وان و باش قەڵا و هەولێر. لە ڕەواندز ئیجازەی تەدریس و مامۆستایەتی لە خزمەت مەلا ئەسعەد ئەفەندی خێلانی وەرگرتووە. پاشان گەڕاوەتەوە بۆ مەریوان و لە گوندی «کیکن» نیشتەجێ بووە. ساڵی١٩٠٤ لە سەر داوای حسێن بەگی بێلوو ئەڕواتە ئەو گوندە. کاکە حەمە وێڕای ئەوەی شاعیرێکی پایەبەرز و بە توانا بووە، لە

---

١. دیوانی ناری.

زانستی بەلاغە و بیرکاری(ڕیاضی)شدا شارەزایی تەواوی هەبووە. ساڵی ١٩٤٢ لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا ماڵئاوایی لە ژیان ئەکات و دیوانە شێعرێک بە یادگار بۆ گەلەکەی بەنێوی «دیوانی ناری» بە جێ ئەهێڵێت.

نەفەس سەمتورە، سینەم ساز و دڵ نەی
حکایەت خوانی دووری تۆن پەیاپەی
بە زکری تۆ وەکو سۆفی هەمیشە
مەقاماتی فەنا فی الله ئەکەم تەی
چ شیرینە لەگەڵ شەهدی حوزوورا
لە من خەندە و لە تۆ ئاوازی ئۆخەی
ئەگەر سایەی سەری تۆ بێ بە تاجم
چ موحتاجم بە تاج و ئەفسەری کەی
غەزەل قەت نابڕێ هەرگیز بە باڵات
ئەزانم بۆ کەوا مایل بە تاقەی
هەواپەیمایی ئەوجی فیراقت
بەتەییارەی سەبووری کەی ئەبێ تەی؟
لە مەیخانەی خەیاڵی شەوقی تۆدا
بە نەشئەی یادی تۆ دڵ مەستە بێ مەی
لە وشکی دا نەمامی باخی نەزمم
بە پووشی ڕیشی سۆفی بوو شکۆفەی
بەسەرچوو دوور لە تۆ باخی خەیاڵات
نەبوونی ما، نەبۆنی ما، نە غونچەی

## مەلا عەبدوڵڵا مەریوانی[1]

کوڕی مەلا مەعرووفی کوڕی سۆفی قادری کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی سلێمان و دایکی خاتوو «زوبەیدە»ی کچی شێخ محەمەمەدی «هەرگینە»یە. ساڵی ١٨٧١ی زایینی لە گوندی «ولەژێر» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. مەلا عەبدوڵڵا

---

١. "بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد"، محەممەد عەلی قەرەداغی، بەرگی حەوتەم، ل ٢١٠تا٢٢٢.

پیاوێکی شارەزا و ئەدەب دۆست و مەلایەکی چالاک و خەت خۆش بووە. گوڵچنێکی بەزەوق و هەست و بیر ناسکی ئەدەبی کوردی بووە و زانیویەتی چی دەکا و چ گوڵێک ئەچنێتەوە و خاوەن کەشکۆڵێکە کە بەرهەمی ڕەنجی سی وسێ ساڵییەتی. لە گوندەکانی «چۆڕ»، «قەڵاتێ»، «تەوێڵە» و «قەڵای هەولێر» نووسیویە. بە واتای مامۆستا عەلائەددین سەجادی «مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای مەریوانی» مەولەوی تاوەگۆزی بە وڵاتی سلێمانی ناساند و تا ئەو نەهاتبووە سلێمانی ئەدیب و شاعیرانی سلێمانی ئەوەندە ئاگایان لە مەولەوی نەبووە. ئەم مامۆستایە ساڵی ١٩٣٨ لە شاری سلێمانی کۆچی دوایی ئەکات.

**مامۆستا محەممەد ڕەشید مودەڕیسی**

ساڵی ١٨٧٥ ی زایینی لە گوندی «نەچێ» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. باوکی سمایل بەگ لە بەگزادەکانی ناوچەی مەریوان بووە کە خولیای پەرەپێدانی زانست و ئەدەب بووە و لە گوندی نەچێ قوتابخانەیەکی دامەزراندووە. محەممەد ڕەشید لای باوکی خوێندن بە قورئانی پیرۆز و گولستانی سەعدییەوە دەست پێئەکات. بە پێی نەریتی ئەو سەردەمە «ئاغازادە» و محەممەد ڕەشید بەگیان پێ گوتووە و ئەویش پێی ناخۆش بووە. لەسەر ئیجازەی باوکی نەچێ بەجێدێڵێت و ڕوو لە قوتابخانەی گوندی «چۆڕ» ئەکات. لای زانای پایەبەرز سەید حەسەنی چۆڕی درێژە بە خوێندن ئەدات. ساڵی ١٨٩٠ کتێبی عەواملی جورجانی ئەنووسێتەوە. یەکەمین دەستنووسی بەجێماو لە ناوبراو ئەم کتێبەیە. بە شوێن فێربوون و زانستدا زۆر شوێنی تری ناوچەی مەریوان و پێنجوێن و دواتریش سەقز و سنە ئەگەڕێت. لە خەرمانی زانستی زانایانی ئەو سەردەمە گوڵی زانست ئەچنێت. دواتر ئەگەڕێتەوە چۆڕ و لای سەید حەسەنی چۆڕی ئیجازەی مامۆستایەتی پێئەدرێت. بۆ تێراوکردنی بیر و هزری لە کانیاوی زانست ئەڕواتە سنە و لای مەلا عەبدوڵڵای دەشتی، موفتی کوردستان، لە قوتابخانەی دارولئیحسان دیسان ئیجازەی مامۆستایی وەرئەگرێت. تینوویەتی زانست ئارامی لێئەبڕێت و ڕوو لە کوردستانی ئێراق ئەکات و لای ئەسعەد ئەفەندی ڕەواندزی ئیجازەی فتوای پێئەدرێت. ساڵی ١٩٠٠ ئەڕواتە سنە و سەردەمانێکی زۆر لە قوتابخانەی دارولئیحساندا خەریکی تەدریس و وانە وتنەوە ئەبێت. ئەم زانایە لە ئەدەبیات و بیرکاری(ریاضیات)

و فەلەکییاتدا شارەزا و پسپۆڕ بووە. مەلا محەممەد ڕەشید یەکێ لە شوێن کەوتووانی ڕێبازی نەقشبەندی بووە. ساڵی ١٩٢٨ ماڵئاوایی لە ژیان کردووە و لە سەر تەپۆڵەی شێخ محەممەد سادق لە سنە بە خاک ئەسپەردە کراوە.[١]

## عەبدوڵلا بەگی هەورامی

ئەم هۆنەرەمان ناوی عەبدوڵلا و کوڕی حەمەشەفیع بەگ و لە بنەماڵەی بەگ زادەکانی حەسەن سانی هەورامانی تەختە و ساڵی ١٨٧٨ی زایینی لە هەورامانی تەخت لە دایک بووە و لەوێش پێگەیشتووە. هەر لە منداڵییەوە خەریکی خوێندن بووە و لە پاشا باوکی میرزای تایبەتی بۆ گرتووە و فێری خەت خۆشی و وێژەی فارسی کردووە. پاشان ماوەیەکیش چووە بۆ سنە و دەرسی ئایینی خوێندووە. دوای گەڕانەوەی بۆ زێد و مەڵبەندەکەی خۆی ساڵی ١٩٧١ بە تاوانی ئازادیخوازی لە لایەن هێزەکانی ڕەزا شاوە لە گەڵ چەند هاوڕێیەکی دەسگیر ئەکرێن و ماوەی دە ساڵ لە زیندانی «ئیسفەهان»دا بەند ئەکرێت. پاشماوەی ژیانی بە پشوودان و پەڕاو و هۆنینەوەی هۆنراوە و وریا کردنەوەی خەڵک بردووەتە سەر. ساڵی ١٩٤٣ بە دەستی نەسەقچیانی ڕژێمی پاشایەتی کۆتایی بە ژیانی هاتووە و تەرمەکەی لە هەورامانی تەخت نێژراوە.[٢]

عەبدوڵلابەگ یەکێک لە شاعیرانی پایە بەرزی هەورامان لە سەردەمی مەلای حەسەنی دزڵیدا بووە و زۆربەی هۆنراوەکانی لە زیندانی ئیسفەهاندا هۆنیوەتەوە.

یاران هامسەران ئیمشەو خاوێ دیم
جە زیندان تار عەجەو خاوێ دیم
ئازادی وەتەن هەورامانم دی
ئێلاخان چۆڵ کۆسالانم دی
وەنەوشەی وەشبۆ، چنوور جە هەردان
ئامانە خاوم پەی بارو دەردان

١. دانشمندان کرد در خدمت علم و دین، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، وەرگێڕاوی ئەحمەد حەواری نەسەب، ل ٥٨٦.
٢. "مێژووی وێژەی کوردی"، سدیق بۆرەکەیی(صفی زادە)، بەرگی دووهەم، ل ٢٩٥.

ڕێحان پەلش دێز، شەست پەڕ جە باخـان
سۆســەن و نەســرین شــەوبۆی ئێلاخـــان
بەرزەڵنــگ جە کــۆ، چنــوور جە کــاوان
ســەوزی و مێرغــوزار، هــاژەی بەفــراوان
چەنـــی هامـــسەران نیـــشتەبیم وەشـــاد
بەکەیـــف و ئاهەنـــگ غەم مەدام وەبـــاد
گــۆش بە ســەدای ســاز، چەم بە نیگــاوە
جە قاوەخـــــانەی ڕای کەمـــــاڵاوە
لێـــو بە پیـــاڵەی عەقیـــق ڕەنـــگەوە
گــاهێ پــڕ بە شــەوق گــا بە خەنــدەوە
گــا نیگــای کۆســـار بەرزی ئێلاخـــان
گــا نیگــای خەزان، گــا نیگــای زەردان
جەی عەیش و نـشات، جەی خەوی بەتـاڵ
زینـــدانم ئەســـڵەن نامـــان وەخەیـــاڵ
هەر پاســـەم زانـــان وێـــم شـــەهریارم
چەرخ کەچ کـــــردار نەدان ئـــــازارم
پاســـەم مەزانـــا شـــای خـــاوەن بەخـــتم
نەزانـــام مە زڵووم،حەپـــسی بەدبەخـــتم
وختێـــو بێـــدار بـــیم، تەماشـــا کەردم
ئـــــاژان و زینـــــدان نەزەر ئـــــاوەردم
چەنـــدە مەدهـــۆش بـــیم تەواســـامەوە
عەقـــڵ و فـــام و هـــۆش نەمەن لامەوە
ســـەد موقابـــڵ بـــی بـــاری خەمـــانم
وە ســـۆ ئامـــاوە ســـۆتەی زامـــانم
غەیــر جە ئـێش و نـێش جەفـای ڕۆزگـار
هیچ سوودێ و جەفا نەدیم جەڕووی کـار
زام کـــۆنە و نـــۆم تـــازە کەردەوە
زار زار مەنـــــــــاڵم وەدەم دەردەوە

یـا ڕەب هەر کەسێو کە ڕۆش نەهـات بـۆ
زام زەدەی تەقـدیر ڕووی سـەر بسات بـۆ
کەشـــتی نگیـــنش هەر ســـەرنگوونەن
نەگێجـــاو گـــێج ڕوود جەیحـــوونەن
مـۆرەی ئیقبـاڵش دووشـەش نـاوەردەن
چەنـــی بەدبەختـــی مـــامەڵەش کەردەن
خـــــوردو خـــــۆراکش ژاراو زەردەن
خـــاو شـــیرینش هەر ئـــێش و دەردەن
یـــا ڕەب بەحـــاجەت ڕەســـووڵ حەبیـــب
خـــاک غەریبـــیم نەکەری نەســـیب

دوای کوژرانی عەبدوڵڵا بەگ، دایکی لاواندوویەتەوە و مەلا حەسەنی دزڵی ئەو لاواندنەوەیەی بەم جۆرە هۆنیوەتەوە[1]:

دنیـای بـێ بەقـا بـێ شـەرت و بـێ قەوڵ
جـای حیـرس و تەمەع جـای تەقەلا و حەوڵ
جـــای ناتەمـــامی، بەدی و بەد نـــامی
هەر ڕۆ بەوێـــنەی فـــۆتە حەمـــامی
وێـــرانە خـــوازی وێـــنەی بـــایەقوش
عەجـــووزەی دەوران کـــۆنە فەراد کـــوژ
ئـــاخر چـــی فەرزەنـــد جە دایە کەردی
چـــی نەوجەوانـــان نە تـــۆی گـــڵ بەردی
چەن خانەدانـــــت شـــــێونا وەهەم
جە کەیقوبـــاد و جە جەمـــشیدی جەم
چەن دەم و دەســـگا جە بـــێخ هورکەنـــدی
گـــردت کیانـــا و تـــۆ وێـــت هەر مەنـــدی
ئـــاخر تـــــۆ مەگەر گـــــلاراوتەن
یـــا چـــون بـــاخەوان نـــۆبە ئـــاوتەن

---

[1]. دیوانی مەلا حەسەنی دزڵی، ئەحمەد نەزیری، ل ٢٢و٢٣و٢٤.

نەونەمـــــامەکەی تەکـــــیەی بـــــاهوا
سەردەســـــتەی ڕەشـــــتەی دیە ئـــــاهوا
مـــــن پیـــــرۆزە بـــــیم پەی تـــــۆ نگیـــــنم
فەرزەنـــــدی ئـــــازیز ڕۆڵەی شـــــیرینم
هەزار و سێـــــسەد شەســـــت و چـــــوار بـــــێ
ڕۆحـــــش وە «ڕزوان» بەهەشـــــتی یـــــاربێ

## مەلا مەحموود جوانڕۆیی

**(١٠ڕۆژ بەر لە کۆچی دوایی)**

مەلا مەحموود جوانڕۆیی، ساڵی ١٨٧٩ی زایینی چاوی بە ژیان هەڵێناوە. ئەو زانا پایە بەرزە پسپۆڕی بواری بیرکاری(ریاضیات)، هندسە و فەلەکیات بووە و لە خزمەتی مامۆستای گەورە سەید عەلی حیکمەت ئەفەندیدا لە شاری کەرکوک پێگەیشتووە. ساڵی١٩٠٩ ئیجازەی مامۆستایەتی وەرئەگرێت و ئەچێتە هەورامان، دواتر ئەگەڕێتەوە بۆ زێدەکەی خۆی «مەریوان» و یانزە ساڵ لە گوندی «بالک» خەریکی مامۆستایی و تەدریس ئەبێ و زۆر لە مامۆستایانی پایەبەرز لە سەر دەستی ئیجازە وەرئەگرن. دوا هەواری تەدریس و ژیانی ئەبێ بە گوندی «دەرەتفێ» و ساڵی ١٩٤٢ کۆچی دوایی ئەکات.

## مەلا عەبدولقادری جەلالی

کوڕی مەلا جەلالەددین کوڕی مەلا عەبدولڕەحمانی «نۆدشی» ساڵی ١٨٧٩ی زایینی لە نۆدشە چاوی بە ژیان هەڵێناوە. بە شوێنی زانستدا زۆر شوێن وەک دەوروبەری نۆدشە، سنە و بیارە گەڕاوە و هەر لە بیارە ئیجازەی مامۆستایەتی وەرئەگرێت. بۆ مامۆستایی و خزمەت کردن بە ئایین و زانست دێتە گوندی «دەگاگا».[1]

---

١. گوندێکە لە نزیک «سەولاوا».

ماموٚستا جەلالی پیاوێکی شارەزا و لێهاتوو لە زانستی ڕۆژ و زانستی عەربی(صرف و نحو) و ئەدیبێکی گەورە بووە[١]. چەندین ساڵ دەرسی بە فەقێ وتووە و ساڵی ١٩٤٤ چرای ژیانی کوژاوەتەوە و لە گۆڕستانی گوندی «دەگاگا» بە خاك ئەسپەردە کراوە.

## فەرەج وڵڵا زەکی مەریوانی

کوڕی عەبدولڕەحیم نزیك ساڵی١٨٧٩ی زایینی لە گوندی «گلە»ی مەریوان چاوی بە ژیان هەڵێناوە. ئەم پیاوە زانا و چالاکە لە شوێنە جیاجیاکانی کوردستانی ئێران و ئێراق دەرس ئەخوێنێت و بۆ فێربوونی زیاتر ڕێگای وڵاتانی عەربی ئەگرێتە بەر و لە وڵاتی میسر ئەگیرسێتەوە. بە هاوکاری چەند ماموٚستا و خوێندکاری کورد ناوەندێکی خێرۆمەندی دائەمەزرێنن. پاشان لە قاهیرە، چاپخانەیەك بە نێوی «چاپخانەی کوردستان» دائەنێت و بە هاوکاری زانایانی کوردی نیشتەجێ لە قاهیرە چەندین کتێب و پەرتووك بڵاو ئەکەنەوە. ئەم بەرهەمانە لە لایەن ئەم کەسایەتییەوە بڵاو کراوەتەوە: «شروح شمسیه»، «شروح عقاید»، «المحاکمات فی ماجری بین علماء مصر و العراق من الاستعارات»، «مێژووی شەرفنامەی بەدلیسی» و... ئەم نووسەرە لە کۆتایی ساڵی ١٩٢٩یان ١٩٣٠ ماڵئاوایی لە ژیان ئەکات.

## حاجی سەید بابەشێخی ئەڵمانە

کوڕی شێخ عەبدوڵڵا کوڕی شێخ محەممەد کاژاوی لە بنەماڵەی سەید خالدی کاژاوی بانەیە. دەوروبەری ساڵی ١٨٨١ی زایینی چاوی بە ژیان هەڵێناوە. بە شوێن زانست و فێر بووندا زۆر شوێنی کوردستانی ئێران و ئێراق گەڕاوە و دواتر چووەتە گوندی «بارام ئاوا» و دوای دوو ساڵ مانەوە لە بەر گرانی و هەژاری خەڵك و دەس پێکردنی شەڕی جیهانی، ئەڕواتە گوندی «ئەڵمانە» و دوای تەمەنێك خزمەت بە ئایین و ئەدەب ساڵی ١٩٥٤ بۆ سەفەرەیێکی بێ‌بڕانەوە ئەچێت و ئیتر نەگەڕێتەوە.

---

[١] خەڵکی گوندی «دەگاگا»ش باسی شێعر و هۆنراوەیان بۆکردم، بەڵام بەداخەوە هیچ کام لە شێعرەکانیم دەس نەکەوت.

### مەلا عەبدولواحدی سەمەدی

کوڕی مەلا عەبدوالسەمەد ساڵی ١٨٨٢ی زایینی لە گوندی «بالک» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. لە خزمەتی باوکیدا قورئان و کتێبە سەرەتاییەکان ئەخوێنێت و بۆ تێراو کردنی بیر و هزری لە زانست ڕوئەکاتە «بیارە» و لە خزمەتی مەلا عەبدولقادری مودەڕیس چۆکی فەقێیەتی داداوە. ساڵی ١٩٣١ لە گوندی «ساوجی» ماڵئاوایی لە ژیان ئەکات.

### شێخ محەممەد (مەلا ئابی)

کوڕی شێخ سەعدوڵڵا کوڕی شێخ عەبدولکەریمی دەگاشێخان، لە بنەماڵەی مەردۆخییەکانە. بە گوێرەی ناسنامەکەی ساڵی١٨٤٤ی زایینی لە گوندی هەرگێنەی کوردستانی بن دەستی ئێراق چاوی بە ژیان هەڵێناوە. شێخ محەممەد لە هۆنینەوەی شێعردا دەستێکی باڵای هەبووە و ناز ناوی شێعری «ئابی» بۆ خۆی هەڵبژاردووە. مەلا ئابی یەکێ لە خەلیفەکانی شێخ حیسامەدین بووە و هەر بەو بۆنەشەوە لە ناسنامەکەیدا خۆی بە «حیسامی» نووسیوە. ئەم شاعیرە قەسەیدەیەکی کوردی لە سەر کێشی قەسەیدەی بوردی هەیەکە لە بۆنە ئاینیەکاندا ئەخوێنرێتەوە.

ئابی لە وەرزی پاییزی ساڵی ١٩٦٧ ماڵئاوایی لە ژیان ئەکات و گۆڕستانی گوندی دادانەی کەوانگەر ئەبێ بە دواهەواری[1].

| | |
|---|---|
| هەورامــان مـاوا تەڕەتــوو وەرە | فەرەنجــی نەکـۆڵ مێـزەرە سـەرە |
| ئوسـتادی دانـا ئاگـاه بە ئەسـرار | عـالمی عامـل عـارفی ئەحـرار |
| ناخۆاسـتە وەلـی نـاکەردە مـراد | مـایەی ئیفتخـار ئەحفـاد و ئەجـداد |
| گەورەییت کەردەن پەرسانت پەرێم | هۆشـت نەشـیەنا مزانـی مـن کـێم |
| نەوەی مەردۆخ و سـولالەی پاکـان | ڕۆڵەی پەروەردەی پیـری هەورامـان |
| فەرماوات مەردۆخ ئیسارش کەردەن | گیـانی وێـش فیـدای نەسـڵی وێـش |
| ڕاسـت فەرمـاوا ئەربـابی ئـیخلاس | دەخـیلەن نەوزیـم نەبـابی قیـاس |

---

[1] ژیان و بەسەر هاتی ئەم زانایەم لە «کاک ئیبراهیم مەردۆخی» وەرگرتووە کە جێگای ڕێز و پێزانینە.

مــن حەدم چێــشا قــابلم چکــۆن
عیلم و مەعـرفەت هەر لایـق وە تـۆن

تەقریــر و تەحریــر، فتــوا و ئیفــادە
هەر لایەقــو تــۆن جە ئــێمە لادە

کەی واتــم مەلا یــا شــێخی ئیرشــاد
کەی بە مــن گنــۆ فتــوا و ئیجتهــاد

کام شێخی و کەسێ مورشد و پیـری
کام عیلم و عیرفـان، دانـایی و ژیـری

بابــــا مەردۆخە هەزار ئــــافەرین
ڕەحمەت جە ڕۆحش هەتا یەوم دین

کوتێــوش شــانا هەزار ماشــاالله
ئەحسەنول کـوت بێ لا حەولە وە لا

گەراش چون ماساو بەحری بێ پایان
نەهەنـگ هورگنـۆ نە تـوولی زەمـان

قوتــابی و شــاگرد یــا ئــامۆزایی
پەی تـۆ بـێ فەرقـا شـێخی و مەلایـی

بەش خــوا عــومرم بــدو تــا پــاییز
جـارێ تەر وینـوو دیـداری ئـازیز

یا خـوا نەڕێـزۆ پەنـجەو خـامەکەت
«ئـابی» وەفیـدای ئامـای نـامەکەت

شـەرتەن نـامەکەت بگێـرۆ نە بەرگ
بنـیەوش نە سـینە تـا وەسـاتی مەرگ

## حاجی شێخ عەبدوڵڵای نێزڵ

کوڕی حاجی شێخ شەمسەدین کـوڕی شـێخ عوسـمانی سـێڕاجەدینی بیـارەیە. لە گوندی نێزڵ ژیاوە و دەستی لە هۆنینەوەی شێعردا هەبووە. نازناوی «دانا»یە و لە ساڵی ١٩٥٥ی زایینی ماڵئاوایی لە ژیان ئەکات.

## خاتو خۆرشید مەریوانی

کچی شێخ مەعرووفی کەوڵوس و لە سەیدەکانی «تەڕاتەوەن»ە. بـاوکی بە هـۆی نالەباریی ژیان لە مەریـوانەوە بـۆ سـنە ئەڕوات و خـاتو خۆرشـید لە منداڵیـدا لە مـاڵی سالارەژنێکی ئەردەلانیدا ئەژی و باری خوێندنی بـۆ ئەڕەخـسێنن. خـاتو خۆرشید بە زمانی فارسی کتێبێک سەبارەت بە ماڵ و منداڵداری و بارهێنانی منـداڵ ئەنووسـێت و دیــوانە شـێعرێکیش دائەنێـت. بە داخەوە هــیچ کـام لەو بەرهەمـانە چـاپ و بـڵاو نەبوونەتەوە. لە سەدەی بیستەمدا ماڵئـاوایی لە ژیـان ئەکـات. خـاتو خۆرشـید دایکـی شاعیری نیشتمان پەروەری کورد «قانع مەریوانی»یە.

ئەم پارچە هۆنراوەیەی بۆ ئامۆژگاری عادڵەی کچی داناوە:

کچـــم! ڕۆڵەی کـــزۆڵەی بوردەبـــاریم
چرای ڕووناکی بێ دەستی و هەژاریم
کچـــم! پـــارچەی نەژاکـــاوی زەمـــانەم
نەتیـــجەی ئیهتمـــامی خوێنـــدەواریم
وەرە گـــوێ ڕاگـــرە بـــۆ پەنـــدی دایکـــت
فەرەح بەخـــشی دەروونـــی بـــێقەراریم
نەخـــۆی هەر گیـــز فەریبـــی ســـادەڕویان
نەبیـــتە هـــۆی زیـــادی شـــین و زاریـــم
کچـم! هۆشـی حەیـا و نامووسـی خـۆت بـێ
نەکەیت کارێ زیادکەی دەردی کـاریم
کچـم! هۆشـیاری خـۆت بە تـاکوو مـردن
وەکـوو مـن، بە زرەنگـی و هۆشـیاریم
کچـــم! وەڵـــڵا هەمـــوو داخـــی کچـــانە
نەخۆشـــین وکـــزەی بـــێ ئیختیـــاریم
نەتەنهـــا وەســـیەتم بـــۆ تـــۆیە ڕۆڵە
هەواداری کچـــانی کـــوردەواریم

## مەلا محەممەد ئەمین چیچوڕانی

مەلا محەممەد ئەمین چیچوڕانی، ساڵی ١٨٥٩ی زایینی لە گونـدی «چیچـوڕان» لە ناوچەی بانە چاوی بە ژیان هەڵێناوە. لای عەلامەی ئەو سەردەمە مەلا عەبدولڕەحمانی پێنجوێنی ئیجازەی مامۆستایەتی وەرئەگرێت و لە گوندی «چرچەقەڵا» لە کوردستانی ئێراق کاری تەدریس دەست پێئەکـات. پـاش گەڕانەوە بـۆ زێـدەکەی و مـاوەیەك تەدریس و وانەوتنەوە، ساڵی ١٩٢٤ هەواری ژیانی بۆ گونـدی«ڕەشـەدێ»ی مەریـوان ئەگـوێزێتەوە. دوای ١٠ســاڵ مامۆسـتایەتی و تەدریـس لەم گونـدەدا، سـاڵی ١٩٣٤ ماڵئاوایی لە ژیان ئەکات و گۆڕستانی «مەلامحەممەد ئەمین»ی ڕەشەدێ ئەبێ بە مـاڵی هەتا هەتایی.

### مەلا محەممەدی ڕەشەدێیی

کوڕی شێخ قادر کوڕی مەلا مەحموودی «نەچێ» یە، دەوروبەری ساڵی ١٨٨٢ی زایینی لە گوندی «ڕەشەدێ» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. ئەم زانا پایە بەرزە لە وەرزی بەهاری ساڵی١٩٤٢ ماڵئاوایی لە ژیان کردووە و گۆڕستانی گوندی «ڕەشەدێ» بووە بە دوا هەواری.

### شێخ عوسمان سێراجەددینی«دووڕۆ»

شێخ عوسمان کوڕی شێخ عەلائەددینی بیارە، ساڵی ١٨٩٣ی زایینی لە گوندی «سەفیاوا»ی جوانڕۆ چاوی بە ژیان هەڵێناوە. ساڵی١٩٥٧ بە هۆی بارودۆخی ئالۆزی ئێران و کوردستان گوندی «دووڕۆ» بە جێ دێڵێت و ئەڕواتە بیارە و پاشان بەغداد، تا ئەوەی وەک دوا هەوار لە تورکیە ئەگیرسێتەوە. ساڵی ١٩٩٦ ماڵئاوایی لە ژیان و شوێنکەوتووانی ڕێبازی نەقشبەندی ئەکات. شێخ عوسمان لە بواری پزشکیدا پسپۆڕ و لێزانێکی گەورە بووە و لە نووسین و شێعریشدا دەستی هەبووە. دیوانێ شێعری بە زمانی کوردی(سۆرانی و هەورامی) و فارسی لە ژێر ناوی «چەپکە گوڵێ لە گوڵزاری عوسمانی» لێ بڵاو بۆتەوە.

یارم دیارەن مەیلش کەم بەیەن
ئەڵبەت شەرتەکەی وەڵین کەم بیەن
چون جاران وە ناز نەدیا وە لاوە
ڕۆحم وە سارای عەدەم لاوە
هەرچەند مدرابیم دەس وە دوعاوە
یارم ئاماو شی، نەدیا وە لاوە
گرپەی بڵێسەی کوورەی دەروونم
ویەرد جە ئەفلاک نالەی زەبوونم
ئازیز ! جە داخت ئاخم پڕ داخەن
ڕۆحم چۆن نەفەس سوبحی چراخەن

وە جەفـــــــاو جەورە وەی تەرزو تەورە
شـــەش دەرم بینیـــان، نمـــارۆ مـــۆرە
ئیـــنە ڕەویەی شـــەرت هـــامڕازی نـــیەن
جە مێهـــــر و وەفـــا بێـــزاری نـــیەن
کـــێ پەی تـــۆ چـــون مـــن وە زام زەلـــیلەن
وەی خەیـــاڵی خـــام وە بـــێ دەلـــیلەن
پەنـــجەی ڕەنـــجەکەت جە دڵ کەردەن بەنـــد
بـــنج و بنچیـــنەی حەیـــاتم هۆرکەنـــد
گـــۆش دەر وە زیـــلەی زایەڵەی دەروون
گۆش دەر وە بوڵبوڵ نەغمە خوانی زوون
لەیـــل دەلیلـــی مەیـــل پەنەش نەمەنـــدەن
حەواســـی خەمـــسە جە دەستم سـەندەن
گـــاهێ وە خەیـــاڵ بـــۆ مەنیـــام نە بـــۆش
وە مەستیی پەستی دڵ مەبـی مەدهـۆش
یـــا ڕەب! وەخـــاتر ســـەییدی ئەکـــرەم
عەشـــقی حەقیقـــی پەنەم کەی کەرەم
عەشـــقی عوشـــشاقان، مەســـتانی ڕای حەق
مەخموور و مەستی وارگەی ( انـا الحـق)
مەســـــتێتیی وارگەی فەنـــــای ئەتەم تەم
وە هەوای نەوای (الـــست)م مـــاتەم

## شێخ محەممەد حەسەن مەزهەری[1]

محەممەد حەسەن مەزهەری کوڕی شێخ مەزهەر لە نەوەکانی «شێخ عوسمانی تەوێڵە»یە. دایکی «حەنیفە خاتون» لە ساداتی «عەبابەیلێ»یە. ساڵی ۱۸۹۴ی زایینی لە «تەوێڵە» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. خوێندنی لە خزمەت مامۆستایانی ئەو ناوچەیەدا دەست

---

۱. ئەم زانیارییانەم لە لایەن کاک «عەفان مەزهەری» کوڕەزای ئەم شاعیرەوە دەست کەوتوون کە جێگای ڕێز و پێزانینە.

پێئەکات و لە بەر ئەوەی مووچە و مەزرایان لە گوندی «گۆشخانی» ئەبێ ئەڕۆنەوە ئەو گوندە و کشت و کاڵ دەگرنەبەر. «مەزهەری» هەر لە تەمەنی لاویدا شەیدای عیرفان و تەسەوف ئەبێ و لای «شێخ عەلی حیسامەدین» کە مامەی بووە، تەمەسسووک ئەکا و ئەویش ڕێزی تایبەت لە برازاکەی ئەگرێ. لەسەر بانگهێشتی ئاغاواتی «ئیلخانی بۆکان» ماوەیەک بە ماڵەوە بۆ گوندی «عیلم ئاباد» لە نێوان مەهاباد و بۆکان کۆچ ئەکات و دەست ئەکا بە ڕێنووێنی و ئیرشادی خەڵک و ناوبانگ دەرئەکات. لەوێ «تحفە خاتوون»ی خێزانی کۆچی دوایی ئەکات و ئەویش ئەگەڕێتەوە زێدەکەی خۆی. ساڵی ١٩٤٥ لە گوندی «گۆشخانی» ماڵئاوایی لە ژیان ئەکات و هەر لەو گوندە لە گۆڕستانی تایبەتی بنەماڵەکەی لە تەنیشت باوکی بە خاک ئەسپەردە ئەکرێت.

شێخ محەممەد خولیای شێعری شاعیرانی کورد و فارس وەک: نالی، مەحوی، مەولەوی، ناری، حافز، سەعدی، کەلیمی و ئیراقی و... بووە. ئەم کەسایەتییە شاعیرێکی بەتوانا و قەڵەم ڕەنگین و هەست ناسکە. دەستی لە هۆنینەوەی شێعردا هەبووە و بە زمانی کوردی و فارسی شێعری هەیە و نازناوی «مەزهەری» و بڕێ جاریش «حەسەن»ی بۆ خۆی داناوە. زۆربەی شێعرەکانی وەک نامە گۆڕینەوە لەگەڵ دۆستانی بە تایبەت «مامۆستا سادقی نگڵی» بووە. بەداخەوە زۆربەی شێعرەکانی فەوتاون و کۆ نەکراونەتەوە.

یا ڕەسوول اللە بە قوربان زۆر پەرێشانم مەدەد<br>
زۆر لە کرداری خراپی خۆم پەشیمانم مەدەد<br>
وا بە ئاخر هات هەموو عومرم لە گەڵ ئەعمالی بەد<br>
خۆت دەزانی من ئەسیری نەفس و شەیتانم مەدەد<br>
ڕوو سیا و ڕوو ڕەش منم دەسگیری عاسی خوا ئەتۆی<br>
کەوتوویی باری گرانی جەور و عوسیانم مەدەد<br>
دەرد و عوسیان و گوناهم زۆرە چارەی ناکرێ<br>
ڕەحمەتی تۆ، مەرهەم و دەرمانی زامانم مەدەد<br>
تۆ بیتو ڕەحمی خودا و شاهی شەهیدی کەربەلا<br>
لابە زوو کێوی بەڵا شاها لە سەر شانم مەدەد

بــێ کەس و مــاتەم زەدە و مەغمــوم و بێچــارە و غەریــب
کــێ دەپرســێ غەیــری تــۆ قوربــان لە گریــانم، مەدەد
«مەزهەری» مــــاتەم زەدە بە خــــوا پەنــــاهێکی نیــــیە
غەیـری تـۆ، هەر تـۆی پەنـاهی دیـن و ئیمـانم مەدەد

## محەممەد کەریمی(مامۆستا قازی)[1]

محەممەد کوڕی عەبدولعەزیم کوڕی قازی عەبـدوڵڵای شەیدا و «ئەسما» خاتوون لە بەرەی سەیدەکانی بلْبەرە. ساڵی ١٨٩٥ی زایینی لە گوندی توتمەر چاوی بە ژیان هەڵێناوە. لە دوای کۆچی باوکی ئەڕواتە چۆڕ. «ئاغاحسێن[2]»ی چۆڕی وەک بـاوکێکی دڵـسۆز و مامۆسـتایەکی لێهـاتوو ئەرکـی بەخێو کردن و وانە پێوتنەوەی وەئەستۆ ئەگرێت. دوای چێژ وەرگـرتن لە زانـستی ئەو زانـایە، دواتـر بـۆ درێـژەدان بە خوێندن ڕوو لە بەردەڕەشە ئەکات و چەند ساڵێک لە خزمەتی شێخ فەتاحی حەسنی، باوکی شاعیری مەریوانی، شێخ حەمەمارفی حەسەنیدا، وەک قوتابی ئەمێنێتەوە. ساڵی ١٩٣٤ ئەگەڕێتەوە چۆڕ و لە سەر دەستی مامۆستای زانا و پایەبەرزی چۆڕ ئیجازەی مامۆستایەتی وەرئەگرێت. ئەچێتە دزڵی و ئەبێ بە نووسەر و کـاتبی مەحمـوود خـانی دزڵی. ئەم مامۆستایە بۆ خزمەت کردن بە خەڵـک لە کاروبـاری ئایینیـدا ئەگەڕێـتەوە زێـدەکەی زانـای پـایەبەرز قـازی عەبـدوڵڵای شـەیدا، و مـاوەی ٢٠سـاڵ ئەو ئەرکە بەڕێوە ئەبـات. لە دوای سـووتاندنی کتێبخـانەکەی بـاوەگەورەی[3]، هەواری ژیـان بـۆ

---

١. ئەم زانیاریە کاک «مادێح ڕۆستەمی» دەستی خستم کە جێگای ڕێز و پێزانینە.

٢. ئەم مامۆستا پایە بەرزە کوڕی «حاجی سەید حەسەن»ی چۆڕ ناسراو بە «چۆڕی» یە. ساڵی ١٨٥٦ی زایینـی لە چـۆڕ لە بنەماڵەیەکی ئایینی و زانست پەروەر چاوی بە ژیان هەڵێناوە و لە ساداتی چۆڕە . لە سەردەمی ژیانی پڕ پێزیـدا ئەرکـی بە خێو کردن و پێگەیاندنی زۆر کەسایەتی وەک مامۆستا قانع، مامۆستای سیاناو و مامۆستا قازی وەئەسـتۆ گرتـووە. سـاڵی ١٩٣٨ماڵئاوایی لە ژیان ئەکات و هەر لە مزگەوتەکەی خۆی ئەسپەردە کراوە.

٣. ئەو کتێبخانە، بەری ڕەنج و تێکۆشانی چەندین ساڵەی زانـای بلیمەت و مێـژوو نووسـی گەورە، قـازی عەبـدوڵڵای شەیدا بووە. لە دوای ناکۆکییەک کە لە نێوان بنەماڵەی مامۆستا قازی و خانەکانی ئەو نـاوچەیە درووسـت ئەبێـت، سـاڵی ١٩٤٥ خانەکان هێرش ئەکەنە سەرگوندی توتمەر و ئەو کتێبخانە نایابە ئەسووتێنن و هیچ شوێنەوارێکی لێ بە جێ نامێنێت.

گوندی دارسەیران ئەگوێزێتەوە. بە دروست بوونی مزگەوتی گەڕەکی «تەکیە»ی شاری مەریوان ئەبێ بە پێش نوێژی ئەو مزگەوتە و تا دواساتەکانی ژیانی لەو شوێنە ئەمێنێتەوە. ساڵی ١٩٩٧ ماڵئاوایی لە ژیان ئەکات و گۆڕستانی دارسەیران ئەبێت بە دوا هەواری ژیانی.

ئەم مامۆستایە وێڕای خزمەت بە ئایین، لە بواری شێعر و هەڵبەستیشدا دەستێکی باڵای هەبووە، بە دوو زمانی کوردی و فارسی، ژان و ئازارەکانی کۆمەڵگای کوردەواری و هەستی نەتەوایەتی و بیری ئایینی هۆنیوەتەوە. بەری ڕەنجی چەند ساڵەی لەو بوارەدا دەفتەرێک شێعرە کە هێشتا چاپ و بڵاو نەبۆتەوە.

**«بە شێ لە شێعری کوردە بە قوربانت بم»**

کوردە قوربانی ناو دار و بەردت
کوردە قوربانی هەناسەی سەردت
کوردە قوربانی مەردی مەیدانت
قوربان کەڵەڕاو کەیفی هەردانت
قوربان ڕێگەکەی گاوە کەچت بم
قوربان ڕێی مەرس مل بە کەچت بم
قوربان دۆڵەناو نەو هەوارت بم
قوربان ..... بێ زەوارت بم
قوربان شاخەکان شاهۆو زەڕەوەت
قوربان قەلەبەرد سەنگەر نەڕەوەت
کوڕەی میانە و تەخت هەزارانی
لوتککەی مەدی جێگەی بەرزانی
شاخی سان ئەحمەد شاخی مەڵەخورد
تەواو شاخەکان سەنگەرگاکەی کورد
شاخەکەی تەتە و شاخی دالانی
شاخی گوڵیجە و شاخی سەردانی
قوربان دەست و برد هەڵمەت غەزاییت
قوربان قانعی و نەفسی ڕەزاییت

قوربـــان مـــاڵەکەی چـــۆڵ و هۆڵـــت بـــم
قوربـان کـۆچ کـردن بـار و کۆڵـت بـم
کـــوردە قوربـــانی شـــارە و شـــارت بـــم
قوربـان نـاو غـار و خـار و مـارت بـم
قوربـان شـاخە و شـاخ سەرکوێـستانت بـم
قوربـان خـان ئەحـمەد تەختـی سـانت بـم
قوربـــان هەوارگەی هەوشـــوو بارانیـــت
قوربـــان زیـــارەت بـــاوە حەیرانیـــت
قوربـــان دوعـــای خێـــر پیرشـــالیارت بـــم
قوربـــان ئاشـــنا و دۆســـی پـــارت بـــم
کـــــوردە تــــۆم ســــپارد بەو عەوالآنە
نەوەدونـــــۆ پیـــــر ئەو هەورامـــــانە
قورئـــانی کەریـــم کەمە بـــازوی تـــۆ
کـــوردی هەڵ خـــولێ بە ئـــارەزوی تـــۆ
وەعـــــدەی خـــــودایە ئەدا دڵ خۆشـــــی
بـــۆ دڵتەنگەکـــان دوای مەدهۆشـــی
وەعـــدەی ســـادقان ئەدا خـــۆش ڕەنگـــی
بـــۆ هەمـــوو عەبـــدێ دوای هەر تەنگـــی
قوربـــان ئەشـــکەوتی ســـەختەکانت بـــم
قوربـــان ســـەر ســـینی بەردەکانـــت بـــم
قوربـــان فەرشـــەکەی خـــاکی ژێـــر پێـــت بـــم
قوربـــان ئاســـمانی لـــێفەی ســـەرت بـــم
قوربـــان هەســـێرەی چـــرای شـــەوت بـــم
قوربـان قاسـپە قاسـپ ڕەنگـی کەوت بـم
قوربـــان تـــۆخلەدار ســـفرەی شـــامت بـــم
قوربـان خـواردنی گییـای خامـت بـم
قوربـــان دۆشـــەکەی خـــاکی بـــۆژت بـــم
قوربـــان ڕەفیقـــی شـــەو و ڕۆژت بـــم

قوربـــان مـــاڵەکەی مەجنـــوون ئاســـات بـــم
قوربـــان نەعـــرەتە و دەنگـــی ڕەســـات بـــم
قوربـــان نەترســـی و هەم نوســـرەتت بـــم
قوربـــان بـــێ بـــاکی و هەم غیرەتـــت بـــم
ڕوو کەرە خـــودا خـــۆت پڕســـینە ڕۆ
لەم تەنـــگ و چەڵەم خـــۆت گرســـێنەڕۆ
«قـــازی» حـــازرە قەزای تـــۆ بگـــرێ
ئـــاڵاکەت بینـــێ و ئەو وەخـــتە بمـــرێ

## مامۆستا مەلا باقری بالک[1]

محەممەد باقر کوڕی حسێن خان ناسراو بە ئاغا گەورە کـوڕی مەنووچێهرخان کوڕی حـسێن خـان کـوڕی خوسـرەوخان کـوڕی ئەحمەد خان لە بنەماڵەی ئەردەڵانییەکانن. فـاتمە خـاتوونی دایکـی کچـی مەلا عەبـدوڵڵا لە بنەمـاڵەی شێخەلئیـسلامییەکانی سـنەیە. سـاڵی١٨٩٥ی زایینـی لە گونـدی «نـزار»ی سـنە چـاوی بە ژیـان هەڵێناوە. ئەم زانا پایە بەرزە شەش ساڵ لە گوندی «چۆڕ» و چل ونـۆ سـاڵ لە گونـدی «بالک» خەریکـی تـێ گەیانـدن و پـێ گەیانـدن و دەرس وتـنەوە بـووە و مەدرەسـە و حوجرەی بالک سەرچاوەی عـیلم و زانـست بـووە و زۆر کەس لە کانیـاوی زانـستی مامۆستای بالک چێژیان بردووە و سێ سەد فەقێ ئیجازەی مامۆستاییان لە سەر دەستی وەرگرتووە. هاوکات لە گەڵ تەدریس و مامۆسـتایی سـێ سـەد پەرتـووکی لە بـوارە جـۆار و جۆرەکـانی زانـستدا نووسـیوە کە بە داخەوە بـێجگە لە نیکـاح و تەڵاق «مەحمودیە» هیچکامیان لە چاپ نەدراون. لە بواری شێعر و وێـژەدا دەسـتێکی بـاڵای هەبووە و نازناوی «غەریـق»ە. دیـوانێکی شـێعری بە یادگـار بە سـێ زمـانی کـوردی، عەربی و فارسی بۆ گەلەکەی بەنێوی «دیوان مدرس کردستانی» بە جێهێشتووە. سـاڵی ١٩٧٢ لە گوندی «بالک» بۆ هەمیشەماڵئاوایی لە حوجرە و مزگەوت و وانە کردووە و

---

١. دیوانی مودەڕیس کوردستانی، مەلا محەممەد باقری بالکی مەریوانی.

گۆڕستانی گوندی بالک بووه به دوا هەواری.

دیواری پۆلا هیچ وەخت نابێ لەق حەقیش به ئینکار نابێ به ناحەق
چاوی حەسودان کوێر و نابیناس بەچاوی ئەوان ڕاس نابێ ناڕاس

### محەممەدی کوڕی شێخ عەلی مەریوانی دەرهەردیی

ساڵی ١٩٠٥ز کتێبی «الحواشی الجلالیه»ی نووسیوه. بەڵام شوێن و ساڵی له دایک بوون و کۆچی دوایی نادیاره.

### مەلا حەمە سەعید سادەوا

کوڕی مەلاعەبدوڵڵا کوڕی خودامراد له گوندی «بالک» چاوی به ژیان هەڵێناوه. ساڵی ١٩٧٩ی زایینی ماڵئاوایی له ژیان ئەکات و له گۆڕستانی حاجی شێخ له پێنجوێن ئەسپەرده کراوه. ئەم زانا پایەبەرزه دەستی له هۆنینەوەی شێعردا هەبووه و بەداخەوه تەنیا ئەم شێعرەی له فەوتان ڕزگار بووه. مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس له کتێبی «علماونا فی الخدمه علم و الدین»[1] به تێر و تەسەلی باسی گەورەیی و زانستی ئەم کەسایەتییه ئەکات.

سەبارەت به گلەیی له نیوه و ناتەواو سەرفیترەدانی خەڵک وتوویەتی:

ئەگەر عەقڵت بێ ئەمه پەنێکه
شەرتی کەر دوو مەن، هی خۆت مەنێکه

جێگای ئاماژەیه که ئەم کەسایەتییه باوکی «مامۆستا محەممەد یۆسفی ڕەهنموون»ه.

## شاعیران و نووسەرانی سەدەی ٢٠ی زایینی

### شێخ محەممەد خەڵووزه (حەسرەت)

کوڕی سەید عەلی کوڕی سەید فەتاح کوڕی شێخ محەممەد کوڕی شێخ ڕەزای هەنگەژاڵی کوڕی شێخ ئەحمەد کوڕی شێخ عەلی دۆڵپەمووه. له گوندی «بێلوو»

---

١. علماؤنا فی الخدمةِ علم والدین، مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، ل٦٢٢.

چاوی بەژیان هەڵێناوە. لەخزمەت کاکەحەمەی بێلوودا ئیجازەی مامۆستایی وەرگرتووە[١]. یەکونیو دانگی بێلووو ملکی خۆیان بووە کە دوای کۆچی براکەی، ناکۆکی لە نێوان حەسرەت و یەکێ لە خانەکانی «بێلوو» پەیدا ئەبێ و لە بێلوو دەرئەکەوێت و ئەچێتە گوندی «خەڵووزە». بەهۆی گۆڕانکاریی سیاسییەوە خەڵووزە بە جێ دێڵن و ئەڕۆنە «گۆخلان». وەک مامۆستای ئەو گوندە تا کۆتایی ژیانی ئەمێنێتەوە. لە سەدەی بیستی زایینیدا ماڵئاوایی لە ژیان کردووە[٢]. دەستێکی باڵای لە هۆنینەوەی شێعردا هەبووە و نازناوی «حەسرەت»ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە. شێخ مەحموودی «مێرگەدرێژ» کە خوشکەزای مامۆستا حەسرەت و پیاوێکی بەتەمەن و نەخوێندەوارە و شێعری زۆربەی شاعیرانی سەردەمی خۆی لەبەرە، بۆی گێڕامەوە: خۆم لە خاڵۆم بیست کە وتی: «شەوێ نەخۆش کەوتم، ئەوەندە ئێش و ئازارم بوو، هۆشم لای خۆم نەمابوو، چوارسەد شێعر لە شێعرەکانی خۆمم سووتاند و دوایی بۆم دەرکەوت چ خەسارێکم لە خۆم داوە.» بەداخەوە شێعرەکانی مامۆستا حەسرەت لە ناو چوون و تەنیا ئەم شێعرەی ماوەتەوە کە ناوی «بەردئاش»ە.

### «داوا و پاڕانەوە»[٣]

یارەب موحتاجم یارەب موحتاجم
یا ڕەب بە تۆیە چار و عەلاجم
یارەب سفید کەی ڕووی وەکو ساجم
ڕەواج بەی سکەی زۆر ناڕەواجم
بۆ نیشانەی خەم هەر وەک ئاماجم
بێ ماڵ و دەوڵەت بێ خەرج و باجم
بە تۆ موحتاجم یا شاهی شاهان
یا «مالک الملک» کار بەدەس ئاسان

---

١. بە پێی ئەم ئیجازە وەرگرتنەی لە سەدەی بیستەمی زایینیدا لە دایک بووە.

٢. ئەم زانیاریانە کاک «حسێنی ئەردەوانی» لە شێخ عەبدوڵڵا کوڕی شێخ حەسەن خەڵکی گوندی «ڕاوگان» لە پێنجوێن دەستی خستم کە جێگای ڕێز و پێزانینە.

٣. ئەم شێعرە «کاک مێهدی موڕادی ڕەزاوی» لە شریتەوە بۆی دابەزاندم، جێگای ڕێز و پێزانینە.

یـــا ڕەب بەخـــاتر ئەولیـــا و خاســـان
گوشاد کەی موشکل جوملەی حەق ناسان
دامـــاو و ماتـــڵ بـــێ ڕزق و ڕۆزی
وام لە خەیـــاڵا بـــۆ ڕزقـــی ســـۆزی
ڕزق و بەراتـــم نیـــوە ئاشـــێکە
ئومێـــــدی خەلیـــــل .........[1]
بەرد ئـــاش حـــازرە ئاشـــم بـــێ ئـــاوە
ئاشیـــشم ئێحـــسان بەڕزای خـــاوە
خەیـری ســاحێب خێـر بـێ ئـاو وەستاوە
بـــۆ ڕەحمەتـــی تـــۆ تـــاوێ ســـەد تـــاوە
مـــاڵ و منـــاڵم چـــاوەڕێی مـــزەن
بـــێ نـــان و بـــێ دۆ بـــێ ڕۆن و چـــزەن
ئەمە چ وەخـــتە نیـــوەی زســـتانە
عـــالەم وشـــک و ڕەق بە بـــێ بـــارانە
ئەر لە بەر مـــنە بـــاران نابـــارێ
بـــا نەگبەتـــی بەم بـــڕۆم بـــۆ شـــارێ
مەیلـــت وا بە لای دەوڵەمەنـــدەوە
بەدارای ئەســـبابْ چـــای و قەنـــدەوە
مەشـــغوڵی کـــاری ئـــێمەی بەد بەخـــت بە
موشکڵ گوشای کار ئێمەی سەر سەخت
بە جـــارێ ئەوا مـــردین لە برســـا
بەفـــر و بـــارانێ بێـــنە وەک ئەوســـا
یـارەب بە ئیعجـاز سـی جـزمەی قورئـان
خەلە هەرزان کەی بە عیـــشقی خاســـان

---

١. ئەم وشەیەم بۆ ڕاست نەبۆوە.

باران بارێنی، لافاو سەر واز کا
بە هەرد و دەشتا وەك تەیر پەرواز کا
لافاو دەشت و دەر تەواو داپۆشێ
بێ دەنگی تا کەی، فەلەك خرۆشێ
تا کەی ئینتیزار بەفر و باران بم
لە نائۆمێدی گەستەی ماران بم
بۆ مزەی گاڵی تاڵە داماوین
فرە ئینتیزار پووکە و ماساوین
یارەب نامەوێ بنکرِی پلاو
ئەوە بۆ مەتبەخ ......[1]خاو
گۆشتی فرووجت لێ تەڵب ناکەم
خوا بمگرێ ئەگەر داوا کەم
کەبابم ناوێ گۆشتی مەرِ ناخۆم
کوردم بە کوردی فێری نان و دۆم
جلی گاگرانی ناکەمە بەرم
رەشتی و جامانەم ناوێ بۆ سەرم
ماینم ناوێ بۆ سەر و سواری
نامەوێ رەعیەت خەرج و بێگاری
لاکێش و قاڵیم ناوێ بۆ دیوان
چیمە لە بگرە و بەردەی دیوەخان
فکری بەخت و تەخت خوسرەوان ناکەم
داوای گەنج و ماڵ مەحموود خان ناکەم
خاو و میراوام ناوێ تا باشماخ
نامەوێ حوکمی گەرووس و لەیلاخ

---

١. ئەم وشەیەم بۆ راست نەبۆوە.

بــــۆ چــــیمە بەزم و دەبــــدەبەی ئێــــران

ســـەفاتی بـــۆ کەیـــف خـــانی مەریـــوان

لـــوولەی ئەقـــراوی جـــگەرەی سامـــسۆن

نـــامەوێ لە گەڵ قـــرچەی پیـــاز و ڕۆن

موخلیـــسی کـــۆکەی گـــاڵ و دۆکەشـــکم

دوژمنـــــی چـــایی تـــاڵی بەد تەشـــــکم

هەتیـــــو ئیـــــزەبەی چــــای تــــاڵ ئەکەم

موحتـــاجی نـــانم داوای گـــاڵ نـــاکەم

ئـــارەزووی مـــاس و کـــۆکەی گـــاڵمە

بـــێ نـــانی نوخـــشەی مانـــگ و ســـاڵمە

پـــڵاوی چەور و هەورامـــــی و ســـاجی

ئەویـــش بـــۆ دیـــوان ئاغـــاکەی ســـاوجی

نـــامەوێ بـــــووکی تـــــازە و بە نـــــاواز

بـــۆ عەیـــشی شـــەوان بـــۆ ڕاز و نیـــاز

ئەوە بـــۆ مەحمـــوود حەیـــدەری نـــژاد

«حەسـرەت» بـۆ چیەتـی بـێ نـان وبـێ زاد

ســـکەی ئەســـکەناس ڕەزای پەهـــلەوی

تەڵای دەس ســـاز و لیـــرەی خوســـرەوی

نـــامەوێ یـــاڕب هـــیچ کـــام ئەمـــانە

مەقـــسوودم ئـــاو و بەفـــر و بـــارانە

ئـــاوبێتە گەردش مـــزە هەرزان کـــا

یـــایێ[1] تەبەکمـــان بـــۆ پـــڕ لە نـــان کـــا

مەشکە پـڕ لە مـاس کەرەی دیـزەی سوور

ئەویـــش بـــۆ مەولا پیـــری مێرگەســـوور

---

١. لە موکریان بە «خانم» دەڵێن «یایێ».

لەنـــــاو عالەمـــــا قـــــوتبی تەواوە
ســـاحێب بـــزگەل و کـــووری خەســـاوە
حەســـرەت دانیـــشێ ئیتـــر بـــێ دەنـــگ بە
لە بەحـــری غەمـــدا هەر وەکـــوو ســـەنگ بە
یـــــارەب ئاشـــــەکەم بێنـــــی بە گەڕان
بە یادمـــــان بـــــکەی بە بەفـــــر و بـــــاران
ئەگەر ئاشـــــەکەم بـــــگەڕێ بەســـــمە
عەبەی بـــــرایم خـــــۆ فریـــــاد ڕەســـــمە
زۆر بە ئیخلاســـــــە تەواو حەق ناســـــــە
ئەزانـــــێ لە مـــــاڵ چ دەنـــــگ و باســـــە
گەر خـــــودا بکـــــا گەڕێ ئاشـــــکەم
لە ســـایەی شـــێخۆ تەرک ڕێبـــاز ئەکەم

**قادر سەڵەسییەیی**

کوڕی شێخ سەمەدی سەڵەسیی بووە و ساڵی لە دایک بوون و کۆچی دوایی نادیارە. هەر ئەوەندە کە مامۆستا محەممەد عەلی قەردەاغی لە کتێبی «بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد»دا باسی نووسەرێکی لێهاتوو بە نێوی قادر سەڵەسییەیی دەکات کە خاوەنی کەشکۆڵێکە. ئاماژەی پێکردووە کە گوایە ئەم نووسەرە بە فارسی نووسیویەتی «بە دست قادر فرزند شیخ صمد اهل روستای سلسی در روستای عصرآباد نوشته شده»[1].

**کەیخوسرەوی مەریوانی**[2]

یەکێ لە نووسەرانی مەریوانی بووە کە لە نووسینەوەی «کەشکۆڵی ئەحمەدی براڵە»دا ڕۆڵێکی بەرچاوی گێڕاوە. بەڵام شوێن و ساڵی لە دایک بوون و کۆچی دوایی نادیارە.

---

١. واتە، بە دەستی قادری کوڕی شێخ سەمەد خەڵکی گوندی سەڵەسی لە ئاوایی عەسرئاوا نووسراوە.

٢. ئالبۆمی کەشکۆڵ، محەممەد عەلی قەرەداغی.

## سەید ئیبراهیم چۆڕی و سەید عەبدوڵڵای چۆڕی

دوو کەسایەتی ئەدەبی و زانای مەریوانین کە شوێن و ساڵی لە دایک بوون و کۆچی دواییان ڕوون نەبۆتەوە.

## مامۆستا قانع

شێخ محەممەد کوڕی شێخ عەبدولقادری کەوڵۆس کوڕی شێخ سەعید کوڕی شێخ محەممەدی دۆڵاش، ساڵی١٨٩٧ی زایینی لە گوندی «ڕیشێن» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. لە چل ڕۆژەی تەمەنیدا باوک و لە چوارساڵەشدا دایکی کۆچی دوایی ئەکات و قانع لە بۆن و برامەی باوک و دایک بێ بەش ئەبێت. خوالێخۆشبوو «سەید حەسەنی چۆڕی» وەک باوکێکی دڵسۆز پەروەردەی ئەکات و ئەینێرێتە مەکتەب. مامۆستا قانع بە کوردی و فارسی شێعری هۆنیوەتەوە و زۆربەی شێعرەکانی گلە و گازەند لە بارودۆخی ڕۆژگار و ڕەخنە لە دۆخی بێ سامانی ژیانی خۆیەتی. قانع پیاوێکی قسەخۆش و نوکتەزان و نەفس بەرز بووە و دەستی بۆ لای کەس ڕانەکێشاوە و بۆ بژێوی ژیانی ئەم کارانەی کردووە: نووسەری، مامۆستای مزگەوت، مامۆستای مەکتەب، باخەوانی، فەلایی، وردەواڵەفرۆشی، ئاشەوانی، دارفرۆشی و تەنانەت کاریگەری. هۆنراوەکانی ئەم شاعیرە لە پێنج کۆمەڵدا بڵاو بوونەتەوە، وەک: گوڵاڵەی مەریوان، باخچەی کوردستان، چوارباخی پێنجوێن، شاخی هەورامان و دەشتی گەرمیان. مامۆستا قانع ساڵی١٩٦٤ لە گوندی «لەنگەدێ»ی کوردستانی ئێراق ماڵئاوایی لە ژیان کردووە.

ئەم وێنەیە وامان بۆ دەرئەخات کە مامۆستا قانع شمشاڵ ژەنیش بوو بێت.[1]

---

١. ئەم وێنەیەم لە کۆمەڵە شێعری «باخچەی کوردستان»، لاپەڕەی ٦٩ وەرگرتووە.

قوربـانی ئەم خـاکەیە، ئەم ڕۆحە لە بەرمـا
سۆزی دڵی پڕ دەردە، کە خولیایە لە سەرما
ئامـادەیی مەیـدانم و ئەم بەرگە کە پۆشیم
کفنە، نەوەکو چاکەت و پانتۆڵە لە بەرما

**«ستایشی مەریوان»**

ئەم خـــاکی مەریـــوانە وەکـــوو جەنەتـــی خەزرا
پـڕیە لە مەلەك، یەعنـی خەجـێ و فـاتم و عـوزرا
ئەم خـــاکی مەریـــوانە وەکـــوو جەنەتـــی خەزرا
ئەم خـــاکی مەریـــوانە وەکـــوو عەرشـــی مـــو عە لا
ئەم خـــاکی مەریـــوانە، بـــرا، کـــانی ســـەفایە
ئەم خـــاکی مەریـــوانە وەکـــوو زرووەیـــی ئەعـــلا
ئاو سارد و هەوا سووك و فەرەح بەخش و عەتـردار
بۆخۆشـترە دڕکـی، لە دووسـەد نەرگـسی شـەهلا
پیـــاوانی هەمـــوو ژیـــر و ژنـــانی هەمـــوو ئاقـــڵ
پیرانـــی هەمـــوو ڕەنـــد و منـــاڵی هەمـــوو دانـــا
مەســـتانە ســـیفەت ســـەف ئەبەســـن گەورە کچـــانی
زێبەنـــدەترن، کـــاکە لە ســـەد تاوســـی زیبـــا

یـا خـود بە مەسـەل کەبکـی دوری جیلـوە فرۆشـن
بـێ بـاك لە هەرتـانە، وەکـوو دایکـی مەسـیحا
گـوڵزارە هەمـوو دەشـت و دەر و شـەربەتە ئـاوی
گۆیـا تـۆ ئەڵێـی زەمـزەمە، یـا کەوسـەری ئەعـلا
کـانی کەرەم و مەخزەنـی ئەسـراری سـەداقەت
یـا وەك سـەدەفی پـڕ لەدوڕ و، دانەیـی یەکتـا
بـۆ زامـی خەفەت مەرهەمە سـەیرانی مەریـوان
پـڕیە لە وەتەن خـواە، وەکـوو «قـانعی» دانـا

## تایەر بەهجەت مەریوانی[1]

یەکێ لە شاعیرانی سەردەمی مامۆستا قانع بووە کە لە شیکاگۆ ژیاوە و چەندین نامەیـان لە گەڵ مامۆسـتا قـانع بە شـێعر ئـاڵوگۆڕ کـردووە. ئەمە بەشـێ لە یەکـێ لە شێعرەکانی «مامۆستا قانع»ە کە بۆ ئەوی نووسیوە، بەڵام شێعرەکانی ئەو نادیارن.

ئەی موشـفقی دێـرینە لە هەرکـار خەبەردار
ئەی عاشـقی دیـوان و غەزەلبـازی و ئەشـعار
ئەی مەرهەمـی زامـانی دڵـی خەسـتەو و خەمبـار
دامـاو و سەراسـیمە لەدەس گەردشـی دەووار
یـادی وەتەنـت لازمە، تامـاوە بەهـار؟

## مەلا عەبدوڵڵای سەجادی بڵبەر(سەید بڵبەری)

مەلا عەبدوڵڵای سـەجادی بڵبەر، ناسـراو بە سـەید بڵبەری، کـوڕی سـەید تالـب کوڕی سەید عەلی کوڕی سەید عەبدولحەمید لە بنەماڵەی سـەیدەکانی «کەلجـی»یە. سەرەتای سەدەی بیستەمی زایینی لە دایك بووە. خوێندنی بە قورئانی پیرۆز و کتێبە وردەکانەوە دەست پێئەکات. بە شوێن فێربوون و زانستدا کوردستانی ئێران و ئێراق گەڕاوە. دوای تەواو کردنـی خوێنـدن بـۆ زێـدەکەی خـۆی گونـدی «کەلجـی»

---

[1] دیوانی مامۆستا قانع، ل ٨٣

ئەگەڕێتەوەو دوای پێکهێنانی ژیانی هاوبەشی ئەڕۆاتە گوندی «بڵبەر». لە تەمەنی ٩٢ساڵیدا چرای ژیانی ئەکوژێتەوە.

ئەم نووسەرە خاوەن بیست وحەوت پەرتووک بووە کە هەر هەموویانی بە خەتی خۆی نووسیوە بەڵام بڕێکیان فەوتاون(جێگای ئاماژەیە کە لە نووسینەکانیدا لە بری دەوات و جەوهەر لە دۆشاوی هەنار کەڵکی وەرگرتووە.) ئەم شاعیرە پایە بەرزە شێعرەکانی بە زمانی کوردی(سۆرانی، هەورامی) و فارسی هۆنیوەتەوە.

**بەشێ لە بەرهەمەکانی بریتین لە:**

١ـ گلزار، (شێعر بە زمانی فارسی). ٢ـ دیوانی شێعر(زۆرتر لە پێنج هەزار شێعر بە هەورامی). ٣ـ مێعراج نامە(شێعر بە هەورامی). ۴ـ وەرگێڕاوی «قصیدە بردیە» (شێعر بە زمانی فارسی). ۵ـ مشاعرنامە(شێعر بە زمانی فارسی). ۶ـ اعتقادنامەی مولانا جامی(شێعر بە زمانی فارسی). ٧ـ رسالە آداب الایمان(بە زمانی فارسی). ٨ـ کلام شیخ فریدالدین عطار(شێعر بە زمانی فارسی). ٩ـ شێعر بە کوردی(سۆرانی). ١٠ـ کتێبی «قواعدالنجمیە» (شێعر بە زمانی عەرەبی).١١ـ کتێبی «کشف الغطا» (بە زمانی عەرەبی).١٢ـ گۆڕ و ڕۆژی قیامەت (شێعر بە زمانی عەرەبی).

**نموونەی شێعری سەید بڵبەر:**

فیدات بم نازەنینی خۆم، لە بەر چی لێم نەزەر ناکەی
بە تەئسیری لەبی لەعلت لە جەرگ و دڵ نەزەر ناکەی
بە تیری تیژی خوێن خوارت، بە چاوی مەستی بیمارت
بە نوتقی شەکەرین بارت، دڵی زارم نەکردت حەی
دوو چاوی نەرگسین وارت، دوو زوڵفی عەنبەرین بارت
ئەگەر ئەم جارە بنوێنی، دەڵێم ئۆخەی، دەڵێم ئۆخەی
دڵم بۆ خاڵی موشکینت، لە بۆ دوو زوڵفی چین چینت
زەلیل و زارە بۆ دینت، بینایم بۆ نەزەر ناکەی

## سەید عەتای چۆڕی[١]

کوڕی حاجی ئاغا ئەحمەد، کوڕی سەید حەسەنی ناسراو «چۆڕی»یە و دایکی حلێمە خاتوون کچی مەلا قادری بیارەیە. ساڵی ١٩٠٠ی زایینی لە گوندی چۆڕ چاوی بە ژیان هەڵێناوە. هەر لە منداڵیدا هەتیوی پێبڕاوە و ئەرکی بە خێوکردنی ئەکەوێتە ئە ستۆی «ئەنیسە» خاتوونی خوشکی. خوێندنی لە چۆڕ دەست پێئەکات. بۆ درێژەدان بەخوێندن زۆر شوێنی کوردستانی ئێراق و ئێران گەڕاوە. لە ئێراق ماوەیەک لە عەبابەیلێ ئەخوێنێت دواتر ئەچێتە بیارە و لە خزمەت مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسدا ئەمێنێتەوە. دواتر ئەگەڕێتەوە مەریوان بەم شێعرە داوای جێگای خوێندن، لە مامۆستا ناری ئەکات:

یتیم علم و ادب بیشتر به لطف سازست
یتیم بی ابوین بس است پاره ای نان

کاک حەمەی بێلوش بەم شێعرە وەڵامی ئەداتەوە و جێگای خوێندنی پێ ئەدات:

لیک چو هنگام قضا باشد معین
نیست تقصیری از این پیر حزین
چون عطا پیوسته منظور خداست
از عطا قلب «محمد» کی جداست

دواتر ئەچێتە خزمەت مامۆستا مەلا مەحموودی دەرەتفێ و دوای ماوەیکیش ئەوێ بە جێ دێڵێت و ئەڕوات بۆ بالک و لە خزمەت مامۆستا مەلا باقری بالکدا ئیجازەی مامۆستایەتی وەرئەگرێت. پاشان ئەگەڕێتەوە زێدەکەی خۆی چۆڕ و وەک مودەڕیس و وانەبێژ خزمەت ئەکات. دوای دامەزراندنی قوتابخانەی مزگەوتی گوندی دەگاشێخان، هەواری ژیان بۆ ئەو دێیە ئەگوێزێتەوە و تا کۆتایی ژیانی لەوێ ئەمێنێتەوە. ساڵی ١٩٩١ ماڵئاوایی لە ژیان ئەکات و گۆڕستانی گوندی چۆڕ ئەبێ بە دوا هەواری ژیانی.

---

١. ئەم ژیاننامەیە «سەید مەحموودی شێخەلئیسلامی» دەستی خستم کە جێگای ڕێز و پێزانینە.

**«پاڕانەوە»**

بە قوربانی سەرت بم من ئەسیری نەفس و شەیتانم
تەوەجوە کە بە حالم من غەریقی بەحری عسیانم
پەشیمانم لە حالم چوون تالەعم پوچ و بێ نەفعە
بە ڕووی ڕەحم و لوتفت دائیما من دڵ پەرێشانم
شەفاعەت گەر نەکەی بۆ من لە لای ڕەبی هەموو عالەم
بە پێی قانوونی ئیسلامی شەریکی ئەهلی نیرانم
بەڵێ غەفار و سەتارە لە بۆ هەر عەبدێ مەیلی بێ
ئەوەی تۆیش ئەکەی قوربان لە لای من غەیبە نایزانم
لە هەر کوێ دامبنێی خۆشە بەلام بەو شەرتە ڕازی بی
جەهەنم بێ چ جەننەت بێ موتیع و بەندە فەرمانم
پەنا بە خوا ئەگەر ڕازی نەبی جێگەم لە هەر کوێ بێ
چ دۆزەخ بێ چ جەننەت بێ حەریفی ئەهلی خوسرانم
«عەتا»! فەرموویە حەق من هام لە زەننی عەبدما ئیتر
مەیەژە تۆ لەمەولا من لە ڕەحم و عەفویی حیرمانم

## محەممەد سادق ئەحمەدزادە

مەلا محەممەد سادق ئەحمەدزادە نگڵی، کوڕی حسێن کوڕی مەحموود کوڕی ساڵح کوڕی مەحموود کوڕی نەجمەددین خانی کەمانگەرە و دایکی «ئاسیە» کچی مەلا عەبدوڵڵای کەمانگەرە. ساڵی ١٩٠٢ی زایینی لە گوندی «نگڵ» چاوی بەژیان هەڵێناوە. خولیای فێر بوون و زانست هەوارە و هەواری پێکردووە و لە خزمەتی زۆر مامۆستادا چۆکی فەقێیەتی داداوە: بۆ وێنە لە نگڵ لای مەلا قوتبەددین و لە ئەوێهەنگ لای مەلا محەممەد سادق مودەڕیس دەرسی خوێندووە. ئەم مامۆستا شاعیرە، پیاوێکی دڵ ئاوەلا و ڕووخۆش بووە و هاوینی ساڵی ١٩٦٦ لە گوندی «نگڵ» ماڵئاوایی لە ژیان کردووە. دیوانێکی شێعری بە یادگار بەنێوی «دیوانی مەلا محەممەد سادق نگڵی» لێ بە جێماوە. نازناوی ئەم شاعیرە «صادق»ە.

ناچمە نێو خاکی غەریبی عاجز و خەمبار ئەبم
موبتەلای دەرد و دووچاری وەسوەسەی ئەغیار ئەبم
من کە ڕۆڵەی داوێنی نازی وەتەن خاسی خۆمم
دوور لە کۆشی مادەری، تووشی هەزار ئازار ئەبم
حەرفی بێگانە بە گوێی دڵ با بە ناحەق نەژنەوم
بەد دڵ و بەد باتن و بەد خواە و بەدکردار ئەبم
نان لە ماڵی مەردوما ناخۆم لە خوانی میننەتا
مەسمومی زەهری هەلاهەل، ژار و زەهری مار ئەبم
ئەی وەتەن جاڕووکەشی ئارا و بساتی پاکی تۆم
خادەمی خاسی خیرەدمەند بۆ گوڵی بێ خار ئەبم
ئەر بەدڵخوازیت وەتەن عومرم تەواو بێ عاقیبەت
بلبلی باغی بەهەشت و سەرخۆشی گوڵزار ئەبم
نازەنینی و نازکی، ڕاسی وەتەن من عاقیبەت
«سادق»م کوشتەی نیگاری نازکی و نازار ئەبم

## مامۆستا گۆران

عەبدوڵڵا بەگ کوڕی سلێمان بەگی کوڕی عەبدوڵڵا بەگە. گۆران لە ١٩٠٤ یا لە ١٩٠٥ ی زایینی لە «هەڵەبجە» لە دایک بووە. بنەماڵەی باپیری لە بەگزادەی میران بەگی بوون لە ناوچەی مەریوان. گۆران لای باوکی خوێندنی بە فێر بوونی قورئان دەست پێکردووە. پاشانیش لە مزگەوتی پاشای هەڵەبجە بووە بە فەقێ و تەنانەت ماوەیەکیش بە فەقێ عەبدوڵڵاە ناسراوە. دەرس خوێندنی گۆران لە قوتابخانەی ڕەسمیشدا پچڕ پچڕە و ژیانی تەژێ بووە لە گرتن و زیندان و چەندساڵی تەمەنی لە زینداندا بردۆتە سەر.

مامۆستا گۆران ئەم ئیشانەی وەك پیشە لە ژیانیدا هەبووە: مامۆستای قوتابخانە، ئەشغال بەشی کاروباری ڕێگا و بان، ڕادیۆ، بەرپرسی ڕۆژنامەی ژین، سەر

کریکاری، سەرپەرشتی گۆڤاری شەفەق ـ کە بە نێوی (بەیان)وە دەری کردووە ـ ئەندامی ئەنجومەنی زانستی زانکۆی بەغدا و ئەندامی دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی ژین. لە «مامۆستا گۆران» دیوانێکی شێعر بە نێوی «دیوانی گۆران» چاپ و بڵاو بۆتەوە و دوای خزمەتێکی بەرچاو بە ئەدەبی کوردی لە ڕێکەوتی ١٩٦٢/١١/١٨ بە نەخۆشی شێر پەنجە چاوی بە یەکجاری ناوەتەوە.

**«لە بەختی تار»**

لە بەختــی تــاری شــەو نــاکەم شــیکایەت
شــەبیهە چــونکە بەو زوڵفــی ســیایەت!
نــی یە قابیــل بڕینــی ڕاهــی دووری
وەکــوو پرچــت کــشاوە بــێ نیهــایەت !
بە هــیچ خاکــستەرێ نــاگەم، نەکــا بــۆم
لە ئەنجــامی لەهیبــی حــوب حیکــایەت!
کە تیــری نیــو نیگــات چەرخــانە ئینــسان
قەفەس خــاڵی ئەکــا مــورغی دیــرایەت !
لە چــاوی بەد خــوا عــومری جــوانی!
قوبــووڵ کــا لــێم بە پاداشــی ویقــایەت!
خەوی منــداڵ و ســـەهری عاشــقی زار
ئەبەخــشێ حــوزنی نەغــمەی لایەلایەت!
هووەیـــدایە لە ڕەنگــی ئــالی دەســـت
کە دائــیم پیــشەتە قەتــڵ و جینــایەت!
هەتــا کەی بــادە نۆشــی عەشــقی تــۆ بــم
هەتــا کەی بــێ مەزەی مــاچێ کیفــایەت؟
دەخیلــت بــم هومــای زولفەینــی دلــبەر
بە ســەر ســەرما بکێــشە فەیــزی ســایەت!
بە «گــۆران» نــاکرێ قەت تەرکــی ســەودا
کــلا نــابم لە ســەر جــادەی هیــدایەت!

## مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس(نامی)

مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس، کوڕی فەتاح کوڕی سلێمان کوڕی مستەفا کوڕی محەممەد خەجێ لە هۆزی «قازی»یە. دایکی «خانم»ە لە هۆزی «سورەجو»ە.

لە سەر شوێن و ساڵی لە دایک بوونی مامۆستا «نامی» باس و بۆچوونی جیاواز هەیە. بەڵام بە پێی بەڵگە سەرلمێنراوەکان ئەمەم بۆ دەرکەوت کە مامۆستا ساڵی ١٩٠٥ی زایینی چاوی بەژیان هەڵێناوە .

**ئەم بەڵگانە بۆ شوێنی لە دایک بوونی:**

١ــ بە پێی دیمانەیەک کە لە گەڵ حاجی ڕەشید تەرخان ئاوا(ئەردەوانی) ئەنجامما ئەمەی بۆ باس کردم: «لە گەڵ باوکم لە ڕێگای ئێراقەوە بۆ سەفەری حەج ڕۆیشتین. لە حوجرەی حەزرەتی غەوس(ر) لە بەغدا چاومان بە مامۆستا نامی کەوت. کاتێ مامۆستا زانی ئێمە مەریوانین بڕێک سەیری باوکمی کرد و فرمووی باشە ئەوە تۆ حەمەی دادە ئایشم نیت؟!(کاتی منداڵی لە گوێزەکوێرە پێکەوە ببوون.) دەستی باوکمی گرت و لە پەنای خۆی داینایەن و فەرمووی کە ئەمە هاوشیرەی خۆمە. هەواڵی یەک بە یەکی مامەکانمی لە باوکم پرسی و گوتیشی ئەمانە خزمی منن و لە زێدەکەی خۆمەوە هاتوون. دواتر کە لە بابەت چلۆنایەتی یەکتر ناسینیان پرسیارم لە باوکم کرد، تێی گەیاندم کە هەر دووکیان لە گوێزە کوێرە لە دایک بوون و دادە ئایشێ کچی کاکە عەبدوڵڵای باشە بەخێوی کردوون.»

٢ـ لە مامۆستا یۆسف ڕەهنموونم بیست کە گوایە مامۆستا نامی لە نووسراوە کۆنەکانیدا «عەبدوالکریم المریوانی»ی ئەنووسی.

٣ـ مامۆستا عەلی قەرداغی ئەم ڕاستییەی پشت ڕاست کردۆتەوە کە مامۆستا نامی لە یەکێ لە گوندەکانی دەوروبەری مەریوان لە دایک بووە.

٤ـ ئەگەر لەو شوێنانەی مامۆستا لە سەردەمی منداڵیدا دەرسی تێدا خوێندووە و ناوی لێ بردوون وردبینەوە، ئەو ڕاستییەمان باشتر بۆ دەرئەکەوێت: بەیەڵە، ئەسراوا، کانی سانان، لەنج ئاوا و بالک.

جێگای ئاماژەیە هۆی ئەوەی مامۆستا ئەو ڕاستییەی شاردوەتەوە، ئەگەڕێتەوە بۆ

بـاری ئەمنیەتـی و ئاسایـشی خـۆی و منـداڵەکانی و بەس. مامۆسـتا دوای تەمەنێـک خـزمەت بە ئـایین و فەرهەنـگ و ئەدەبـی کـوردی شـەوی ٢٩ لە سـەر ٢٠٠٥/٨/٣٠ ماڵئاوایی لە ژیان کرد.

**بەرهەمەکانی مامۆستا نامی:**

**بە زمانی کوردی:**

١ـ سەرچاوەی ئایین کە لە شـەش نـامیلکە پێکهـاتووە. ئیمـان و ئیـسلام، ئەساسـی سەعادت، ئاوی حەیات، چل چرای ئیسلام، نورو نەجات و ئیقباڵنامە.٢ـ مەولودنامە و مێعراج نامە. ٣ـ دووڕشتە. ٤ـ بەهار و گوڵزار. ٥ـ شەریعەتی ئیسلام. ٦ـ وتـاری ئـاینی بۆ ڕۆژانی هەینی. ٧ـ بارانی ڕەحمەت. ٨ـ یـادی مەردان. ٩ـ دیـوانی مەولەوی. ١٠ـ ڕاڤەی شێعرەکانی دیوانی نالی. ١١ـ ڕاڤەی شێعرەکانی دیوانی مەحـوی.١٢ـ کـۆمەڵە شێعرێکی فەقێ قادری هەمەوەندی. ١٣ـ حەج نامە. ١٤ـ ڕاڤەی «عقیـدە ی مرضـیە»ی مەولەوی لە عیلم و کەلامدا. ١٥ـ مەکتوبـاتی کـاک ئەحـمەدی شێخ.١٦ـ بنەمـاڵەی زانیاران. ١٧ـ تەفسیری نامی. ١٨ـ خۆلاسەی تەفسیری نامی. ١٩ـ نـوری قورئـان. ٢٠ـ ڕێگای بەهەشت. ٢١ـ نامەی هوشیار. ٢٢ـ شەرحی«فتح القریب». ٢٣ـ ڕێگای ڕەهبەر. ٢٤ـ بەدیـع و عەروزی نـامی.٢٥ـ ڕاڤە و لێکـۆڵینەوەی شـێعرەکانی سـالم.٢٦ـ ڕاڤەی تەسریفی زەنجانی.٢٧ـ سەنا و سکاڵا.

**بە زمانی عەرەبی:**

١ـ جواهرالفتاوی. ٢ـ جواهرالکلام فی عقاید اهل الاسـلام. ٣ـ صـفوەاللالـی مـن مستصفی الغزالی. ٤ـ ارشاد السالک الی المناسک. ٥ـ المواهب الحمیدە فی الفریدە. ٦ ـ نورالایمان. ٧ـ رسائل العرفان فی الصرف و النحو و الوضوع و البیان. ٨ـ ارشـادالانام الی ارکان الاسلام. ٩ـ الصرف الواضـح للمبتـدئین. ١٠ـ مفتـاح الاداب. ١١ـ رسـائل الرحمە فی المنطق و الحکمە. ١٢ـ المفتاح فی المنطق. ١٣ـ الورقات فی المنطق. ١٤ـ رسالە العزیزە فی المنطق. ١٥ـ الوجیهە المرضیە فـی المواجهـات. ١٦ـ اعـلام بالغیـب الهام بلاریب. ١٧ـ نورالاسلام. ١٨ـ علمائُنا فی الخدمة العلـم و الـدین. ١٩ـ مواهـب الرحمان فی تفسیرالقرآن. ٢٠ـ خلاصە منظومە جواهرالکلام فی عقاید اهـل الاسـلام. ٢١ـ الرسـالە و انوارهـا. ٢٢ـ اسـناد الاعـلام الـی حـضرە سـەیدالانام. ٢٣ـ المواهـب

الحمیده. ٢٤ـ الورده العنبریه فی مدح خیرالبریه. ٢٥ـ الانوار القدسیه فی الاحوال الشخصیه. ٢٦ـ الوسیله فی شرح الفضیله.

**به زمانی فارسی:**

١ـ شمشیر کاری بر فرق نسیم رستگاری. ٢ـ فوائد الفوائح در شرح(منظومه الفوائح).

**ـ ئەمانە دەستنووسن و بە عەرەبی نووسراون:**

١- العلمان فی العلمین.٢- شرح حدائق الصمدیه ٣- خلاصه التبیان.

**ـ بە زمانی کوردیش ئەم دەستنووسانەی نووسیوە:**

١ـ نامەی حەقیقەت. ٢ـ ڕۆژگاری ژیانم. ٣ـ سۆسەنی کۆسار. ٤ـ وەنەوشەی نازار. ٥ـ پەیڕەوان. ٦ـ باخچەی مەعریفەت. ٧ـ ڕاڤە و لێکۆڵینەوەی شێعرەکانی بێسارانی. ٨ـ شەمامەی بریندار.٩ـ نامەی بەختیار. ١٠ـ باوەشێنی دڵ بە چەند دەستە گوڵ.

**ـ بە زمانی فارسیش ئەم دەستنووسانەی نووسیوە:**

١ـ شهاب سما در رجم جن جان نما. ٢ـ فیوضات خدای ذی من. ٣ـ گلزار حکمت در رباعیات فارسی. ٤ـ هۆنراوەیەکی فارسی لە زانستی تەجویددا.

## محەممەد مورادی (کوڕەخات[١])

محەممەد مورادی[٢]، کوڕی حەمە کەریم ناسراو بە «کوڕەخات» ساڵی١٩٠٧ی زایینی لە گوندی «دەرەکێ» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. بۆ چارە سەری نەخۆشی ئەچێتە «بیارە» و دوای چاک بوونەوەی ئەبێ بە موریدی شێخانی بیارە و سەردەمانێکی زۆر لە بیارە و دووڕۆ وەک یەکێ لە نزیکانی ئەو بنەماڵەیە ئەمێنێتەوە. ئەگەرچی نەخوێندەوار بووە، بەڵام هەر بەمنداڵی دەستی بە شێعر هۆنینەوە کردووە و هەست و سۆز وخۆشەویستی خۆی بۆمەڵبەند و نیشتمانەکەی بەشێوەی شێعر دەربڕیوە. دوای دەس پێکردنی شەڕی ئێراق و ئێران ڕوو ئەکاتە کوردستانی بندەستی ئێراق و ماوەیەکی زۆر ئەمێنێتەوە. غەریبی و دوورە وڵاتی هەستی شێعری

١. دایکی ناوی خاتوون بووە.

٢. ئەم زانیارییانە لە لایەن کاک «غەفار» کوڕەزای ئەم شاعیرەوە دەسم کەوتوون کە جێگای ڕێز و پێزانینە.

زۆرتر ئەبزوێنێ و چەندین پارچە شێعری دوور و درێژ وەک قسە کردن لە گەل دارو بەردی زێدەکەی ئەهۆنێتەوە کە خوێنەر ئەخاتەوە بیری چامەکەی نالی بۆ سالم.

لە کاتی هۆنینەوەی شێعری کتووپڕ و لە ناکاودا، سەدان سەیرانگا و کانیاو و شیو و دوڵی مەڵبەندەکەی ناو لێ ئەبات و لە گەڵیان ئەدوێ. سەد مەخابن ئەژدیهای خەم ساردی و گوێ نەدان، زۆربەی شێعرەکانی هەڵ مژیوە و ئەوەشی مابێتەوە پرژ و بڵاون. ئەم شاعیرە لە دوای گەڕانەوە بۆ گوندەکەی، دوای مل ملانێیەکی زۆر لە گەڵ نەخۆشی، زستانی ساڵی ٢٠٠٢ ماڵئاوایی لە ژیان ئەکات و گۆڕستانی ئەو گوندە ئەبێ بە دوا هەواری ژیانی.

| | |
|---|---|
| کەردم ئاکەلە تا تاوام چڕیم | دەنگم نەیاوا، یەخەی خۆم دڕیم |
| دەروونم بیەن بە سیا پلاس | وەشڵێم بە قولێ مەدیو پیرەواس |
| جە نەقارەخان هەتا عەوالان | داخی داخانم عومرم شی تالان |
| پایینش پیرەواس،بەرزش عەوالان | ئانە نشینگەو شاو سۆسەن خالان |
| جە هانە تاڵە تا لووتەو دۆڵی | خەمێم فرێنێ گێرتێنم کۆڵی |
| چەمەو داودا تا پایین و باخا | چۆڵی وەتەنی پەی ئێمە داخا |
| جە باخچەو مروا تا هانە و مارا | غەریبی گولا چارما ناچارا |
| هەر جە مەخڵگا تا باخچە دەمە | من جە غەریبی، خۆم دانم لەمە |
| ملەگاو خەرمانی تا هانە و فاتێ | من جە غەریبی ئێ شێعرەم واتێ |
| ڕۆڵە خوا حافیز شمە سلامەت | دوعاگۆتانا تا کوو قیامەت |
| واتەی محەممەد پیر ئەباسی یا | ڕەزای خوداوەند ڕێگای راستیا |

## مامۆستا سەید عەلی خالدی

سەید عەلی خالدی[1]، کوڕی سەید باباشێخ کوڕی شێخ عەبدوڵڵا کوڕی شێخ محەممەدی کاژاوی، ساڵی ١٩٠٨ی زایینی لە شاری بانە لە بنەماڵەیەکی ئایینی و زانست پەروەر

١. ئەم زانیارییە کاک «عیرفان خالدی» کوڕەزای مامۆستا پێی دام، کە جێگای ڕێز و پێزانینە.

چاوی بە ژیان هەڵێناوە. لە تەمەنێکی زۆر خواردا(۱۵ساڵان) زانستە ئایینییەکان لە خزمەتی باوکیدا تەواو ئەکات و لە سەر خواستی باوکی بۆتاقیکاری ئەڕواتە شاری سنە و لە سەر دەستی مامۆستایانی پایەبەرزی ئەو سەردەمە وەک: ئایەتوڵڵا مەردۆخ، حەبیبوڵڵا مودەڕیس ڕۆحانی، عەبدولعەزیم موجتەهیدی، شێخ ئەحمەدی شێخەلئیسلامی و محەممەدی مودەڕیس گورجی، بە کۆی دەنگ ئیجازەی مامۆستای پێەدرێت و هەرهەموویان ئیجازەنامەکەی واژۆ ئەکەن. دواتر لەم شوێنانە مامۆستایەتی کردووە: پێنجوێن، باشماخ، بێلوو، نێ و مزگەوتی چوارباخی شاری مەریوان. ئەم زانایە نزیک بە شەست ساڵ خەریکی تێگەیاندن و پێگەیاندن و دەرس وتنەوە بووە و زۆر کەسایەتی گەورەی پەروەردە کردووە.

مامۆستا خاوەن بەهرەیەکی خودادای و بیر و هۆشێکی تایبەت بووە. لە زۆربەی زانستەکاندا، بە تایبەت: بیرکاری(ریاضیات)، هەندەسە و جەبر شارەزا بووە. بە چەشنێک کە ناوبانگی دەرکردووە و ئەو گرێ کوێرانەی لەم بوارەدا خەڵکی بۆی نەکراوەتەوە زۆر بەئاسانی کردویەتەوە. لە گەڵ مامۆستایانی پایەبەرزی ئەو سەردەمە وەک: شێخ محەممەدی خاڵ، ئایەتوڵڵا مەردۆخ، مامۆستا باقری باڵک و مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس نامەیان گۆڕیوەتەوە.

مامۆستا سەید عەلی کتێبێکی دەسنووسی لە ژێر ناوی «تسهیل المسائل» بە یادگار بە جێ هێشتووە کە هێشتا چاپ و بڵاو نەبۆتەوە. ئەم زانا گەورەیە ساڵی۱۹۸۴ ماڵئاوایی لە ژیان کرد و گۆڕستانی«دارسەیران» بوو بە هەواری هەتا هەتایی.

### شێخ نەجمەدین مەردۆخی[۱]

کوڕی بابە شێخ کوڕی شێخ ئیبراهیمی بەرقەڵا کوڕی شێخ عەبدولکەریمی دەگاشێخانە. بە پێی ناسنامەکەی ساڵی ۱۹۰۸ی زایینی لە گوندی بەرقەڵا چاوی بە ژیان هەڵێناوە. هێشتا چل ڕۆژ لە تەمەنی تێنەپەڕیوە باوکی کۆچی دوایی ئەکات و باپیریشی نزیکەی چل ڕۆژ پاش باوکی دنیای فانی جێ

۱. ئەم زانیارییە «کاک ئیبراهیمی مەردۆخی »پێی دام، کە جێگای ڕێز و پێزانینە.

دەهێڵێت. ئامینی خاتوونی دایکی بە هاوکاری ماڵباوکی خۆی(فەتاح بەگی گوێزەکوێرە) بەخێوی ئەکات. لە سەر باو و نەریتی ئەو سەردەمە هەر لەگوێزە کوێرە ئەنرێتە بەرخوێندن. پاش بڕینی پلەی سەرەتایی، هەر وەک هەموو فەقێکانی سەردەمی خۆی پەڕەوازەی حوجرە و خوێندنگاکانی کوردەواری دەبێت. بەڵام زۆر ڕوون نییە لە کوێ و لای کێ خوێندوویەتی، هەر ئەوەندە دیارە لە شاری سنە گیرساوەتەوە و لە مزگەوتی دارالاحسان(مزگەوتی جامێعە)، لە خزمەتی مامۆستا مەلا عارفی بانەیی دەرسی خوێندووە. لەم گوندانەدا مەلایەتی کردووە: زونج، دادانە، گڵیە، دەرەوەران و میراوا.

لەپاییزی ساڵی ١٩٥٥ لە تەمەنی ٤٨ ساڵیدا لە گوندی زونج کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی حاجی باوادا بەخاک ئەسپەردەکراوە. مامۆستا نەجمەددین هەرچەند لە خوێندنی ئاساییدا کەمی خوێندووە بە هۆی هەل و مەرجی نەگونجاوی ژیانەوە نەیتوانیوە وەک مامۆستایان و زانایانی سەردەمی خۆی هەموو پلە و پایەکانی زانیاریی ببڕێت، بەڵام بەهۆی زیرەکی و لێهاتووییەوە بلیمەت و ناوازە بووە و لە هۆنینەوەی شێعردا دەستی باڵای هەبووە و نازناوی شێعری «کەریمی» بۆخۆی هەڵبژاردووە و کۆڕ وکۆمەڵی بە بابەتی ئەدیبانە و شاعیرانە رازاندۆتەوە. سەد مەخابن وەک زۆربەی زانایان و ئەدیبانی کوردەواری بە ئاگری نەداری و هەژاری هەڵقرچاوە و بە دەربەدەری و کوێرەوەری و کۆچاوکۆچ ژیاوە. مامۆستای شاعیرمان لە هەموو بوارێکدا شێعری هۆنیوەتەوە و ویستویەتی بە دەست و پەنجەی ناسک و حەکیمانە زامی ناسۆری گەل و وڵاتەکەی سارێژ بکات. بەڵام بەداخەوە بەرهەمەکانی ئەمیش وەک بەرهەمی زۆربەی ئەدیبان و شاعیرانی کورد لە بەر بارودۆخی نالەباری ژیان لە ناو چوون. تەنیا پارچە شێعرێکی لە دیوانەکەی مامۆستا سادقی نگڵیدا بۆ ئێمە بە یادگار ماوەتەوە کە بە یەکەوە دۆستایەتی نزیک و شێعر گۆڕینەوەیان بووە.

شێعری خوالێخۆشبوو مامۆستا شێخ نەجمەدینی مەردۆخی (کەریمی)

**«بۆخەلیفەیەک»**

شێرزادەی ئەهلی شەرعم کاکە ترسم لانییە

ئەم تەرێقە تۆدەڵێی هەر چی دەپرسم وا نییە

مــن مەناقــب ئەولیــام زۆر خوێنــدووە بــڕوا بــکە
باســی زەرگ و تێــغ و بەرد و مــار و نــاری تیــا نیــیە
شەرعە وەک بەحــر و تەریــقە گەوهەری مەکنونی ئەو
نــاگەیە بەو گەوهەرە هەرکەس غەواســی شــا نیــیە
خــۆ تەریــقە چــوارە، مەشــهورە لەعــالەم، ئاشــکار
ســوهرەوەردی چەشــتی و هەم نەقــشی و گەیلانیــیە
سەر بە سەر ئادابی نەقشی سەبر و حیلم و مەعریفەت
چــون شــیعاری نەقــشبەند و حەزرەتــی ڕەببــانییە
قــادری دوورە لە عەیــب و قەدح و زەم هەڵنــاگرێ
نــووری عەیــنە، مــوحی دیــنە، بــۆ شــەریعەت بــانییە
ئەو دوویــی بــاقی یەقینــت بــێ لەوان تــر چــاکترن
چــونکە ئەووەڵ فــارۆقی ســانی ئەڵــێن عوســمانییە
پێم بڵێ ئەم چوارە کامیان زیـدەی شـەرعی ئەنوەرن
تــۆ لە دڵ دەرکە بەجــارێ جەهلــی ئەم نــادانییە
گەر ڕەفــاعی تــۆ بە شــاهید دێنــی بــۆ ئەم موددەعــا
ڕەددی ئەو قەولە زەعــیفە تــوحفەیە و شــیروانییە
جــامیعی شــەرع و تەریــقە ڕافیعــی هەر موشــکیلە
چــۆن لە ئەو ســادر دەبــێ فێعلــێ خیلافــی شــانییە
پەس دەلیلــی تــۆ چیــیە ئیحــزاری مەنقولــت بــکە
یــا بڵــێ ئەم داو و تەزویــرە لە بەر بــێ نــانییە
بــێخەبەر ڕەززاقــی عــالەم کەس نیــیە غەیرەزخــودا
ئیلتیجــای دەروێــش و ســۆفی ئیــشی ســەرگەردانییە
یــا خەلــیفە، لەم خــیلافە مەنعــی دەروێــشت بــکە
مــونتیجی تەکزیبــی شــەرعت خوســری جاویــدانییە
مەزرەعەی ئەهلی تەریقەت وشکە بێ ئەنهاری شەرع
مەســئەلە مەشــهورە قــاتی ئیــشی بــێ بــارانییە

خۆحەدیسە ئەولیا نابێ لە جاهیل هەڵکەوێ
چونکە ئەسراری ئیلاهی مەحرەمی حەمقانییە
نەک وەکو دەروێشی ئەم عەسرە کە ڕوکنی ئەعزەمی
ئیرتیکابی مەنهیات و ئارەزوی شەهوانییە
ڕووی درژ و مویی گرژ و خویی بەد بئس القرین
یعرف المجرم بسماهم خەتی پێشانییە
انما یخشی بخوێنە نەسی فەزڵی عالەمە
کافرە هەر کەس کە مونکیر ئایەتی قورئانییە
گەر بڵێی خەشیەت لە بازێ عالما دەس ناکەوێ
ڕاستە بێ خۆفی لەوا زیاتر لە بێ عیرفانییە
ئیعترافی تۆ سبووتی موددەعای من بوو کەچۆن
مەعریفەت هەرگیز لە کۆلکە شێخ و دەروێشانییە
گەر لە سەر ئەم ڕێگە بی ناگەی بە بازێ ئارەزوو
چونکە ئەم ڕێگە دیارە ڕاهی تورکستانییە
خۆم دەزانم مۆعیزەم تەئسیرێ نابەخشێ بەکەس
چونکە بێ قەدرە لە عالەم هەر شتێ مەججانییە
ئەی (کەریمی) باسی کۆتاکە، لەسەر مەتڵەب مەڕۆ
عاقیبەت عیجزاوەرە هەر مەبحەسێ تولانییە

## حسێن زاهیدی[1]

یەکێ لە ئەدیبانی شاری مەریوان کە خاوەنی دیوانێک شێعر بووە، بەڵام بێجگە لەم شێعرەی کە ساڵی ١٩٣۴ لە گۆڤاری «نمکدان» دا بڵاو بووەتەوە هیچ شێعرێکی تری دیار نیە.(زۆر هەوڵم دا و بە دوایدا گەڕام بەڵام بەداخەوە هیچ کەسێک نەبوو کە لەسەر ئەم شاعیرە زانیارییەکم پێ بدات).

١. شاعران کرد پارسی گوی، سەید عەبدولحەمیدحیرەت سەجادی، ل٣٧۴.

برفت فصل بهار و گذشت موسم عید
خموش بلبل شیدا زظلم وی گردید
ز برف بهمن گردید کوهسار سفید
ولی سیاهی غم در دل من است پدید
که نه گل است به گلشن و نه کس خریدارش

دلا به خاک مریوان بجای سبزه ی باغ
بهرطرف نگری نیست جز سیاهی زاغ
بیاض برف سفیدش شد از سواد کلاغ
چنانکه اسب نظامی بتن بگیرد داغ
تو سیم وار، ز یخها نگر زریوارش

رَوی اگر بمریوان و بگذری سویش
بغیر برف نبینی ز بر زن و کویش
اثر نیابی از سنگریزه در جویش
زبَس که ریخته یخ قطعه قطعه بر رویش
پدید نیست نه قلعه نه بام و دیوارش

در این دیار دل بی غمی اگر باشد
گمان مدار که از تودة بشر باشد
زغم پدر نه خبردار از پسر باشد
ز غصه «زاهد» بیچاره خون جگر باشد
که دوست هم نشود شادمان به دیدارش

## دوڕی مەریوانی[١]

لە کتێبی «شاعران کرد پارسی گوی»دا باس لەم شاعیرە «مەریوانی»یە ئەکرێت کە ئەم شێعرەی خوارەوەی لە گۆڤاری «نمکدان»دا بڵاو بۆتەوە و خودی شاعیر بۆ گۆڤارەکەی ناردوە.

١. هەمان سەرچاوە، ل ٣٢٥.

امشب از حسرت رویت به دو صد فکر و خیـال
دل زغم لـب بـه لـب و دیـده ز خـون مالامـال
بی تو شب نیست که بر من نشود خـواب حـرام
نالـه‌هـا بـر مـن دلخـسته حـلال اسـت حـلال
تـــو کـــه از حـــالِ دلِ ســـوختگانی غافـــل
به چه سـان میگـذرد هفتـه و روز و مـه و سـال
ثلث شب،اول شب، نیمـه ی شـب، آخـر شـب
میشود ایـن دل خـون گـشته زغـم حـال بحـال
جگرم خون و دلـم خـون و دوچـشمم پرخـون
سـینه ام خـــسته و بشکـــسته باميـــد وصـــال
حکـــم تقـــدیر چنـــین بـــود کـــه بُـــد روزِ اَزل
مـرغ دل زآتـش هجـر تـو بـسوزد پـر و بـال
خـــرّم آنـــروز کـــه از کـــوری چـــشم حاســـد
تـــو خرامـــی بـــه گلـــستان و منـــت از دنبـــال
دل غمدیـــــده کجـــــا طاقـــــت دوری دارد
زنده بودن به جهان بی تـو محـال اسـت محـال
رحمـــــت ایـــــزد و آه جگـــــر خـــــستهٔ مـــــن
مگـــر ایـــن شـــام فـــراق تـــو رسـاند بـــه زوال
ضربت خنجر عشقت به دل کیـست کـه نیـست
شـــاهد از عـــارض روی تـــو نمایـــان دو هـــلال
طیلـــسان نبـــی الله و یـــا پـــرده ی غیـــب
یـــا عماریـــست در آن نافـــهٔ مـــشکین خلخـــال
عـــشقبازان! حـــذر از فتنـــه ی ابـــروش کنیـــد
کـــه کـــسی را نکنـــد لـــشکر زلفـــش پامـــال
غربت و عاشقی و مفلـسی و هجـر بـس اسـت
چنـــد گـــویی ز ره طعنـــه بمـــا کیـــف الحـــال

قُمـــری روح پریـــد از غمـــت ای ســرو ســهی
ســوخت پروانــة دل ز آتــش آن شــمع جمــال
کرمـــی کـــن ز ســـرلطف و عطـــائی بنمـــا
تـــا بکـــی چـــشم بپوشـــی ز مـــن کـــج اقبـــال
لذت آنست که گـر وصـل تـوام ممکـن نیـست
جـان خـود را کـنم از شـوق بـه قربـان بـلال
منکـــرت کـــور شـــود تـــا کـــه نبینـــد رویـــت
دشـمنت شـل شـود از غـصه و بـدگویت لال
نکهـت مـشک کجـا و ادویـه ی آن سـر زلـف
نـرگس مـست کجـا گـردش آن چـشم غـزال
وه! لبـت غنچـه و رویـت گـل و مویـت سـنبل
جـــسدت جملـــه برازنـــده ی آن عـــارض آل
هر طـرف مـی نگـرم غیـر تـو محبـوبی نیـست
مـــن بقربـــان قـــد و قامتـــت ای تـــازه نهـــال
لال گـــــردم بزبـــان گـــر گـــذرد غیرتـــوام
کور بنـشینم اگـر جـز تـو گـزینم خـط و خـال
یـــار اگـــر لطـــف کنـــد جانـــب «درّی» نگـــرد
وه از این طـالع فیـروز و از ایـن جـاه و جـلال!

## وەهمی کوردستانی

وەهمی لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا لە مەریوان ژیاوە و یەکێ لە شاعیرانی ئەو سەردەمە بووە کە بە کوردی و فارسی شێعری هۆنیوەتەوە.[1]

ئەرێ هەی قیـــبلەکەی دیـــنم، ئەتـــۆ بڕوانـــە بتبیـــنم
کە مـــن مـــردم بـــکەی شـــینم، کە شـــینی تـــۆیە یاســـینم

١. تاریخ مشاهیر کرد، بابا مەردۆخ ڕۆحانی، بەرگی دووهەم، ل١٣٦.

مەکە ئیزهـــاری بێـــزاری هەتـــا ســـاتێ بە بێـــزاری
بـــێ ئیمکـــانی تەســـکینی دڵـــی بیمـــار و خەمگیـــنم
چناری قەددی تۆم دی، وا سووروشکم چاوەکم!بووبوو
بە جۆبـــاری چنـــاری چەم کە شـــایەد بێـــتە تەســـکینم
تەماشـــای چەنـــد شـــیرینە دەڵێـــی جەیـــرانە بیبیـــنە
ســـەراپا ئـــافەتی دیـــنەکە وا بـــردی دڵ و دیـــنم
مەداری فەخرە بۆ «وەهمی» وەکوو سەعوە، بەڵێ دائـم
گرفتـار چەنگـی بـازم مـن، ئەسـیری نـازی شـاهینم

## مامۆستا محەممەد عارف عەلامی

محەمـمەد عـارف عەلامـی، کـوڕی مەلا عەزیـز کـوڕی مەلا محەممەدی کوڕی مەلیك میرزا بەگـی «زەڕیـن کفـش»ە. سـاڵی ١٩١٤ی زایینی لە گونـدی ولەژێـر لە بنەمـاڵەیەکی ئـایینی چـاوی بەژیان هەڵێناوە. لە بنەڕەتدا بنەماڵەکەیان لە دوای دروسـت بـوونی شاری سنە لە لایەن ئەردەڵانییەکـانەوە، بەهـوی خزمـایەتی لە گەڵ ئەردەڵانییەکانـدا، بوونەتە کاربەدەست لە حکومەتدا، بەڵام بەهۆی چەند ناکۆکییەکی نـاوخۆوە، واز لە دەسەڵات دێنن و ڕوو لە مەریوان ئەکەن و چالاکانە لە بواری ئاییندا خـزمەت ئەکەن و تا دەگات بە مامۆستا عارف، هەر هەموویان مامۆستای ئایینی ئەبن.

سـەرەتای خوێنـدنی بە قورئـان و کتێـبە وردەکـانی ئەو سـەردەمەوە لە خزمەتـی باوکیدا دەست پێئەکات. بەڵام هەر لە سەرەتای نەوجەوانی ئەمدا، باوکی ماڵئاوایی لە ژیان ئەکات. وەك فەقێ بۆ خوێندن و زانـست ڕوو لە ناوچەکـانی تـری کوردسـتان ئەکات. لەسەر دەستی مامۆستا شێخ حسێنی نزارە ئیجازەی مامۆستایەتی وەرئەگرێـت و ئەگەڕێتەوە زێدەکەی خۆی (ولەژێر). لە سەر دەستی خوالێخۆشبوو شێخ عەلادینی نەقشبەندی ڕێبازی تەسەوف هەڵ ئەبژێرێـت. وەك موریـد و شـوێن کەوتـووی ئەو ڕێبازە تا دوا ڕۆژی ژیانی ئەمێنێتەوە. مامۆسـتا عـارف، عـارفێکی گەورە و زانـایەکی پـایە بەرز بـووە کە لە زۆر بـواردا بەناوبانـگ بـووە، بە تـایبەت: ڕوو خۆشـی، خەت

خۆشی، دەنگ خۆشی، چارەسەری نەخۆشی بە گژ و گیای خۆماڵی و شێعر هۆنینەوە. نازناوی شێعری «عەلامی» بۆ خۆی هەڵبژاردووە. ئەم زانا گەورەیە ساڵی ١٩٩٠ ماڵئاوایی لە ژیان ئەکات و گۆڕستانی گوندی «ولە ژێر» ئەبێ بە ماڵی هەتاهەتایی [١].

**بەرهەمەکانی بریتیە لە:**

١ـ تەڵقینی مردوو بە زمانی کوردی(لە مەهاباد لە چاپ دراوە). ٢ـ تەجویدی قورئان. ٣ـ مەناسیکی حەج. ۴ـ حەوت تەبەقی ئەرز و ئاسمان. ۵ـ تەفسیری چەند جزمێک لە قورئان.( لە شاری بەغداد مامۆستای ولەژێر لە گەڵ مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس بە یەک ئەگەن و باسی تەفسیری قورئان ئەکەن. کاتێک بۆیان دەر ئەکەوێت کە هەر دووکیان خەریکی تەفسیرن، مامۆستای ولەژێر واز لە تەفسیرەکەی خۆی دێنێت).

۶ـ دیوانێ شێعر کە ئامادەی چاپ و بڵاو بوونەوەیە.

**«شێعری مەلا عارفی ولەژێر بۆ مامۆستا مەحموودی سیاناو»**

| | |
|---|---|
| بەناوی خودای خالق مەوجودات | سڵاوات لە سەر ئەشرف مەخلوقات |
| مامۆسای بەڕێز خاوەنی عیرفان | بە وەزن سووک و بە قیمەت گران |
| عالم و عامڵ بە شەرع و قورئان | ئاشنا بە زات حەزرەتی یەزدان |
| بە گۆچانی عەون قادری مەننان | گۆی مەعریفەتت ڕفان لە مەیدان |
| خۆش بەخت و ئیقباڵ لە عالەم ئەزەل | لیس لحکم الا لە بدل |
| تەحیبە و سەلام حەزرەتی مەعبود | فَضلاً عَلَیكَ أَیُها المَحمود |
| شوکرانەی بەشێ خودا داویەپێت | ڕەحم کە بەوەی ئەپاڕێتۆ لێت |
| بەحری ڕەحمەتی حەق بێ کەنارە | زۆرتر شاملی حاڵ خەتاکارە |
| لەو بەحرە ئێوە دایم ئەنۆشن | دەی بۆ تینوێ وەک من تێکۆشن |
| چاکە لە گەڵ باش زۆر هونەرنییە | لە گەڵ بەدکاران جوان و مەردییە |

---

١. ئەم ژیاننامەیەم لە «کاک مەعروفی عەلامی» کچەزای مامۆستای ولەژێر وەرگرت کە جێگای ڕێز و پێزانینە.

ناوی : ١ـ کەلەپووری کوردی پەندی پێشینیان.٢ـ بازێ لە کەشف و کەرامەتەکانی

تکـــام ئەوەیە لە یـــادت نەچـــین نەکـا لە ناکـاو لە دەسـتت دەرچـین
شـایەد کـۆچ بـکەم لە دنیـای فـانی بە گونەهبـاری و حـاڵی ناکـامی
بەڵکـو خوداوەنـد بە ڕەحمـی عـامی حوســن خـاتیمە، دا بە عەلامـی

## مامۆستا محەممەد ئەمین عالی

کوڕی مەلا محەممەد سادق کوڕی مەلا محەمـەد ئەمین و «ڕابێعە» خاتوونە. ساڵی ١٩١٥ی زایینـی لە گونـدی «شـێخە کوێرە» چاوی بە ژیان هەڵێناوە.

لە سەردەمی منداڵیدا، باوکی ماڵ ئاوایی لە ژیان ئەکات و ئەرکـی بەخێـو کردنـی مەلا مەحیەدینـی بـرای و خـاتوو خۆرشیدی خوشکی ئەکەوێتە ئەستۆی مەلا محەممەدی برای گەورەیان.

خوێندنی لای براگەورەکەی دەست پێئەکـات و درێـژەی خوێـندنی لە خـزمەت مامۆستایان سەید بابە شێخی ئەڵمانە، حـاجی سـەید عابـدینی چـۆڕ و مامۆسـتا بـاقری بالکدا بووە. هەر لە بالک ئیجازەی مامۆستایەتی وەر ئەگرێت. بـۆ تێراوکردنـی بیـر و هزری لە کانیاوی زانست و فێربوونی زانستی ئەستێرە ناسـی و هەندەسـە و بیرکـاری ئەچێتە خزمەتی مامۆسـتا مەلا عەلـی حەمامیـان لە بۆکـان. لە دوای شـارەزا بـوون لەو زانستانەدا بـۆ دووهەمـین جـار ئیجـازەی مامۆسـتایەتی وەرئەگرێـت و بەرەو زێـدی خۆی، مەریوان، ئەگەڕێـتەوە. مـاوەی یانزەسـاڵ وەک وانەبێـژ و پێشنوێژ لە گونـدی نژمار ئەمێنێتەوە. لەسەر خواستی محەممەد خانی کانیساناني ئەڕواتە گونـدی کـانی سانان. ئەم مامۆستا زانا و بلیمەتە، ٣٥ ساڵ لەو گوندە ئەمێنێتەوە و کانی سـانان ئەبێـت بە مەکۆی زانست و عیرفان. زۆرێک لە مامۆستایان و زانایانی کـوردەواری لە بـاخی زانستی چێژ وەرئەگرن.

مامۆسـتای کـانی سـانان لە سـەر دەسـتی خوالێخۆشبوو شـێخ عەلائەدینـی بیـارە تەمەسووک وەرئەگرێت و ئەڕواتە سەر ڕێبازی نەقشبەندی.

ساڵی ١٩٧٩ بە هۆی شەڕی ناوخۆ و ئاڵۆزی ناوچەکە لە گەڵ پیری ڕێبازەکەی شێخ عوسمانی سێڕاجەددینی، هەواری ژیانی بۆ کوردستانی ئێراق ئەگوێزێتەوە و ماوەی ٢٢ساڵ لە سلێمانی و بیارە خزمەتی ئایین و زانست ئەکات. سەد مەخابن لەکۆتایی ژیانی‌دا تووشی نەخۆشی شەکرە و فەرامۆشکاری ئەبێت و ساڵی ٢٠٠١ ئەگەڕێتەوە مەریوان. دوای چوار مانگ بەربەرەکانی لە گەڵ ئەو نەخۆشیانەدا، ماڵئاوایی لە مزگەوت و حوجرە و کتێب ئەکات و گۆڕستانی گوندی «دوو ڕۆ» ئەبێت بە دوا هەواری ژیانی.

**ئەم مامۆستا زانایە لە بواری نوسیندا ئەم چالاکییانەی هەبووە:**

١ـ در رد وهابیت

٢ـ سەبارەت بە عیرفان و تەسەوف

٣ـ چەند وتارێک لە فیقهـ دا

## شێخ جەلال فارۆقی

ساڵی ١٩١٩ی زایینی لە گوندی «دەیمەیەو»چاوی بە ژیان هەڵێناوە. کوڕی عارف و خواناسی گەورە «شێخ عەبدوڵڵا» و لە بنەماڵەی فارۆقییەکانی دەیمەیەوە.

خوێندنی بە کتێبە سەرەتاییەکانی ئەوسەردەمەوە لە خزمەتی باوکیدا دەست پێئەکات. وەک نەریتی فەقێکانی کوردەواری بۆ فێربوون لە بوارەکانی زانستی ئەو سەردەمە، زۆر شوێن گەڕاوە و لە خزمەت زۆر کەسایەتی‌دا چۆکی فەقێیەتی داداوە، وەک: شێخ عەبدوڵڵای دەمەیەو، مەلامحەممەد ئەمینی پایگەلان، مەلا عەبدولعەزیم موجتەهید و مەلا عەبدوڵڵای گورجی سنەیی، مەلا ئەحمەدی وەیسە، مامۆستا سەید عارفی خورماڵ، مامۆستا شێخ حسێنی نزارە، مامۆستا سەید باوە شێخی ئەڵمانە، مامۆستا مەلاعەبدولکەریمی مودەڕیس. ساڵی ١٩٥٠ لە خزمەت مامۆستا سەید باوە شێخ ئەڵمانە ئیجازەی مامۆستایەتی وەرئەگرێت. پەنجا و دوو ساڵ وەک مامۆستای ئایینی و مودەڕیس لە گوندەکانی قەڵاجێ و نژمار خزمەتی کردووە.

ئەم مامۆستایە پەراوێزی لە سەر کتێب گەلی وەک: «جمع الجوامع» و گەلنبوی

بورهان نووسیوه و «فەلەکیات»ی شەرح کردووه. هەستی خۆی بە شێعر دەربڕیوە و تەخمیسی لە سەر شێعری حافز داناوه. کتێبی «ئادابی حەج»ی بە کوردی چاپ و بڵاو بۆتەوه. ئێستا بە هۆی پیری وازی لە مەلایی هێناوه و دانیشتووی «کانی دینار»ی مەریوانە.

### عەبدوڵڵا ئەقدەسی

یەکێ لەو کەڵە نووسەرە بێناوانەی کورد، میرزا عەبدوڵڵای ئەقدەسییە کە بیست و پێنجی مەی ساڵی ١٩١٩ی زایینی لە بناری کۆساڵان لە گوندی «ڕەزاو» لە بنەماڵەیەکی زانست پەروەر چاوی بە ژیان هەڵێناوه. باوکی فەتحوڵڵا ئاغا و دایکی زیبا خاتوون، لە بنەماڵەی خان بەیگییەکانی ڕەزاون. قۆناغی سەرەتایی لە قوتابخانەی گوندی ڕەزاو، کە یەکەم قوتابخانەی ناوچەی هەورامان بووه، لای «مدیرمەحموودخانی هونەر» دەست پێ ئەکات. بۆ درێژەدان بە خویندن ڕوو ئەکاتە شاری سنە و قۆناغی ناوەندی تەواو ئەکات. خوێندنی ئایینیش لە خزمەتی خوالێخۆشبوو «ئایەتوڵڵا مەردۆخ کوردستانی» و «مامۆستاخالیدی موفتی»دا بووه. بۆ درێژەدان بە خوێندن چووەتە قوتابخانەی سەربازی. لە کاتی هەڵگیرسانی شەڕی دووهەمی جیهانیدا واز لەو شوێنە دێنێت و دەست ئەداتە کاری ڕامیاری و پێوەندی دەگرێ بە «ژ.ک» و کۆماری کوردستانەوە و بۆ ماوەیەکیش ئەبێ بە شارەداری مەریوان و ...

میرزا عەبدوڵڵا پاش شەست و پێنج ساڵ ژیان، شەوی ٢٧ لە سەر ٢٨ مەی ١٩٨٦ دڵە گەورەکەی لە شاری سلێمانی لە لێدان ئەکەوێت و ئەبێ بە میوانی گردی سەیوان. لەم شاعیرە چەند دیوان شێعری دەسنووس بەجێماوە کە تا هەنووکە یەکێ لە بەرهەمەکانی بە ناوی «گوڵزاری مەریوان» بڵاو بۆتەوه. لە کتێبی «تاریخ سلاطین هەورامان»دا ئاماژەی پێکراوە کە درێژەی ئەم مێژوویەی قازی عەبدوڵڵای شەیدا، بە پێنووسی میرزا عەبدوڵڵای ئەقدەسی نووسراوه. مریەم خانی کچی میرزا عەبدوڵڵای ئەقدەسی بە تێروتەسەلی ئەوەی بۆ باس کردم و شاهیدی لە سەر ئەم ڕاستیەدا.

هەروەها سەبارەت بە بەرهەمەکانی تری ئەم نووسەرە، چەند کەسێکی ڕەزاوی

بۆیان باس کردم کە لە دوای شۆڕشی گەلانی ئێران لە ساڵی ١٩٧٩ دا میرزا عەبدوڵڵا زۆر کتێبی دەس نووسی خۆی و کتێبی بە نرخی تری بە ئامانەت لای پیرێژنێک دا نابوون. ئەو پیرێژنەش لە ئەشکەوتێکدا قایمیان ئەکات و لە دوای چەند ساڵ وا دەزانێ هەموویان قورئانن! ئەیخاتە ناو ڕۆباری گوندی ڕەزاو. بەم چەشنە دەس ڕەنجی ئەم نووسەرە ئەدرێ بەئاوا.

**مەلا محەممەد کۆماسی**

کوڕی شوکروڵڵا، ساڵی ١٩٢٠ی زایینی لە گوندی «مامۆڵە» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. پیاوێکی زانا و بیرمەند بووە. بۆ چێژ وەرگرتن لە کانیاوی زانست، زۆرێک لە حوجرەکانی کوردستانی ئێران و ئێراق گەڕاوە و دوای ئەوەی ئیجازەی مامۆستایەتی وەرگرتووە و تا کۆتایی ژیانی لە خزمەتی زانست و ئیسلامدا ماوەتەوە. دەوروبەری ساڵی ١٩٧٨ لە گوندی «وەنێنەی ژووروو» چرای ژیانی کوژاوەتەوە.

**سەعدوڵڵا خەدیری**

لە بەرە بەیانێکی ساڵی ١٩٢٣ی زایینی لەگوندی «هەجیج» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. باوکی سۆفی حەبیب و دایکی مینا بووە.

لە بەر بارودۆخی ژیانی ئەو سەردەمە، ئاوارەی ناوچەی ژاوەرۆ بوون و لە دێی «فەقێکان» ئەگیرسێنەوە. سەعدوڵڵا منداڵ بوو کرا بە قوتابی و لای «مەلا سەلاح» ناوێک، پاشان لای مەلا «محمد شریفی» پیتەکانی ناسی و یەک دوو جزمی قورئانی پیرۆزی خوێند. دوای دوو ساڵ غەریبی و ئاوارەیی ئەگەڕێنەوە هەجیج و لای مەلا «ئەحمەدی ئەنساری» قورئان خەتم ئەکات. پاشان لە پاوە و ئەنجا لە ئەسپەرێز هەندێ وردە کتێب و گوڵستان و بووستانی سەعدی ئەخوێنێت. دوای گەڕانەوەی بۆ هەجیج لای مەلا محەممەد ڕەشید پێشەکیی سەرف و نەحوو ئەخوێنێت و سەرکەوتوانە خەریکی خوێندن ئەبێت. بە داخەوە چارەنووسی ئەم فەقێیە جۆرێکیتر ئەگۆڕدرێت. ڕۆژێک شتێکی نەناسراو ئەدۆزێتەوە و هەڵی ئەگرێت و لە بەر خۆیەوە ئەڵێ ئەمە وەک پێنووس کەڵکی لێ وەرئەگرم! دوای دەسکاری کردنی ئەم چاشنی دینامیتە ئەتەقێتەوە و سێ پەنجەی دەستی چەپ و چاوی چەپیشی پێشکەش بە

بارەگای نووسین ئەکات. خەزان ڕوو لە داری خوێندنی ئەکات. دوای ماوەیەك دووری لە پێنووس و تێنووس، دەستەوئەژنۆیی وەلا ئەنێت و بۆ ڕەواندنی خەمەکانی ئەچێتە نێو دنیای شێعرەوە. بۆ یەکەم جار کەم ئەندام بوونی خۆی بە شێعرێکی فارسی ئەهۆنێتەوە.

بۆ بژێوی ژیانی دەس ئەکات بە کاروانچییەتی، تەنەکەسازی و باخەوانی. پاشان بۆ هەمیشە زێدەکەی خۆی «هەجیج» بە جێ دێڵێت و لە گوندی «کانی حسێن بەگ» نیشتەجێ ئەبێ.

بە درێژایی ئەم ژیانە قەڵەم و کاغەز و شێعر و نووسین هاوەڵی هەمیشەیی بووە. شێعرەکانی بە دوو زمانی فارسی و کوردی (هەورامی و سۆرانی) بە شێوازی کلاسیك لە قاڵبی مەسنەوی، قەسیدە، غەزەل و چوارینەدا هۆنیوەتەوە.

میرزا سەعدوڵڵا لە شێعری هەورامیدا زۆر سەرکەوتووە و ئەتوانین بڵێین لە شۆڕە سوارانی ئەم بەشەی ئەدەبی کوردی نزیك ئەبێتەوە. بەڵام ئەم سەرکەوتنەی لە شێعرە سۆرانییەکانیدا تا ڕادەیەك کەم ئەبێتەوە و لە شێعرە فارسیەکانیشدا کەمترە. بابەتی شێعرەکانی میرزا زۆربەیان ئەوینە و لە قالبی غەزەلدایە و بەشێکی تری بابەتی تەوس و پلار و گاڵتە و چەمەری و نیشتمان پەروەرییە.

ئێستا میرزا بێ چاویلکە ئەخوێنێتەوە، بەڵام گوێچکەی نابیستێ و لە ڕێگای نووسینەوە پێوەندی پێوە دەگرن. نازناوی «سەعد»ی لە شێعرەکانیدا بۆ خۆی هەڵبژاردووە. سەرجەمی شێعرەکانی بە هەوڵ و تێکۆشانی «جەمیل فارۆقی» ئامادەی چاپ و بڵاو کردنەوەیە.

**«خەستەخانە»**

ئازیز نە پەرسای حاڵی پەشێوم
هاوەختە کەگیان بەیۆ وەلێوم
تیری مەهجووریت جەرگم پارەکەرد
ئەرواح نەوەتەن تەن ئاوارە کەرد
پەردەی دڵ دڕیان ساکێش ورازۆ
بە تای زوڵفی تۆ بەخیە مەوازۆ

سـرۆمم عـارەق سـیمی خـاڵی تـۆن
بەنـدی شکەسـتەم بە دەسـماڵی تـۆن
تەختـی بەسـتەریم ئوتـاقی مەیلـت
ڕازیـم بە مەردەن گیـان بە توفەیلـت
خـاری هیجرانـت، تەزریقـی بـاڵم
بیمـاریم پەی تـۆن خەیلـیٚ وەشـحاڵم
دەرەجەی هـوونم وەفـاو مەیلـی تـۆن
ئەرمەیلـت نەبـۆ مـن هـوونم جە کـۆن؟
ئـازیز حەیـاتم قەیـدی وەفـاتەن
بـیٚ وەفـات، حەیـات پەی مـن مەمـاتەن
شـەربەتم، شیـشەی مینـای بـیٚ گەردت
کەرەم فەرمـاوای تـۆ بە مـن وەردت
خـۆ شـەربەت نیـیەن ئـاوی حەیـاتەن
سـەرچەمەی حەیـات نەپـای زوڵمـاتەن

## حەمە عەلی ڕەحیم پوور

حەمەعەلی کوڕی سۆفی ساڵحە و ساڵی ١٩٢٦ی زایینی لە گوندی «بلچە سوور»ی کۆماسیی مەریوان چاوی بە دیمەن و سروشتی جوانی کوردستان هەڵێناوە و نازناوی شێعری «خەم فرۆش»ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە. ئەم شاعیرە نەخوێندەوارە بۆ تەنیا ڕۆژێکیش لای هیچ مامۆستایەک وانەی نەخوێندووە و لەگەڵ دنیای پیتەکاندا نامۆ بووە. لە دوای کۆچی هاوسەرەکەی وەک ئەحمەد بەگی کۆماسی لە سەر گڵکۆی لەیلی دائەنیشیٚ و کانیاوی هەستی ئەجۆشێت و سۆز و پەژارەی بە شێعر و هۆنراوە دەرئەبڕێت و قوتابییەکانی بلچەسوور وشە ڕازاوەکانی خاڵۆی خەم فرۆش دەنووسنەوە. بەرهەمی ئەم شاعیرە لە ژێر ناوی «دیوانی خەم فرۆش» بە هەوڵ و تێکۆشانی مامۆستا یۆسف ڕەهنموون و دوو کاک مەحموود ناو لە فەوتان ڕزگاری ئەبێت و پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی ئەکرێت. لەم ماوەیەدا

کە خەریکی کۆکردنەوە و نووسینی ئەم بەرهەمە بووم(٢٠٠٧)بە داخێکی زۆرەوە خاڵۆی خەم فرۆش بار و بنەی پێچایەوە. ماڵئاوایی لە شێعر و ئەدەب کرد و نەمتوانی بە خزمەتی بگەیەم.

**مامۆستا عارف مودەڕیسی**

عارف مودەڕیسی، ساڵی ١٩٢٦ی زایینی لە گوندی «بالک» زێد و لانکەی عیرفان و زانستە ئایینیەکان لە بنەماڵەیەکی ئایینی و زانست پەروەر لە دایک بووە. هەر ئەو خانووە کە ئەستێرەی عیرفان و زانینی ئەو سەردەمە مامۆستا مەلا باقری مودەڕیسی کوردستانی تێدا بووە؛ دایکی خەدیجە خاتوونە کە بە ڕەچەڵەک ئەچنەوە سەر مۆسەننیفی چۆڕی. لە تەمەنی شەش ساڵیدا خوێندن لە قورئان و کتێبە سەرەتاییەکانی ئەو سەردەمە کە بریتی بوون لە سەرف و نەحوی عەرەبی لای باوکی و فەقێکانی باوکی دەست پێئەکات و لە درێژی خوێندنیدا لە خزمەت ئەم بەڕێزانەدا بیر و هزری بە تیشکی زانینیان زاخاو ئەدات:

مامۆستا مەلا باقری بالک، مامۆستا سەید عەتای چۆڕی، حاجی سەید بابا شێخی ئەڵمانە، مامۆستا مەلا مەحموودی جوانڕۆیی و مامۆستا شێخ حسێن، مامۆستا مەلاعەبدولکەریمی مودەڕیس، مامۆستا سەید عارف هانەسووری و ...

ئیجازەی مامۆستایی لە لایەن شێخ عەلائەددینی نەقشبەندی و شێخ عوسمانی کوڕیەوە بۆ ئەنووسرێت و دواتر مامۆستای بالک ئەو ئیجازەیەی پێ ئەدات. مامۆستا عارف وەک هەموو مامۆستایەکی ئایینی کورد بۆ پێش نوێژی و وانە گوتنەوە زۆر گوند و شاری کوردستان گەڕاوە. ناو براو لە بواری فەرهەنگیشدا هەوڵێکی یەکجار زۆری داوە و جێگای دەست و پەنجەی لە کتێبخانەی کوردیدا دیارییە.

باوکی ئەم قەڵەم بەدەستە لە سەردەمانی خۆیدا یەکێ بووە لە کەڵە زانایانی ناوچەکە و زۆر نووسراوە و پەرتووکی بە دیاری وەک دەسنووس لێ بەجێماوە، کە بە هەوڵ و تێکۆشانی مامۆستا عارف تا هەنووکە دوانزە بەرگیان چاپ بووە و شەش بەرگی دیکەیان ئامادەی چاپ کردووە، هەر وەها خۆیشی چوار پەرتووکی لە ژێر ناوی : ١ـ کەلەپووری کوردی پەندی پێشینیان.٢ـ بازێ لە کەشف و کەرامەتەکانی

باوک و باوەگەورەی.٣ـ ئیسباتی شەفاعەت بە نەسسی قورئان.٤ـ ڕێ و ڕەسمی ڕێخستنی مردوو بۆ گۆڕ، چاپ و بڵاو کردۆتەوە.

پەرتووکێ تریشی لە ژێر ناوی «ڕاز و نیاز» لە ژێر چاپدایە و کتێبێکی لە ژێر ناوی «ئیسبانی تەریقەت» کە نووسراوەی باوکییەتی لە عەرەبییەوە کردووە بە فارسی.

مامۆستا مەلا عارف لە دوای کۆچی هاوسەرەکەی مەریوانی بە جێ هێشتووە و نیشتەجێی شاری سنە بووە.

## شێخ حەمەمارف حەسەنی

شێخ حەمەمارف حەسەنی کوڕی «مامۆستا شێخ فەتاح» و خاتوو «ئامینێ»یە. ساڵی١٩٢٧ی زایینی لە گوندی «بەردەڕەشە»ی مەریوان چاوی بە ژیان هەڵێناوە. سەرەتای خوێندنی بە قورئان و کتێبە سەرەتاییەکانی ئەوسەردەمە لە خزمەتی باوکیدا دەس پێئەکات و بۆ چێژ بردن لە کانیاوی زانست، بیارە و کەرکووک و سلێمانی ئەگەڕێت. ماوەیەک لە خوێندن دوور ئەکەوێتەوە و دیسان هەست بە پێویستی فێر بوون و زانست هانی ئەدات کە چاکتر و دڵگەرم تر لە پێشوو خوێندن دەس پێبکاتەوە. ئەم جار ئەڕواتە خزمەت «مامۆستای کانی سانان» و دواتر لە شاری «پێنجوێن» ئەگیرسێتەوە و هەر لەو شارەدا ئیجازەی مامۆستایەتی پێ ئەدرێت. دوای گەڕانەوەی بۆ مەریوان، چەن ساڵێک مامۆستای مزگەوتی «بەردەڕەشە» ئەبێ و دواتر واز لە مامۆستایەتی دێنێت و پیشەی بەرگ دووری (خیاطی) دەس پێئەکات. دواتر لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی تاران وەک وەرگێڕی زمانی عەرەبی دائەمەزرێت و تا دەس پێکردنی شۆڕشی گەلانێ ئێران دژ بە ڕژێمی پاشایەتی ئەمێنێتەوە. دوای شۆڕش وەک مامۆستای کاتی (حق التدریس) لە قوتابخانە ناوەندییەکانی مەریواندا وانە ئەڵێتەوە. دوای تەواو بوونی ئەو ماوەیە ئەبێ بە مامۆستا و وانەبێژی شۆرای ڕۆحانییەتی شاری مەریوان.

مامۆستا شێخ حەمە مارف، لە بواری فەرهەنگ و ئەدەبدا یەکێ لە شاعیرانی پایەبەرزی مەریوانە کە زۆر شێعری هۆنیوەتەوە. بەڵام سەد مەخابن شێعرەکانی هێشتا لە لاپەڕەی دەفتەرە دەس نووسەکانیدا ڕەنگی هەتاویان نەبینیوە.

ماموستا پیاوێکی قسەخۆش و نوکتەزان بوو کە قسەخۆشەکانی ئێستاش شەوچەرەی مالان و بنێشتە خۆشەی سەر زاری خەڵکییە. ١ی جولای ساڵی ١٩٩٨ بزەی سەر لێوی کپ و دەفتەری قسەخۆشەکانی تەواو و چرای ژیانی کوژایەوە و گۆڕستانی گوندی «بەردەڕەشە» بوو بە هەواری حەوانەوەی.

**«خوا لامان دا لە کەر»**

مەرجانەی جادو بێ بە هاوسەرت — لباسی گۆنی بکەیتە بەرت
خەرجی خێزانێ کەوێتە سەرت — ناهومێد مابی لە دەشت و دەرت
بۆ شێوی شەوێ ئەم دەرو دەر بی
چاکترە لەوەی کە تووشی کەر بی

پیر بی تەمەنت بچیتە هەشتا — بووک بۆ چۆڕێ ئاو بچێ بە گژ تا
کوڕ بتکا بە شوان لە دەر و دەشتا — هەڵت خولێنن لە خۆشی و وەشتا
ئەویش بێ جێوڕێ، بێ ژورە سەربی
چاکترە لەوەی کە تووشی کەر بی

گەدایی و فەقر بتکا بە فاقە — لە قەرزا چەقیو تا بینە قاقە
خێزان بۆ کراس بتکا فەلاقە — دوو بڵێ شێتە و یەک بڵێ ساقە
کزو ناهومێد هەناسە سارد بی
چاکترە لەوەی کە تووشی کەر بی

سیل باریکت کا هەر وەکوو سووزن — بە گولی و ئیسقا بی بە ڕمووزن
بە فیتی فیتنە و درۆی درۆزن — شار بەدەرت کەن بەدار بت گۆزن
بەم حاڵە ئەگەر خاوەن نەزەر بی
چاکترە لەوەی کە تووشی کەر بی

دەرکی زیندانت لە سەر دابخرێ — بێ تاوان حوکمی کوشتنت بدرێ
تاقانە کوڕت بە لاوی بمرێ — ماڵ و سامانت بە تالان ببرێ
پێت ئەڵێم هەتا تۆ با خەبەر بی
چاکترە لەوەی کە تووشی کەر بی

## ماجد مەزهەر پوور (ئاوارە)

شێخ ماجد مەزهەر پوور کوڕی شێخ مەزهەری «گۆشخانی»یە. دایکی «پیرۆزە خاتوون» کچی سەید «تەها» لە ساداتی «سەوڵاوا»یە. ساڵی ١٩٢٧ی زایینی لە گوندی «گۆشخانی» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. چوار مانگ لە دوای تێپەڕ بوونی تەمەنی، لە بۆن و بەرامەی دایک بێ بەش ئەبێ و دایەگەوەی بە خێو کردنی وەئەستۆ ئەگرێ. لە تەمەنی هەژدەساڵیدا بە هۆی ناکۆکی خێزانییەوە، سەری خۆی هەڵ ئەگرێ و ڕوو لە ناوچەی «لەیلاخ» ئەکات. وەک مێرمنداڵێکی بێکەس و ئاوارە لە گوندی «سرینجانە» لە خزمەت مەلا محەممەد ناوێک خوێندنی قورئان و کتێبە وردەکانی ئەو سەردەمە دەست پێئەکات و دواتر ئەچێتە گوندی «میرەکی» و لای ماموستا محەممەد ئەمین درێژە بە خوێندن ئەدات. بە دوای عیلم و زانستدا ڕوو ئەکاتە وڵاتی ئێراق و لە شاری «هەڵەبجە» لە ماڵی «شێخ ئەحمەد» ناوێک ئەگیرسێتەوە و دوای سێ ساڵ مانەوە بە ئیشی «بەننایی و دارتاشی»یەوە خەریک ئەبێ و «ئایشێ خاتوونی» خوشکی «مەلا حەسەنی قازی» مارە ئەکات و لە بەر بێ منداڵی دوای شانزەساڵ ژیانی هاوبەش، لە یەک جیا ئەبنەوە. سەد مەخابن گشت شێعرەکانی تا ئەم سەردەمە لە هەڵەبجە لە ناو ئەچن و ساڵی ١٩٧۴ بەدەستی خاڵی بۆ ئێران ئەگەڕێتەوە و لە شاری سنە لە دایەری ئاو(اموراب) دائەمەزرێت. لە گەڵ ئامۆزایەکی خۆی بە نێوی «عوزرا خاتوون»ی کچی «شێخ عەبدوڵڵای نگل» ژیانی هاوبەش پێک دێنێت. شێخ ماجد لە وەرزی پاییزی ساڵی ٢٠٠٠ بە هۆی نەخۆشی وەستانی دڵ بۆ هەمیشە چاوی لە یەک دەنێ و لە شاری «سنە» بە خاک ئەسپەردە ئەکرێت.

شێخ ماجد حەزی لە شێعر و ئەدەبیات بووە و شێعری زۆری هۆنیوەتەوە کە بە داخەوە زۆریان فەوتاون و ئەویشی کە مابێ چاپ و بڵاو نەبووەتە و نازناوی «ئاوارە» و بڕێ جاریش «ماجید»ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە.

ئەزانم یەک جار کە زاتی یەزدان
پیاڵەی پڕ لەمەی خەییامی ڕژان

کـــردی بە گـــاڵە بە بـــێ چەن و چـــوون
نەفرینـــی ئەنـــارد بـــۆ چەرخـــی گەردوون
لە کوردســـتانا داد بەریـــن بـــۆ کـــێ؟
ڕەز و خـــاوەن ڕەز وەك یەك ئەســـووتێ
ئێمە گەر پـاك و گەر پیس و بەد خوێن
هەرچی هەیـن ڕاستی خۆ ئۆمەتی تۆین!
بـۆ چەرخـی ڕەحمـی گەردوون سـواوە؟
میللەتـــی کـــوردی لە بیـــر نەمـــاوە!

**«بۆ شۆخە کچێکی سەیدزادە بە نێوی «نابغە»ی هۆنیوەتەوە»**

نـــاڵەی دەردی دڵ بولبـــوڵ لە ســـەر چـــڵ
دیـــداری دڵـــبەر، چـــرکە چرکـــی دڵ
بـــادەی یـــاقووتی لە نـــاوی بلـــوور
تاســـەی دیـــداری یـــارانی زۆر دوور
غـــونچەی پـــشکوتوو لە ڕۆژی نەورۆز
مـــوژدەی ســـەربەرزی کـــامەرانی هـــۆز
هەواری خـــاڵی کە پـــڕ بـــێ لە گـــوڵ
سروشـــتی جـــوانە، شـــەکراوە بـــۆ دڵ
بەڵام نـــیم نیگـــای نـــابغەی دەوران
ئەمـــانەی هەمـــوو خـــستۆتە زینـــدان
وشـــەی ســـەر زاری دەنـــگە نەرمەکەی
شمـــشادی بـــاڵا و خـــوێنە گەرمەکەی
دوو شمـــشێر لە ســـەر هەردوو چـــاوەکەی
دوو مـــاری قەتـــران زوڵـــفە خـــاوەکەی
هەتـــاو لێـــی ئەدا بە شـــانەی شـــەماڵ
پەخـــشانی ئەکـــا بە جـــووت و بە تـــاڵ

پەلـــکە زێـــڕینەی ئاســـمانی بەهـــار
لە لای بـــازاڕی کـــزە بە یەک جـــار
دوو لێوی قەیتـان، ئـاڵ وەک پەڕەی گـوڵ
قـــرچە و بڵێـــسەی ئـــاگری ســـەر دڵ
دۆنـدان سـپی و ورد هەر وەکـوو کـافوور
مـــرواری ئاســـا لە نـــاوی بلـــوور
دوو لیمـــۆی شـــیرین لە ســـەری ســـینە
قـــوبەی مێحرابـــی ریجـــالی دیـــنە
دوو کـوڵمی ئـاڵی وەک میـنـای بـێ گەرد
دوو دەوای زامـــی دڵانـــی پـــڕدەرد
پەنـــجەی وەک قەڵەم سرووشـــتی جـوانی
پـــێ نووســـی دەســـتی زاتـــی یەزدانـــی
پـاژنەی خـڕ وێـنەی قـۆبەی سـەری ئـاو
خـــوێنی دڵـــداری بە ســـەرا ڕژاو
یەک گەردەنی بەرز جـوان و پـێ کەوتـوو
وەک یـاقوت لە نـاو ئـاوا نەسـرەوتوو
لە پەنـــجەی پێـــی‌دا هەتـــا تەوقـــی ســـەر
زەمـــان نەیـــدیوە تـــا ڕۆژی مەحـــشەر
«ماجیـــد»ئەزانـــم فکـــرت گـــۆڕاوە
نـــابغە تیـــری لە جەرگـــت داوە

## مامۆستا شێخ ئەحمەد فارۆقی (کەڵەیمی شاعیر)

شێخ ئەحمەد فارۆقی[١]، کـوڕی مەلا شێخ محەمـمەدی کـوڕی شێخ عەبدوڵڵای «دەیمەیەو »ییە و بە ناوی مامۆستا شێخ ئەحمەدی ئەحمەد ئاوا ناسراوە. ساڵی ١٩٢٨ی زایینی لە گونـدی «دەیـمەیەو»

١. ئەم زانیارییە «کاک عەبدوڵڵا »ی کوڕی مامۆستا پێیدام، کە جێگای ڕێز و پێزانینە.

چاوی بە ژیان هەڵێناوە.

کەڵەیم لەساڵی ١٩٨٢ دەستی کردووە بە خوێندنی ئایینی و لە پێناوی زانست و زانیاریدا تێکۆشاوە و لە زۆرێک لە شار و ناوچەکانی کوردستان ژیاوە، وەک: هەولێر، هەڵەبجە، کەرکوک، ڕەواندوز، سلێمانی، خۆشناو، پێنجوێن، دزەیی، مەریوان، قەراج، شاربازێڕ، ژاوەرۆ، شارەزوور، گاوەرۆ، هەورامان، کۆیە، سنە، مەنگوڕایەتی، شامیان، پشدەر، برادۆست، مەرگە و قەرەداغ و زۆر شوێنی تریش. تەمەنێکی زۆری لە خزمەت ئیسلامدا سەرف کردووە. لە ساڵی ١٩٥٦ لە سلێمانی لە لایەن حاجی مامۆستا مەلا مەعروفی خاوییەوە ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە و ڕێگای فەتوای شەرعی پێدراوە.

کەڵەیم بە فەرمانی مامۆستایانی ئایینی کراوە بە مودەڕیسی مزگەوتی «شێخ عەبدولکەریمی کوڕی شێخ عەبدولقادر» (شێخی تەریقەی قادری) لە گوندی «کرپچنە» لە ناوچەی سەنگاو لە لیوای کەرکوک. پاش ئەمە بووەتە مەلای گوندی «گرێزە»ی سەر بە ناحیەی سەیدسادق. پاش ئەمەش لە بەر ناباری باری ژیانی لە ساڵی ١٩٥٩ ناچار پەنای بردۆتە بەر کاربەدەستانی میری و بووەتە مووچەخۆری میری. لە ساڵی ١٩٨٨دا ئاوارەی ئێران بووەتەوە و ساڵی ١٩٩١ گەڕاوەتەوە کوردستانی ئێراق و کراوەتە قازی شەرعی هەڵەبجەی شەهید تا ساڵی ١٩٩٤.

**مامۆستاو بەرهەمەکانی:**

**-بە زمانی کوردی:**

١- کتێبی پێشهاتی مەرگ. ٢- ڕشتەی پێغەمبەر. ٣- دیوانی شێعر.

مامۆستا لە زۆر بابەتدا شێعری نووسیوە. بەداخەوە دوو بەرگی شێعرەکانی لە کاتی کیمیابارانی هەڵەبجەدا بەکتێبخانەکەیەوە و چەندەها نووسراوەی خۆیەوە سووتاون و ئێستاکە تەنها بەرگێکیان ماوە. کەڵێمی لە شێعرەکانیدا نازناوگەلی عەبداڵ و مەلای هەورامیشی بەکار هێناوە.

مامۆستای خواناس پاش بە سەر بردنی شەست وسێ ساڵ تەمەن لە ئێوارەی ڕۆژی ١٩٩٦/١٢/٩ لە ئەحمەدئاوای کوردستانی ئێراق کۆچی دوایی کردوە.

**«پاڕانەوە»**

ئەونە زۆرە چاکەیی تۆ ئەی بەتەنیای ئەی وەدوود
سەر بەسەر پۆشیوتە عالەم تاکو گاور هەم یەهوود
ڕەحمەت و چاکەت تەواوی دابەشە بۆ ماسیوا
چۆن لە ئێستا من ئەمێنم هەر لەجێدا بێ نەوا
یارمەتی هەرکەس ئەدەی تۆ پڕ بەرە مەیلت ببێ
بێ وتە کەیلی ئەکەی گەر ئارەزوو کەیفت ببێ
تۆ «کریم العفو»ی باری، خاوەنی لوتف و عەتا
من «کثیر الذنب» و گومڕا و بەدنەوا و پڕ خەتا
سەد درێغ لەم عومرە پوچەم وا لە دەم کەل ڕۆی بەساڵ
وا کە گرتی ڕێی بەتاڵی و وابوو ئیمڕۆ پایەماڵ
چەندە جار کردوومە تۆبە هەر لە سەر کرداری بەد
عاقیبەت یەک یەک شکاندم «یاکریم» و «یاسەمەد»
هەر بەزارە و باز ئەڵێمەو ئەی غفووری دادگەر
وەک نەسووحت یاوەرم بە چون ڕێگاکەم هەس خەتەر
هەققی گیانی پاکی «ئەحمد» خۆت بە «موختار» داوتە باز
تۆ پەنامدە ڕۆژی مەحشەر هەم بدە پێم ڕێی نیاز
تا ببم یارت وە یاکوو یاوەری یاری «سەدیق»
دوور لە غەیر بم، ڕێ گوزەرکەم تا بە قاپیت بم ڕەفیق
هەققی پاکی ساڵحانت تۆ بکە ئیرشادی من
لەم جیهان و پاشە ڕۆژیش تۆ بگە فریادی من
خۆ برینداره کە لاشەم ناگەمێ بێمە حوزوور
تۆ ببەخشە گشت گوناهم تا ببێ بۆم ڕێی عوبوور
داک و بابم هەروەهایە تۆ بە ڕەحمەت شاد بکە
لەو عەزابی پاشە ڕۆژە یەکسەری ئازاد بکە

کۆمەڵـــی ئەولادەکـــانم لەم جیهانـــەی پـــڕ زەبـــوون
دووریـــان خەیتـــۆ لە نەفـــس و نـــاڕەوایی هەردوو دوون
خـــۆم لە چـــاکە دوور بـــووم و بەس ئومێـــدم هەس بەگیـــان
تەربیـــــەت ئـــارا بکـــــەی بـــۆم ئـــال و بەیـــتم گـــشتیـــان
بـــۆ ڕەوشـــت و خـــووی شـــەفاگەر بـــۆ گەلـــی کـــۆڕی بەشـــەر
تا بـــزانـــن دڵ بە غـــیرەت بـــــۆ خـــودا بـــــن کارگـــــەر
مـــــن هیـــــوادارم بە لوتفـــــت «یـــــاکریم المـــــستعان»
هەققـــی شـــاهی (احمـــد)ی حەق، خـــاتمی پێغەمـــبەران
یەک بەیەک گـــشتیان نەواکە بـــۆ بەنـــدەیی وڕێـــگەی نیـــدا
بـــۆ دەری قـــاپی شوناســـیت ئەی کەریـــم و ئەی خـــودا
تـــانەکەونە تـــافی گێـــژاو هەم مەلالـــی ڕێـــی خەبـــیس
گیـــان و دڵیـــان تـــۆ پەنـــادە لەو هەمـــوو ڕێبـــازی پـــیس
یەک بەیەک گـــشتیان ڕەواکە بـــۆ دەری «خیـــر البـــشر»
هەم لە زنجیـــرەی کەرەمـــتا تـــۆ بـــــدە بەشیـــان کەرەم
چـــوونکە ســـوودی چاکەیـــان خـــۆ بـــۆ دەرون و شـــانی مـــن
هۆی نەجات و سوودە یەکسەر بـــۆ نـــزوولەی گیـــانی مـــن
وانەبـــێ مـــن قەتعـــی ڕەحـــم کردبـــێ، ئەی «ذوالجـــلال»
ئەمـــرە داوا، بـــۆ ئیجـــابەیـــش واتەتە ئـــایەی کەمـــال
«حافیا» ڕۆژی دوسەد جار بـــۆ «کەڵەیـــم» حەق هـــەس تەواو
بـــۆت بنێـــرێ ڕەحمەتـــی پـــاک چـــون وتـــارت هـــاتە نـــاو

## دوکتور عەبدوڵڵا

ناسراو بە مەلا عەبدوڵڵای میانە، کـوڕی وەسـا ڕەسـووڵی نەجـاڕ، سـاڵی١٩٢٩ی زایینـی لە گونـدی «میـانە» چـاوی بە ژیـان هەڵێنـاوە. لە زانکـۆی «الازهـر»ی میـسر بەکالۆریۆس وەرئەگرێت. خولیای زانین و فێر بوون بەرەو وڵاتی ئاڵمان ئەیبات و لە زانـستگای «ئاپـل» ئەگیرسـێتەوە و سـاڵی ١٩٧٥ لە ڕشـتەی زمانناسـەیدا بڕوانـامەی

دوکتۆرا وەرئەگرێت. هەر لەو زانستگایەدا ماوەی هەژدەساڵ وەک مامۆستا ئەمێنێتەوە و ئەبێ بە ئەندامی کۆڕی زانستیی زانستگا و بە «پرۆفیسۆری کورد» ئەناسرێت. دیسان پلەیەکی تری زانست ئەبڕێت و دوکتورای دووهەمی لە فەلسەفەدا وەرئەگرێت.

دوای ئەوەی خانەنشین ئەبێ، هەلی بۆ ئەڕەخسێ و چەندین کتێب، کە یەکێکیان سەبارەت بە مافی مرۆڤ و ژیانی خۆی و کوردەوارییە ئەنووسێت. پرۆفیسۆرێکی! ئاڵمانی لێی ئەدزێت و بەناوی خۆیەوە لە چاپی ئەدات. دوای شەست ساڵ غەریبی و دووری، خۆشەویستی نیشتمان هانی ئەدات کە بگەڕێتەوە، بەڵام بەو ئاواتە ناگات و ساڵی ٢٠٠٣ بە هۆی نەخۆشی دڵەوە چرای ژیانی ئەکوژێتەوە.

**سەید محەممەد موسەننیفی**

شەوی داگیر کردنی گوندی دزڵی لە لایەن دەوڵەتی ناوەندیی ئێران و دەرکردنی مەحموود خانی دزڵی، ساڵی ١٩٢٩ ی زایینی لەگوندی «چۆڕ» مەڵبەندی زانایان و زانست پەروەران چاوی بەژیان هەڵێناوە. باوکی سەید مەحموود و دایکی خاتوو زوبەیدەی کچی خواناسی گەورە «باوەڕەحمانی چۆڕە[1]» کە لە بنەماڵەی سەیدەکانی «چۆڕ»ی مەریوانن.

سەرەتای خوێندنی بە قورئانی پیرۆز و وردە کتێبەکانی ئەو سەردەمەوە دەست پێ ئەکات و بۆ پەرەپێدان بەزانست و پاراوکردنی بیر و هزری لە کانیاوی زانین زۆر گوند و شاری ئەم کوردستانە زاناخێزە گەڕاوە و لە خزمەتی ئەم مامۆستایانەدا چۆکی فەقێیەتی داداوە و وانەی ئایینی و خواناسی و نەتەوە دۆستی خوێندووە: مەلامحەممەد حەیدەری چۆڕی، مەلا مەحیەددینی شێخەکوێرە، مامۆستا و زانای گەورە مەلا محەممەد ئەمینی عالی، مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و مامۆستا محەممەد بەهاددین لە بیارە، مامۆستا سەید عارفی چۆڕی لە خورماڵ، ئاغا حیسامی موجتەهیدی لە سنە، حاجی سەید بابە شێخ و مامۆستا شێخ حسێنی ئەڵمانە، مامۆستا سەعیدی

١. یەکێ لە خواناسانی گەورە و پیاو ماقوڵانی چۆڕ بووە. لە دەوروبەری ساڵی ١٩٥١دا، ماڵئاوایی لە ژیان کردووە.

لهۆنی، مامۆستا سەید عەتای چۆڕی، مامۆستا مەحموودی سیاناو، مەلا محەممەدی کۆماسی، مامۆستا باقری بالک و... دواتر لەسەر دەستی مامۆستای کانیسانان ئیجازەی مامۆستایەتی پێئەدرێت و بۆ خزمەت لە بواری ئاییندا ئەچێتە گوندەکانی: «هەڵووژان» و « زەکریان»، تا ئەوەی لە گوندی «کانیسپیکە» ئەگیرسێتەوە و ژیانی مامۆستایەتی مزگەوت لەم گوندەدا تەواو ئەکات. ئێستاش دانیشتووی مەریوانە.

ئەم پیاوە نوکتەزان و قسەخۆشە سەردەمانێکی زۆرە هەوڵێکی چڕو پڕی خستۆتە گەڕ بۆ دۆزینەوە و لە چاپ دانی نووسراوەکانی فیلسووف و خواناس پایەبەرزی کورد «مەلا ئەبووبەکری موسەننیفی چۆڕی». لە تێکۆشان لەم بوارەدا نەسرەوتووە و توانیویەتی بڕێکیان بە ئەنجام بگەیەنێت و ڕچەی بڕێکی تریان هەڵبکات. ژیان و شێعر و قسە خۆشەکانی ئەم مامۆستایە لە کتێبێکدا بە نێوی «ئاردە بەرە» چاپ و بڵاوبۆتەوە.

خوایە ئەزانم جێگات بێ جێیە ئاخۆ دەمزانی جێگای تۆ کوێیە؟!

نەمدیوە هیچ کەس وەکوو تۆ وابێ خاوەن دنیا بێ خۆی بێ جێگا بێ!!

## شێخ ڕەشید حسێنی

شێخ ڕەشید حسێنی، کوڕی بابا تایەر، شاعیر و چالاکی فەرهەنگی، لە زمانی خۆیەوە بناسین: « ساڵی ١٩٣١ی زایینی لە گوندی «دۆڵاش» چاوم بە ژیان هەڵێناوە. هێشتا کۆرپەیەک بووم لە باوەشی دایکمدا، باوکم لە ئێران هەڵات. لە سەردەمی دەسەڵاتی مەلیک غازیدا چوینەتە پێنجوێن. هەر لەوێ خوێندنی سەرەتاییم لە قوتابخانەیەکدا کە شەست تا حەفتا قوتابی لێ بوو و بە سێ زمانی کوردی، ئینگلیزی و عەرەبی دەرسمان ئەخوێند. تا تەواو کردنی پۆلی شەشەمی سەرتایی هەموو ساڵێ بە پلەی یەکەمەوە دەر ئەچووم، لە پێنجوێن مابنەوە. دوای ئازاد بوونی بەگزادەکان لە زیندانی ڕەزا شا، باوکم بۆ بەخێرهاتنەوەیان هات بۆ مەریوان و دواتریش ڕۆیشتبوو بۆ سنە، هەر لە سنە دەسگیر و بێ سەروشوێنیان کرد. باری نالەباری ژیان تەنگی پێهەڵچنین. منیش ناچار بووم واز

لە خوێندن بێنم. لە پێنجوێن وەک نووسەری دوکانداریێک بە مانگانەی پێنج یان شەش دینارەوە کارم ئەکرد. ڕۆژێ «شێخ لەتیفی کوڕی شێخ مەحموود» کە یەکێ لە دۆستانی باوکم بوو، بەڕێکەوت هات بۆ پێنجوێن و شێوەی ژیانمی بینی. لە گەڵ خۆی بردمی بۆ ماڵی خۆیان لە سلێمانی. بە هۆی مەعروف جاوگ کە ئاشنایان بوو لە شارەداری سلێمانی وەک موراقب دامەزرام. ساڵی ١٩٤٦ بوومەلەرزە شاری پێنجوێنی وێرانکرد. دەوڵەت بە تێکرا شاری چۆڵ کرد و ماڵی ئێمەش ڕۆیشتە سلێمانی و من هەر لە شارەداری مامەوە. تەمەنم کە گەیشتە شازدە ساڵ کەوتمە نێو کاروباری سیاسییەوە.

ڕۆژێک توشی هاوڕێیەکم بوم، وتی ڕەشید حکوومەتی کورد لە مەهاباد دامەزراوە، چەند کەس لێرە حیزبێکمان پێک هیناوە بە نێوی «پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێراق»، پێمان خۆشە تۆیش ببی بە ئەندامی ئەو پارتە. ئەو کاتە بارزانی لە مەهاباد بوو، منیش قبوولم کرد. لە کۆبوونەوەیەکدا بڕیار درا کتێبخانەیەک دانرێ بۆ ئەندامەکان. من کرام بە بەرپرس، ناومان لێنا کتێبخانەی ڕووناکی سلێمانی. خەڵک مانگانەیان ئەدا بەکتێبخانە و حیزب. منیش بە سەرکتێبخانەکەوە بووم. زۆرکەس وەک حەمە ساڵح دیلان، حەمەی ئەحمەدی تاھا، کامران موکری، ڕەئوف مەعرووف خاوەنی کتێبخانەی گەلاوێژ لە سلێمانی، محەڕەم محەممەد ئەمینی چیرۆک نووس، نوری شاوەیس ... سەردانی کتێبخانەکەیان ئەکرد و یارمەتیان ئەدا. دوای تێکشانی کۆماری کوردستان لە مەهاباد، حکوومەت هاتە سەرکتێبخانەکە و فەرمانی داخستنیان پێدام، وتم ئەمە هۆی بژیومە، کابرایەک بە نێوی معاون مەزهەر کە کوردێکی خەڵکی سلێمانی بوو، وتی ئەبێ دایبخەی! منیش دام نەخست. ئەیان گرتم دوو ڕۆژ سێ ڕۆژ بەند ئەکرام، دوایی ئازادیان ئەکردم. تا بەهاری ساڵی دوایی گیرام و وتیان ئەبێ زامنیک بێنی و لە سلێمانی نەمێنی و بڕۆی. خوا عەفوی کا مەلا عەبدوڵای تووتنچی لە سلێمانی بوو بەزامنم.

هاتمەوە بۆ پێنجوێن و دوای ماوەیەک برێ لە هاوڕێکانم گیران. هەواڵیان دامێ منیش ئەگیرێم. ئیتر هاتمەوە بۆ مەریوان. لێرەیش وازم نەهێنا. تاکوو ساڵی ١٩٥٣ و لە سەردەمی دوکتور موسەددیق هاتن ماڵەکەمیان پشکاند و برێ کتێبی کوردی و ڕۆژنامەی کوردیم بوو، بردیان. شێخ حەمە مارف و مەلامحەمەد جوانڕۆی و

شـارەزای ڕەوتـی تـازە و گۆڕانکارییەکـانی دنیـای ئەدەبیـات ئەبێـت. چـاوە شێخەلئیسلامی هاوڕێ لە گەڵ سوارەی ئیلخانی زادە و عەلی حەسەنیانی هەوەڵین هەنگاوەکانی بزاڤی نوێکردنەوەی شێعری کوردی لە کوردستانی ئێران هەڵدەگرن. دواتـر ئەبـێ بە مامۆسـتا لە قوتابخانەکـانی شـاری مەریـوان و دوای چەنـد سـاڵ مامۆستایەتی دیسانەوە دەستبەسەر ئەکرێت ـ تا بێ بەش کردنی لە مافی کۆمەڵایەتی ـ لە زیندانی «قەسری قەجەر»ی تاران ئەیهێڵنەوە. پاش ئازاد بـوونی لە زینـدان، بە دەس فرۆشی لە گوندەکانی ناوچەی مەریـوان بژێـوی ژیـانی خـۆی دابین ئەکـات. دوای شۆڕشـی گەلانـی ئێـران ئەبـرێتەوە سـەر کـار و دواتـریش لە سـەرکار لائەبرێـت و بەیەکجاری مەریوان بە جێدەهێڵت. چاوە لە ساڵی١٩٧٩وە لە وڵاتی سوید ئەژیت.

**«ئاسمان دوور و زەوی سەخت»**

لە ڕواڵەتێکی خەشیما نەزیرەی چ نابینێ
لە عەسرێکا
کە دێوی زاڵی عیلمی بەشەر مێشی مانگ ئەقاپێنێ
لە ڕواڵەتێکی خەشیما نەزیرەی چ نابینێ
لە کاتێکا
هەر دوو دەسی هەتاکوو ئەنیشکی لە قوڕ ناوە
نەک بۆ کار
نەک بۆ قوڕ شێلان
بەڵکوو بە ڕەمزی
تەمێ و پەشیمانی
پەشیمانی
لەوان مەجالان
وابەرد و ئاسنی شێلا و
خەنجەری خوڵقاند
بۆ دەستی ئەو کەسانە
کە دەستی پێ ئەنێنە سەر سینە

**«نیشتمان و بەهار»**

نیـشتمان وەرزی بەهـارە و کـاتی چـوون بـۆ شـاختە
کـــاتی ســــەیرانی گـــوڵاڵە و لالەزاری بــــاختە

کاتی هەڵپەڕکـێ و سـەمایە بـۆ هەرزەکـار و کیـژ و لاو
کــاتی ســەیری قەڵــبەزی بەفــراوی شـاخ و داخــتە

بــۆی خۆشــتر، گەر لە بــۆنی عەتــری پاریــست ئەوێ
بــۆی وەنەشـــە و نەرگــس و لولــوپەڕ و گوڵبــاختە

نیـــشتمان لەنـــدەن بە قوربـــانی نەســـیمی بەر بەیـــان
خـــانە بــــاخی ژاوەرۆ، قەســـر و تەلار و کــــاختە

مەعـــدەن و کـــانی دەرامەد بـــۆ هەژار و بـــێ نەوا
پیچـــک و قەنـــر و مەنە و رێواســـی کوێـــستانانتە

دەنگــی مۆسـیقای پیـانۆ یـا کەمـانچە و عـود و تـار
دەنگـــی بلـــوێر و نەوای شمـــشاڵی دەســـتی شـــوانتە

بــۆ نیگــاداری ســنوورت لاوەکانــت وەک پڵنــگ
وان لە مەیـــدانی خەباتـــا و کـــۆچەکەی قوربـــانتە

نیـشتمان بـۆ قەومـی کـورد تـاکوو لە خەو ڕابچڵەکـێ
شـێعر و پەخـشان و وتەی خەمگـین دەوا و دەرمـانتە

## مەلا کەریم سەردۆش (پەژار)

مەلا کەریم مەکی پوور، کوڕی محەممەد عەزیـز، مـانگی ئۆکتۆبری ساڵی ١٩٣٢ی زایینی لە بنەماڵەیەکی ئایینی و هەژار لە گونـدی «سـەردۆش» چـاوی بە ژیـان هەڵێنـاوە. مامۆسـتا پیـاوێکی بـوێر و نیـشتمان پەروەر و شـاعیرێکی توانـا بـووە. نازنـاوی «پەژار»ی بـۆ خـۆی هەڵبـژاردووە. سـەد مەخـابن شێعرەکانی وەک شـێعری زۆربەی شـاعیرانی کـورد بە هـۆی

بارودۆخی ناوچە و دەربەدەری و شەڕ و کۆچاوکۆچ کردن فەوتاون. ساڵی ۱۹۸۸ی زایینی بە هۆی تۆپبارانی گوندی «سەردۆش» لە لایەن ڕژێمی سەدام حسێنەوە، چرای ژینی ئەکوژێتەوە.

**«پەژار و مەریوان»**[1]

مەریـــوان تـــۆ هەرێمـــی گـــوڵ عـــوزاری
مەقـــامی پـــڕ ئەدیبـــی ڕۆزگـــاری

بەدیـــمەن وەک بەهەشـــتی ســـەر زەمینـــی
هەمـــوو فەســـڵێ ئەڵێـــی فەســـڵی بەهـــاری

زرێبـــارت وەکـــوو کەوســـەر وەهـــایە
گزنگـــی خـــۆر کە هەڵ دێـــتە دیـــاری

لە قەلبـــی مێـــژوو نووســـدا بـــوی بە عوقـــدە
کە چەن قەرنە بە خۆشـــی پـــایەداری

ڕەقیبـــت شـــاهیدی حـــاڵە مەریـــوان
جینـــانی حۆریـــانی چـــاو خومـــاری

گـــوڵاڵەی زەرد و ســـووری تـــۆیە شـــەونم
وەکـــوو مەرجـــان دڵـــۆپ ئەتکـــێ لە زاری

بە شـــیرینی ڕەوشـــتی پیاوەکانـــت
لە عالەمـــدا نگینـــی یادگـــاری

تەمەددون یـــا ســـەقافە ئیرســـی تـــۆیە
لە ڕۆژێکـــۆ کە هەیتـــوو نامـــداری

پـــڕە ســـینەت لە زانـــستی بە نـــاو بانـــگ
وەکـــوو «چـــۆڕی» وەیـــان وەک چەشـــنی

بە گـــۆڕی کـــابلا دیـــارە مەریـــوان
کە تـــۆ جـــێگەی لە بـــۆ قـــوتبی مەداری

---

۱. ئەم شێعرە کاک «عەبدوڵڵای نیازی باشماخی» دەسی خستم کە جێگای ڕێز و پێزانینە.

دوورڕۆ ئیجازەی ماموستایەتی وەرئەگرێت. ماوەی ١٣ساڵ وەک وانەبێژ لە قوتابخانەی دوورڕۆ خزمەت بە ئایین ئەکات و لەبەر زانایی و لێهاتوویی لە زانست و وانەوتنەوەدا بە «مودرِیسی دوورڕۆ» ئەناسرێت. جێگای وەبیر هێنانەوەیە پێش چوونی بۆ دوورڕۆ بە هۆی بیری نەتەوایەتیەوە، لە لایەن ڕژێمی پاشایەتییەوە ماوەیەک قاچاخ ئەبێت.

مودەڕیسی دوورڕۆ، ساڵی ١٩٧٨ لە بەر باری ئاڵۆزی ناوچەکە، لە گەڵ پیری ڕێبازەکەی «شێخ عوسمانی سێڕاجەددینی» هەواری ژیان بۆ کوردستانی ئێراق ئەگوێزێتەوە و دوای ماوەیەک مانەوە لە بیارە، لە مزگەوتی مەولانا خالیدی شارۆچکەی سەید سادق وەک پێش نوێژ و وانەبێژ خزمەت دەکات. دواتر ئەڕواتە مزگەوتی حاجی عەلی بەگ لە سلێمانی. لە دوای دەستپێکردنی ڕاپەڕینە گشتییەکە دژ بە دەسەڵاتی بەعس، بۆ زێدەکەی خۆی مەریوان ئەگەڕێتەوە. لەو سەردەمەوە پێش نوێژ و وانەبێژی مزگەوتی گوندی «نگڵ»ە. ئەم ماموستایە لە هەر مزگەوت و شوێنێکدا، قوتابخانەیەکی ئایینی ڕازاندۆتەوە و زۆر ماموستا و زانای پایە بەرزی پێگەیاندووە. ئەم لە نووسینی شێعردا دەستێکی توانای هەیە. خاوەنی چوار کۆمەڵە شێعرە، بە دوو زمانی کوردی و فارسی و بە شێوەی کلاسیک لە بابەتگەلی ئایینی، کۆمەلایەتی و منداڵان.

### «ئەی مناڵە کاڵەکان»

ئەی مناڵە کاڵەکان — نگینی ناو ماڵەکان
بێ تۆکڵ و بێ کینەن — جێ نشینی ئەم چینەن
دڵپاک و بێ تەماعن — نەمامی تازەی باخن
ئێوەن هیوای ئەم گەلە — کە پێ بگەن بە پەلە
ئێوەن هیوای ئەم چینە — باخی ئەم سەر زەمینە
دایکی دڵسۆزی ئێوە — کە دڵ قایم وەک کێوە
بە لای لایەو گۆرانی — بە شیری پاک و جوانی
ئێوەی بە مێهرەبانی — پەروەردەکرد بە جوانی

ئەمجا خستنیە مەکتەب — بۆ کەسبی عیلم و ئەدەب
چوونە ژێر دەرس موعەللیم — لە بۆ تەربیەو تەعلیم
بەشکم شتێ فێر ببن — لە نەزانی دەربچن
ئێوەش خۆت و غیرەتتان — تەلاش بکەن بێ وچان
ڕەنجی دایکی مێهرەبان — مەخەنە ناو ئەشغاڵدان
ڕۆشن کەنۆ وجاخی — ببن بە گوڵی باخی
ڕەنجی بە هەدەر مەدەن — گوڵی هیوای سیس مەکەن
بەڵکوو نەمرن پێ بگەن — لەم دنیایە تێ بگەن
هەرگیز نەخڵەتێن بۆکەس — ناموس بەرنەدەن لە دەس
یەک دڵ و یەک جەهەت بن — خاوەنی بەسیرەت بن
ئەخلاق لە دەس بەرنەدەن — بە ئەدەب ڕەفتار بکەن
دوور بن لە دوودی تریاق — لە سۆحبەتی بەد ئەخلاق
خۆتان پارێزن لە شەڕ — لە شەڕ خۆتان بکەن کەڕ
سەعی بکەن تا بەهار — شەویش بکەن بە نەهار
ئەوەی دەرستان پێ ئێژێ — خراپتان پێ نایەژێ
ئێوە فێر خوێندن ئەکا — لە جەهل دەرتان ئەکا
لە قسەیان دەر مەچن — ئیحترامیان ڕابگرن
بە ئەدەب بن لە گەڵیان — قیام بکەن لە بەریان
کە هاتنە دەشتەوە — لە بیرتان نەچێتەوە
موعەللیم گەورەتانە — وەکوو تاجی سەرتانە
ئەدەب بۆ خۆتان خاسە — دەستان نانێتە کاسە
بێ ئەدەب بەشخوراوە — بە سووک ناوی براوە
ئاخر وەسیەتم وایە — ئێژم دنیا کا و بایە
گشت ئومێد و هیوایە — هەمووی بە دەس خوایە
دەس لە خوا بەرمەدەن — ئیتاعەی ئەمری بکەن
لە گەڵ ئەوا ئەخوێنن — فەرمانی بە جێ بێنن
زانینێ سوودی هەیە — بۆندار بە وێنەی بەیە...

ئەسپی تەبعی من بە بن داری خەمۆ بەسراوەتۆ
وەرنە ڕۆژێ سەد دەر و دەشت و بیابان تەی ئەکا
گەر «شەپۆل»ی بێ نەوا جارێ لە باخت ڕێی کەوێ
یا دزی یەک دانە سێو، یا دزی دوو بەی ئەکا

## سەید ڕەئووف حسێنی

کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٣٣ی زایینی لە گوندی «نوێن» چاوی بە ژیان هەڵێناوە.

خوێندنی بە ئایەتەکانی قورئانەوە لە خزمەتی باوکیدا دەست پێئەکات. هەر لە منداڵیدا بە تامەزرۆیی بۆ فێربوون شار بەشار و گوند بە گوند لە باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان هەگبەی زانستی خۆی ڕەنگاوڕەنگ دەکات.

ساڵی ١٩٥٩ ژیانی هاوبەش پێک دێنێت. بۆ بژێوی ژیانی خۆی و ماڵی باوکی زۆر کوێرەوەری و ناسۆر ئەچێژێت.

هەژاری و دەربەدەری بەرەو پانتای شێعر هانی ئەدات. خەم و پەژارە و ئاوارەیی خۆی بە شێوەی هۆنراوە دەرئەبڕێت. لە ساڵی ١٩٥٩ بە دواوە، سەید رەئووف بە پێی بارودۆخی کورد لە ئاوارەیی و سەر لێ شێواوی کورد لە کوردستانی ئێراق و ستەم و سەرەڕۆیی میرەکانی ئێراق بە شێعر دواوە. بابەتگەلی جیاجیا وەک: کۆمەلایەتی، ئایینی، نیشتمانی و هتد... بوونەتە هەوێنی هۆنراوەکانی.

ئەم شاعیرە لە حوجرە و قوتابخانەکەی مامۆستا نامی و فاتحی کوڕیدا چۆکی فێربوونی داداوە. مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس زۆر کتێبی خۆی بە دیاری پێ بەخشیوە.

ناو براو لە ساڵی ١٩٦٠ بە دواوە لە گەڵ مامۆستا عەلایەددین سەجادیشدا پێوەندییەکی دۆستانە و شاعیرانەی هەبووە.(ئەگەرچی لە سەر ڕەچەڵکیان کێشە لە نێوانیاندا درووست ئەبێ) ئەم بەڕێزە لە ساڵی ١٩٧٧ەوە لە گەڵ مامۆستا محەممەد ئەمین کاردۆخیدا هاتوچۆوی گەرمی هەبووە. یارمەتی چاکی کاردۆخی داوە بۆ کۆکردنەوە و نووسینی دیوانی سەیدی هەورامی. بڕیاریش بووە کە خوالێخۆشبوو

کاردۆخی دیوانی مامۆستا سەید ڕەئووفیش کۆبکاتەوە کە ئەجەل مەودای پێ نادات.
مامۆستا ڕەئووف خولیای نووسینی مێژووی ناوداران و پیاو ماقووڵانی کوردە و لە دەهەزار بەیت شێعردا ئەو حەزەی خۆی دەربڕیوە. دیوانێ شێعریشی لە ژێر ناوی «بەهەشتی هەورامان» چاپ و بڵاو کردۆتەوە.
مامۆستا ڕەئووف ئەگەرچی خۆی بێ منداڵە بەڵام زۆر منداڵی هەتیوو بێ کەسی پێگەیاندوە. ئێستاکە مامۆستای ئایینی مزگەوتی گوندی «هوویە»یە و ژیانی ئاسایی و شاعیرانەی خۆی لە گەڵ هاوسەرەکەیدا تێپەڕ ئەکات.

## محەممەد مەعرووفی

محەممەد کوڕی شێخ جەمیل کوڕی شێخ مەعرووفە کە بە ڕەچەڵەک ئەگەنەوە بە شێخەکانی دەگاشێخان و دایکی ناوی فاتمە خاتوونە. ساڵی ١٩٣٣ی زایینی لە بنەماڵەیەکی ئایینی لە گوندی «باقلاوا»ی کەلاتەرزان چاوی بە ژیان هەڵێناوە.
لە خزمەت شێخ موختاری مامی دا خوێندنێ دەست پێکردووە و پاشان کتێبە وردەکانی ئەو سەردەمەی لە خزمەتی مەلا محەممەدی کۆماسی خوێندووە. بە دوای فێر بوون و خوێندن زۆر شوێنی کوردستانی ئەم دیو و ئەو دیو گەڕاوە و لە خزمەتی زانایانی وەک: سەید مەحموود شێخەلئیسلامی(چۆڕ)، مامۆستا سەید جەلال(سونەتە)، مامۆستا سەید عەتای چۆڕ چێژی زانستی وەرگرتووە. دواتر لە سەر دەستی مامۆستای پایەبەرز مەلا باقری بالکدا ئیجازەی مامۆستایەتی وەرگرتووە. بەڵام مامۆستایەتی نەکردووە. ساڵی ١٩٧٣ هەواری ژیان بۆ شاری مەریوان ئەگوێزێتەوەو لە دایەرەی پەروەردە دائەمەزرێت و دواتر دیپلۆم وەرئەگرێت. دوای ٢٦ساڵ مامۆستایەتی لە مەریوان و گوندەکانی دەوربەری، خانەنشین ئەکرێت.
ئەم مامۆستایە لە پەنای ئەرکی مامۆستایەتیدا، لە بواری شێعریشدا چالاکی نواندووە و نازناوی شێعری «هاوڕێ»ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە.
شێعرەکانی مامۆستا قانع و کاکە حەمەی بێلوو ئەبێ بە هەوێنێک بۆ چوونە ناو دنیای شێعر و هەڵبەستەوە. لە بواری ڕامیاری، کۆمەڵایەتی، ئایینی، ئەوین و خۆشەویستی و

دیــــسان ســـــەلامی گەرم و بە تیـــــنم
هەڵقـــــولاو لە نــــاخ دڵەی حەزیـــــنم
پێـشکەش بە تەک تەک مـاڵ و خێزانـت
پەروەردەی فکــــــری بەرز و لێزانـــــــت
یـــا خـــوا پێنووسـت هەر وا لە ڕێـی حەق
بــــڕوا هەتـــــاکوو ئەگـــــا بە شـــــەبەق
لە لـــــووتکەی بەرزی ئاســـۆی ئـــازادی
کۆتــــــایی بێنــــــی بە نــــــامۆرادی
«ئەنـــوەر» موخلیـــسە هەتـــا کـــوو مـــاوە
نـــــاوت لە پەڕەی دڵا نووســـــــــراوە
یەک وێـــنە لە نـــاو بیـل بـــیەلەی چـــاوە
هەر چـــیَ ئەڕوانـــم شـــێوەی جێمـــاوە
هەژدەی گـــولانی ســـاڵی هەشـــتا و نـــۆ
پیـــرۆز بـــایم هـــات بـــۆ خزمەتـــی تـــۆ
سوپاســـــی خـــــوایە ئـــــاخر کەلامـــــم
هـــــاتە کۆتـــــایی عەرز و ســـــەلامم

## حەمیدە خالدی

حەمیدە خالدی کچی خوالێخۆشبوو حاجی باوە شێخی ئەڵمانەیە. ساڵی ١٩٤٤ لە گوندی «ئەڵمانە» لەبنەماڵەیەکی ئایینی و نیشتمان پەروەر چاوی بە ژیان هەڵێناوە. بە هۆی نزم بوونی ئاستی هۆشیاری کۆمەڵایەتی و داب و نەریتی ئەو سەردەمەی کۆمەڵگای کوردەواری لەئاست ژنان و کچاندا، ئەمیش وەک ژنان و کچانی سەردەمی خۆی، لە خوێندن و فێر بوون بێ بەش بوو و نەیتوانی چێژ لە بەهرەی خواپێداوی خۆی وەربگرێ.

لە ساڵەکانی ١٩٩١ و ١٩٩٢ بە کەڵـک وەرگـرتن لە کەلاسەکانی(نهضت سوادآموزی) توانیَ تا ڕادەیەک خوێندن و نووسین فێر بێت. چەرمەسەرێی ژیان و

پەرستاری کردن لە دایکی خۆی کە نەخۆش بوو و هەست و سۆزی دایکی، وای لێ کرد کە دەست بۆ پێنووس ببات و ئەزموونی شێعری خۆی بخاتە بەردەست خزمان و دۆستانی. ئێستا خەرمانی لە کچ و کوڕ و ماڵی دنیا، ژیانی کۆمەڵێ شێعر و هەڵبەستە. ئاواتە خوازە کە ڕۆژێ دەفتەرە شێعرەکەی چاپ بکرێت و بکەوێتە بەردەست خوێنەران.

**«بێ وەفایی پیاوی خراپ»**

چەند ساڵ لە ماڵ مێرد ژن ڕەنج ئەکێشێت
خوێن و مۆخی خۆی هەموو ئەبێژێت
لە دەستی ئەدات قۆناغی جوانی
ئەبێت بە فیدای ماڵ و میوانی
ئەو لەشە جوانە هەمووی تێکئەشکێت
لەزەت و خۆشی لە دەستی ئەچێت
قەدری نازانێت پیاوی بێ وەفا
پێی ئەڵێ بڕۆ خوا پەکم ناخا
ژن عومری گەیشت بە چل و پەنجا
پیاو بۆ ژنتر ئینجا هەوڵ ئەدا
ڕیش و سمێڵی بە دەواو دەرمان
هەمووی ڕەش ئەکات پیاوی فرەزان
لیباسی تازە ئەکاتە بەری
کەوشی قاوەیی، بۆیە بۆ سەری
خۆی بۆن خۆش ئەکات بە عەتر و گوڵاو
سەرو زبان خۆش لە گەڵ ژن و پیاو
بە خاتر ئەوە ژنتر بهێنێت
بۆ ژنی کۆنەی گۆڕ هەڵئەکەنێت
هیوای ژن هێنان کەڵەی ئەدات جۆش
لە لای نامێنێت عەقڵ و فام و هۆش
بە جێگەی بەحس و تەکبیر لە ناو ماڵ
جوێن و هەرا بوو لە گەڵ قسەی تاڵ

## مەلا محەممەدی جەوانڕوودی[١]

مەلا محەممەدی کوڕی زانای پایە بەرز مەلا مەحموودی جەوانڕوودی ساڵی ١٩٣٦ی زایینی لە گوندی «دەرەتفیێ» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. لە خزمەتی باوکیدا خوێندن دەست پێئەکات و بۆ تێراو بوون لە کانیاوی زانست ڕوو لە کوردستانی عێراق ئەکات. زۆربەی شار و گوندەکان ئەگەڕێت و بە خزمەتی مامۆستا ناودار و پایەبەرزەکانی سلێمانی و دەوروبەری ئەگەیەت. دوای چەند ساڵ ئەگەڕێتەوە دەرەتفیێ و لای باوکیدا درێژە بە خوێندن ئەدات و پاشان ئەڕواتە خزمەتی مامۆستا مەلا مەحەمەد ئەمینی کانی سانان. هەر لەو ساڵانەوە، لە تەمەنی حەڤدە ساڵییەوە چالاکییە سیاسییەکانی دەست پێدەکات و چالاکیی سیاسیی ئەو تا دوایین ساتەکانی ژیانی بریتی بووە لە وەستان لە بەرانبەر زۆر و نابەرابەری چ لە بەرانبەر ئەربابێکی زۆردار و چ دەوڵەتێکی سەرەڕۆ وەک دەوڵەتی پاشایەتی.

دوای ئەوەی چەند ساڵ لە خزمەتی مامۆستا مەلا باقری بالک ـ دواتر ئەبێ بە خەزوورەی ـ خوێندوویەتی. دیسانەوە بەرەو سلێمانی ئەگەڕێتەوە و سەرئەنجام لە خزمەت خەتیبی سلێمانی (شێخ محەممەدی خەتیبی گەورە) ئیجازەی زانستی وەرئەگرێت. بە هۆی نەخۆشی و کۆچی دوایی باوکییەوە ئەگەڕێتەوە زێدەکەی خۆی. بەڵام دوای ماوەیەک بە هۆی ئاگا کردنەوەی خەڵکی چەوساوە و ژێردەستی گوندەکانی دەوروبەر، بێ وچان لە ژێر هەڕەشە و ئازاری ئەرباب و زەویدارەکاندا ئەبێت. هەروەها ساڵەکانی ١٩٦١و١٩٦٢ لەلایەن دەزگای دەوڵەتییەوە حوکمی دەسبەسەری بۆ دەر ئەچێت و چەندین جار پەلاماری کوشتنی ئەدەن. هەر لە بەر ئەوە دەست لە مەلایەتی هەڵ ئەگرێ و بە میکانیکی، خەیاتی، دوکانداری، جۆشکاری، شۆفیری و ... ژیانی بە سەر ئەبات.

هەر لە منداڵییەوە نیشانی داوە کە هۆگری فێر بوونە. لە سەردەمی منداڵیدا کە باوکی دەرسی وتووەتەوە ئەم نووسەرە لە دوورەوە گوێبیستی وانەکان بووە و کاتێ

---

١. ئەم زانیارییە کاک «سەلاحی کوڕی» دەسی خستم کە جێگای ڕێز و پێزانینە.

فەقێکانی باوکی نەیانتوانیوە وەڵامی پرسیارەکان بدەنەوە، زۆر چالاکانە وەڵامی داوەتەوە. ئەم مامۆستایە لە سەر زۆرێک لە کتێبەکانی فەلسەف و مەنتق پەراوێزی نووسیوە. نامیلکەیەکی لە سەر فەلسەفە ئامادەیە کە هێشتا لە چاپ نەدراوە. کتێبێکی سەبارەت بە جۆغرافیا و مێژووی مەریوان و زانایانی ناوچە نووسیوە کە بە داخەوە مەرگ دەرفەتی تەواو کردنی پێنەداوە. زۆر هۆگری خوێندنەوە و نووسینی شێعر بووە و ئەو شێعرانەی بە خەتی خۆی لە سەر زۆربەی دەفتەر و کتێبەکانی لە کاتی خوێندنەوەیان نووسیونی، ئەگەر کۆ بکرێنەوە دەفتەرە شێعرێکی تەواوە.

دوای چەند مانگ نەخۆشین و شیمی دەرمانی لە مانگی مارسی ساڵی ١٩٩٣ ماڵ ئاوایی لە ژیان ئەکات و وەسیەت نامەکەی چەن وشە و دوو پارچە هۆنراوەی خۆی بووە کە لە سەر چەسپێکی کاغەزی لکاندویەتی بە بن دەستییەوە.

**ئەحمەد محەممەدی**

ساڵی ١٩٣٨ی زایینی لە جەرگەی هێرشی هێزەکانی شای ئێران بۆ سەر گوندی «دزڵی» کە بووە هۆی ئاوارەیی و دەرچوونی خەڵک بۆ بناری شارەزوور، لە لووتکەی بەرزی کێوەکانی هەورامان لە سەر سنوور «مڵەوەرد» لە دایک بووە.

قۆناغی سەرەتایی لە مەریوان و دواناوەندیشی لە بەشی ئەدەبی لە کرماشان تەواو کردووە. لە تەمەنی بیست و یەک ساڵاندا وەک دەرجەدار لە سپای ئەوکاتەی ئێراندا وەرگیراوە.

ساڵی ١٩٦٠ لە تەمەنی بیست‌ودوو ساڵاندا لە ناوەندی تۆپخانەی ئیسفەهانەوە بۆ ناوەندی سپای چواری ڕۆژئاوای ئێران لە شاری کرماشان ئەگوێزرێتەوە و هەر لەوێش وەک وەرگێڕی بڵاڤۆکە کوردییەکانی سپای ڕۆژئاوای ئێران دائەمەزرێت. لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦٠تا ١٩٦٣ وەک وەرگێڕی ستادی سپای ئێران ئەو ئەرکە بەڕێوە ئەبات.

لە داوی سی ساڵ خزمەت کردن لە سپای ئێراندا و جێگا گۆڕکێیەکی زۆر لە ساڵی ١٩٨٨خانەنشین ئەبێت.

بڕی و ڕەنگ کاری. لە گەڵ پێکهاتنی ڕێکخراوی «پیکار با بیسوادی[1]» دوای سەرکەوتن لە تاقیکاریدا ئەبێ بە مامۆستای قوتابخانەی «ژریژە» و دواتریش «دێوەزناو». لە درێژەی خزمەتی مامۆستاییدا، لە دایەرەی پەروەردە و بارهێنانی مەریوان بەرپرسیاریەتی وەئەستۆ ئەگرێت. دواتر بۆ سنە ئەگوێزرێتەوە و لە قوتابخانەکانی شاری سنەدا وانە ئەڵێتەوە. ساڵی ١٩٨٨ لە تاقیکاری پلەی سێی مامۆستایانی ئایینیدا بەشداری ئەکات و لە لایەن « وەزارەتی زانست و فێرکاری باڵا » دوکتورای پێ ئەبەخشرێت.

مامۆستا قانع کاریگەرییەکی یەکجار زۆری لە سەر داناوە و بەرە و نووسین هانی داوە. هەنووکەش دانیشتووی شاری سنەیە و خەریکی خوێندنەوە و نووسین و لێکۆڵینەوەیە.

**کارنامەی فەرهەنگی ئەحمەد نەزیری:**

**بڵاو کراوەکان:**

١ـ زایەڵەی زرێبار. ٢ـ کۆکردنەوەی «دیوانی مەلاحەسەنی دزڵی». ٣ـ ساخ کردنەوە و لە چاپ دانی «تاریخ سلاطین هورامان».

بڵاو نەکراوەکان:

١ـ کتێبی «هەورامان ناسی» لە هەشت بەرگ و شەش هەزار لاپەڕەدا. (لە بەر زۆر بوونی هێشتا چاپ نەبووە، بەڵام کورتەیەک لە باسەکانی ئەم کتێبە بە ناوی «بەرکولێک لە هەورامانناسی» لە ژێر چاپدایە.

٢ـ بەرهەمی بڵاو نەکراوەی «مامۆستا مەلا ساڵحی ئەسپەریزی» ناسراو بە «موحریق».

٣ـ کتێبی « گەنجینەی وشەی کوردی» .

٤ـ کۆکردنەوە و ئامادەکردنی «دیوانی فەریقی».

٥ـ کتێبی «قسە خۆشە کوردییەکان و گوڵبژێرێک لە ڕشتەی مرواری».

---

١. «پیکار با بیسوادی» واتە بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری، لە دەیەی شەستی زایینیدا لە ئێران دەستی بە چالاکی کرد و ئەرکە سەرەکییەکەی خوێندەوار کردنی گەورە ساڵانی نەخوێندەوار بوو.

٦ـ کتێبی «کایەکوردییەکان» کە دووسەدو چوار گەمەی کوردی ئەگرێتە بەر.

٧ـ نووسین و کۆکردنەوەی قسەخۆشە کوردییەکانی ناوچەی مەریوان و دەوا و دەرمانی زووی ئەم ناوچەیە.

هاوکاری کردن بە شێوەی نووسین و وتار لە گەڵ زۆربەی ڕۆژنامە و حەوتوونامەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات و باشوور، بەشداری کردن لە کۆنگرەکانی ناوخۆ و دەرەوەدا، وەک: هەورامانناسی،کۆنگرەی مەولەوی، کۆنگرەی مەولانا خالید نەقشبەندی، کۆنگرەی مەشاهیری کورد و... نووسین و ئامادەکردنی بەرنامەگەلی جیا جیا بۆ میدیا کوردییەکان و بەشداری ڕاستەوخۆ لە بەرنامەکانیاندا.

**محەممەد ڕووستایی(مامۆستا حافز)**

مامۆستا حافز، مانگی سێی ساڵی ١٩٤٧ی زایینی لە گوندی «باشماخ» لە بنەماڵەیەکی مام ناوەندی چاوی بە ژیان هەڵێناوە. باوکی «حاجی ئەحمەد» و دایکی «ئامینە» خاتوونە.

مامۆستا لە خزمەتی مامۆستایان: مامۆستا عارفی بێیەرە لە باشماخ، مامۆستا مەلا ئەحمەد گەرمیانی لە سلێمانی، مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا زەرواوی لە سلێمانی و مامۆستا مەلا محەممەدی خوداجو لە باشماخ، چۆکی فەقێیەتی داداوە. ساڵی ١٩٧٢ ژیانی هاوبەشی پێکهێناوە و باخی ژیانی بێ گوڵە و لە گەڵ «زەڕین» خاتوونی خێزانی بێ منداڵ ئەژین و دنیای پان و بەرینی بە دوو چاوی سەر نەبینیوە. ئەم پیاوە نەفس بەرز و قسەخۆشە، لە ژیانیدا بۆ جارێکیش دەستی بۆ لای کەس ڕانەکێشاوە و وەک کاسبێکی لێهاتوو، زۆر لە خزمەتی هەژاران و نەداران دایە. لە ماڵە خنجیلانەکەی وەک قوتابخانەیەک کەڵک وەرئەگرێت و بێ چاوەڕوانیی ماڵی دنیا وانەی قورئان ئەڵێتەوە.

وەرگێڕانی کتێبی «جوهرالنضید»ی شێخ مەعرووفی نۆدهی ( لە سەر زانستی تەجوید) لە عەرەبییەوە بۆ کوردی یەکێک لە چالاکییەکانی مامۆستا لە بواری نووسیندایە کە وەک سی. دی. کەوتۆتە بەر دەست هۆگرانی. مامۆستا حافیز ئێستا(٢٠١١) دانیشتووی مەریوانە.

مەعرووف بەرزەنجی، وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی فارسی.

٨ـ سێ کوچکەی هەرەس، لە نێو بەردئاشی ڕۆم و عەجەمدا، نووسینی سەلام خۆشناو، وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی فارسی.

٩ -کاروانێک لە شەهیدانی حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێران لە دەورەی پەهلەویدا، نووسینی حەسەن قزڵجی، وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی فارسی.

١٠- بە سەرهات و ژیانی پرۆفیسۆر ئەمین زەکی، نووسینی مەعرووف جیاوک، وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی فارسی.

١١ـ بیرەوەریەکانی جنرال(سپاهبۆد ئەمانۆڵڵا جیهانبانی و ئۆردوکێشی و هێرش هێنانی ئەرتەشی ئێران دژ بە سمکۆ).

١٢ـ بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد لە کوردستانی تورکیا، نووسینی جنرال ئێحسان نووری بدلیسی، وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی فارسی.

١٣ـ لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد.

١٤ـ بارزانی لە مەهابادەوە بۆ لێوارەکانی ئاراز، نووسینی نەجەف قوڵی پسیان، وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی فارسی.

١٥ـ بۆ ئاگاداری بەڕێزان، تائێستا چواردە بابەت و ڕیسالە و نامیلکە و بە سەر هات و ژیانی ڕێبەران و کەڵە پیاوانی گەلی کوردم نووسیوە و لە بەرهەمە چاپ کراوەکانمدا بە نێوی «تعلیقات» لە چاپ دراووە کە ئەمانەن:

١٦ـ بە سەرهات و ژیانی پێشەوای سەربەرز و گەورەی کورد، شەهید قازی محەممەد سەرۆک کۆماری کوردستان.

١٧ـ شێخ مەحموودی نەمر دانەری بەردی بناغەی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد.

١٨ـ مستەفا بارزانی نەمر دانەری بەردی بناغەی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد.

١٩ـ شێخ سەعیدی پیران، شەهیدی ڕێگای ئازادی گەلی کورد و ڕێبەری شۆڕشی ئاگری داخ (ئارارات) ١٩٢٥.

٢٠ـ شەهید سمایل ئاغای سمکۆ، ڕێبەری بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد.

٢١ـ بەسەرهات و ژیانی مێژوو نووس، شاعیر و وەرگێڕی بلیمەتی کورد،

عەبدولڕەحمان شەرەفکەندی(هەژار).

٢٢ـ بەسەرهاتی عەلائەددین سەجادی، مێژوونووس و ئەدیبی پایەبەرزی کورد.

٢٣ـ بنەماڵەی بەدرخانییەکان و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی ئەو بنەماڵە بۆ بەدەستهێنانی مافی ڕەوای گەلی کورد.

٢٤ـ جاسووسی کردنی جنرال میجرسۆن لە کوردستان.

٢٥ـ ڕێکەوتننامەی بە ناوبانگی ١٩٢٧ لە نێوان بەریتانیا و شێخ مەحموودی نەمردا.

٢٦ـ ئازادکردنی شێخ مەحموودی نەمر لە زیندانی «قەڵەبەندی» بەغدا بە هۆی دەروێش حسێنی سنەیی.

٢٧ـ دوایین شەڕەکانی مەحموود خانی دزڵی دژ بە بریتانیا .

٢٨ـ بە سەرهات و ژیانی مستەفا بارزانی نەمر.

٢٩ـ نامیلکەیەك سەبارەت بە شۆڕشەکانی شێخ مەحموودی نەمر، لە کۆنگرەی باڵای سلێمانی خوێندرایەوە و مەداڵی زێڕینی پێ بەخشرا.

## ئیبراهیم غەریبی

ساڵی ١٩٤١ی زایینی لە گوندی «کانی پان» سەر بە ناوچەی لەیلاخ هاتووەتە دنیا. پیشەو کاری بنەماڵەکەی کشت و کاڵ بووە و بەو شێوە ژیانیان بردووەتە سەر. بە هۆی ناکۆکییەك کە ئەکەوێتە نێوان بنەماڵەکەی و بنەماڵەیەکی تر زێدی خۆیان بە جێ دێڵن و ڕوو لە گوندێکی تر بە نێوی «کەرگ ئاوا» ئەکەن و لەوێ ئەنێردرێتە حوجرەی مزگەوت و جزوی عەممە ئەخوێنێت. لە بەر باری لاوازی ژیان ڕوو ئەکەنە سنە و پاشان مەریوان و لەوێشەوە بەرەو ئێراق ئەڕۆن تا لە کەرکووك ئەگیرسێنەوە. پاش دوو ساڵ بە هۆی ئێرانی بگیرەوە دیسان باروبنەیان بەرەو ئەم دیو ئەپێچنەوە و مەریوان ئەبێ بە ماڵ و زێدیان.

خوێندنی سەرەتایی لە مەریوان دەست پێئەکات. ساڵی ١٩٦٠ لە «دانشسرای مقدماتی تربیت معلم» لە سنە بۆ مامۆستایەتی وەرئەگیرێت. دوای تەواو کردنی خولی فێرکاری ئەگەڕێتەوە مەریوان وجل و بەرگی مامۆستایەتی لەبەر ئەکات و بە بیر و هزری ڕۆژەوە سی و چوار ساڵی ڕەبەق دەستی لەرزۆکی قوتابیانی قۆناغی سەرەتایی

و چاپەمەنییانەوە گەیشتووەتە بەردەنگی خۆیان: ڕادیۆی سنە و ڕادیۆی کرماشان؛ حەوتەنامە و گۆڤارەکانی: بانگی حەق، ئاسۆ (گۆڤاری زانکۆی سەنعەتی ئیسفەهان)، ڕوانگە (گۆڤاری زانکۆی کوردستان)، و هاوار.

وەکوو کتێب ئەتوانین ئاماژە بە وەرگێڕانی قورئانی پیرۆز بکەین کە ئامادەی چاپە. ئێستاش خەریکە کار لە سەر کتێبێک ئەکات لە مەڕ مێژووی شار و ناوچەی مەریوان.

## ناسر حەیدەری کانی سانانی

کوڕی حەمەخان کوڕی مەحموود خانی کانی سانان و دایکی «تاووس» خاتوون کچی سلێمان خانی جافە. ساڵی ١٩۴٨ی زایینی لە گوندی «شەیان»[1] لە ناوچەی شلێر لە کوردستانی ئێراق چاوی بە ژیان هەڵێناوە.

ئەم نووسەرە ئەڵێت[2]: «هەر لە کانی سانان چومە مەدرەسە. لە بیرمە بەشێک لە ماڵەکەی خۆمان بۆ مەدرەسە و ماڵی مامۆستا تەرخان کردبوو. ئەو شوێنە لە مێژەوە مەدرەسەی تێدا بوو[3]. یەکەم مامۆستام پیاوێکی قسەخۆشی خاوەن هەستی شێعری سنەیی بوو بە نێوی ئاغای «هوشیار». من کە کوڕی سەرۆک عەشیرەی حەیدەری بووم، وەک قوتابیەکانی تر سەیری

١. لە دوای کۆچی دوایی خوالێخۆشبوو مەحموودخانی کانی سانان لە ساڵی ١٩۴١ لە زیندانی «قەسری قاجار»ی تاراندا، حەمەخانی کوڕی ئەکەوێتە ژێر زەبر و زەنگ و موڵک و ماڵی لێزەوت ئەکرێت. حەمەخان کە خوێنەواری ئاکادمیای نیزامی لە تاران بووە، لە گەڵ پتر لە ٧٠ کەس لە هاوڕێیانی لە مەریوان، لە سەر بانگهێشتی قازی محەمەد ئەڕواتە مەهاباد و تێکەڵ بەو شۆڕشە ئەبێت و پلەی سەرهەنگی پێ ئەبەخشرێت. پێش لە هاتنی سوپای نیزامی و هەرەس هێنانی کۆماری کوردستان، لەسەر پێشنیاری پێشەوا قازی، مەهاباد بەجێدێڵێت. ئەچێتە «مێشیاو»و بە هۆی ڕاوەدونانی دەوڵەتی ئێراقەوە، ئەویش بە جێدێڵێت و ئەڕواتە «شەیان»و پەنا ئەبا بۆ شێخ مەحموودی نەمر و لای شێخ دائەنیشێت. بە تاوانی بەشداری چالاکانە لە کۆماری کوردستاندا، بە شێوەی غیابی بڕیاری لە سێدارەدانی لە لایەن حکومەتی ئێرانەوە بۆ دەر ئەچێت. پاش ساڵێک لە لایەن «سپەهبود ڕزم ئارا»وە ئەو بڕیارە هەڵئەوشێتەوە و بەم جۆرە ئەگەڕێتەوە زێدەکەی خۆی کانی سانان.

٢. وت و وێژ لە گەڵ نووسەر.

٣. یەکەم خوێندنگا لە مەریوان لە ساڵی ١٩٢۶ لەو شوێنەدا، لە سەر خواست و ویستی خوالێخۆشبوو مەحموودخانی کانی سانان دائەمەزرێت. پاش گرتن و دوورخستنەوەی سەرۆک عەشیرەکانی کوردستان لە ساڵی ١٩٣٠و١٩٣١ لە لایەن حکومەتی ڕەزاشاوە، ئەو قوتابخانەش دائەخرێت. ساڵی ١٩۵۴دیسان دائەمەزرێتەوە.

شــارەزای ڕەوتــی تــازە و گۆڕانکارییەکــانی دنیــای ئەدەبیــات ئەبێــت. چــاوە شێخەلئیسلامی هاوڕێ لە گەڵ سوارەی ئیلخانی زادە و عەلـی حەسـەنیانی هەوەڵـین هەنگاوەکانی بزاڤی نوێکردنەوەی شێعری کوردی لە کوردستانی ئێـران هەڵـدەگرن. دواتــر ئەبــێ بە مامۆســتا لە قوتابخانەکــانی شــاری مەریــوان و دوای چەنــد ســاڵ مامۆستایەتی دیسانەوە دەستبەسەر ئەکرێت ـ تا بێ بەش کردنی لە مافی کۆمەڵایەتی ـ لە زیندانی «قەسری قەجەر»ی تاران ئەیهێڵنەوە. پاش ئازاد بـوونی لە زینـدان، بە دەس فرۆشی لە گوندەکانی ناوچەی مەریـوان بژێـوی ژیـانی خـۆی دابـین ئەکـات. دوای شۆڕشـی گەلانـی ئێـران ئەبـرێتەوە سـەر کـار و دواتـریش لە سـەرکار لائەبرێـت و بەیەکجاری مەریوان بە جێدەهێڵت. چاوە لە ساڵی١٩٧٩وە لە وڵاتی سوید ئەژیت.

**«ئاسمان دوور و زەوی سەخت»**

لە ڕواڵەتێکی خەشیما نەزیرەی چ نابینێ
لە عەسرێکا
کە دێوی زاڵی عیلمی بەشەر مێشی مانگ ئەقاپێنێ
لە ڕواڵەتێکی خەشیما نەزیرەی چ نابینێ
لە کاتێکا
هەر دوو دەسی هەتاکوو ئەنیشکی لە قوڕ ناوە
نەک بۆ کار
نەک بۆ قوڕ شێلان
بەڵکوو بە ڕەمزی
تەمێ و پەشیمانی
پەشیمانی
لەوان مەجالان
وابەرد و ئاسنی شێلا و
خەنجەری خولقاند
بۆ دەستی ئەو کەسانە
کە دەستی پێ ئەنێنە سەر سینە

لەوان مەجالان
وا عەرزی هەڵدڕی
بە چنگەڕنێ
تا مشکی هەماری ماڵی ئاغا
بە خەلەی سوور
گورپن بێ و خرپن بێ
مناڵەکانی ئەویش ببنە بووکە دارینە
لە ڕواڵەتێکی خەشیما نەزیرەی چ نابینێ
لە کاتێکا
خەنجەر و دەسەکەوشەی نەماوە
بۆ دەستی بەر پشتێن
لە ڕواڵەتێکی خەشیما نەزیرەی چ نابینێ
لە کاتێکا
هاتۆتە گوێسەبان
سەر گوێسەبانی ماڵی ڕووخاوی
هاوار ئەکا:
گەلی برادەرینە!
زەوی سەختە ئاسمان دوورە.
(پاییزی ١٩٦٥)

**«بۆ مەهاباد»**

لای گەلاوێژ چلەی هاوینە
ڕۆژە وەك ڕوومەتی یار پڕ تینە
کەڵکەڵەی گەشت و گەرم کەوتەوە سەر
بەم گڕ و کڵپە سەرم نایە سەفەر
بۆ مەهابادی هەژار و هێمن
تاسە پڕ گیان و دڵی بە سوێمن

تاقەداری کزی پیری عەودالْ
دیمەنی «هێمن»ی هێنامە خەیالْ
وەکوو ئەو تاك و تەریك لەم لێژا
غەیری سوێراوی گڕاو نەیچێژا
(١٩٦٦)

**«شەو»**

شەوم بردە سەر بە ئاواتی خەو
خەو نەبوو لە بەر خەیاڵاتی شەو
تاریکیی شەوان خەیالْ ئەهێنێ
دریژیی خەیالْ خەو ئەڕەوێنێ
(١٩٦٣)

## مامۆستا مەحموود دەستوورە(مودەڕیس)

مامۆستا مەحموود کوڕی «محەممە» و «ئامین» خاتوونە. ساڵی ١٩٤١ی زایینی لە گوندی «کاڵ» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. سەرتای خوێندنی بە قورئانەوە لە لای خوالێخۆشبوو «شێخ عابدی کاڵ» دەست پێئەکات. بۆ درێژەدان بە خوێندن زۆر شوێنی کوردستانی ئێران و ئێراق گەڕاوە و لە خزمەت ئەم زانایانەدا چێژی وەرگرتووە؛ مامۆستا شێخ جەلال فارۆقی(نژمار)، مامۆستا عارف وەسنەیی(سەردۆش)، مامۆستا سەید عەلی خالدی(نێ)، مامۆستا عارف عەلامی(ولەژێر)، مامۆستا فایەق ئەڵمانەیی و مامۆستا کەریم سەردۆش(وەیسە)، مامۆستا ئیسماعیل(پێنجوێن)، مامۆستا حەسەن(عەبابەیلێ)، مامۆستا شێخ حسێن (نزارە)، مامۆستا محەممەدی مل چەور(بەردەڕەشە)، مامۆستا محەممەد ئەمین عالی(کانی سانان). ساڵی ١٩٦٥ لە سەردەستی مامۆستای کانی سانان لە خانەقای

دووڕۆ ئیجازەی مامۆستایەتی وەرئەگرێت. ماوەی ١٣ساڵ وەک وانەبێژ لە قوتابخانەی دووڕۆ خزمەت بە ئایین ئەکات و لەبەر زانایی و لێهاتوویی لە زانست و وانەوتنەوەدا بە «مودرِیسی دووڕۆ» ئەناسرێت. جێگای وەبیر هێنانەوەیە پێش چوونی بۆ دووڕۆ بە هۆی بیری نەتەوایەتیەوە، لە لایەن ڕژێمی پاشایەتییەوە ماوەیەک قاچاخ ئەبێت.

مودەڕیسی دووڕۆ، ساڵی ١٩٧٨ لە بەر باری ئاڵۆزی ناوچەکە، لە گەڵ پیری ڕێبازەکەی «شێخ عوسمانی سێراجەددینی» هەواری ژیان بۆ کوردستانی ئێراق ئەگوێزێتەوە و دوای ماوەیەک مانەوە لە بیارە، لە مزگەوتی مەولانا خالیدی شارۆچکەی سەید سادق وەک پێش نوێژ و وانەبێژ خزمەت دەکات. دواتر ئەڕواتە مزگەوتی حاجی عەلی بەگ لە سلێمانی. لە دوای دەستپێکردنی ڕاپەڕینە گشتییەکە دژ بە دەسەڵاتی بەعس، بۆ زێدەکەی خۆی مەریوان ئەگەڕێتەوە. لەو سەردەمەوە پێش نوێژ و وانەبێژی مزگەوتی گوندی «نگڵ»ە. ئەم مامۆستایە لە هەر مزگەوت و شوێنێکدا، قوتابخانەیەکی ئایینی ڕازاندۆتەوە و زۆر مامۆستا و زانای پایە بەرزی پێگەیاندووە. ئەم لە نووسینی شێعردا دەستێکی توانای هەیە. خاوەنی چوار کۆمەڵە شێعرە، بە دوو زمانی کوردی و فارسی و بە شێوەی کلاسیک لە بابەتگەلی ئایینی، کۆمەڵایەتی و منداڵان.

**«ئەی مناڵە کاڵەکان»**

ئەی مناڵە کاڵەکان — نگینی ناو ماڵەکان
بێ تۆکڵ و بێ کینەن — جێ نشینی ئەم چینەن
دڵپاک و بێ تەماعن — نەمامی تازەی باخن
ئێوەن هیوای ئەم گەلە — کە پێ بگەن بە پەلە
ئێوەن هیوای ئەم چینە — باخی ئەم سەر زەمینە
دایکی دڵسۆزی ئێوە — کە دڵ قایم وەک کێوە
بە لای لایەو گۆرانی — بە شیری پاک و جوانی
ئێوەی بە مێهرەبانی — پەروەردە کرد بە جوانی

ئەمجا خستنیە مەکتەب    بۆ کەسبی عیلم و ئەدەب
چوونە ژێر دەرس موعەللیم    لە بۆ تەربییەو تەعلیم
بەشکم شتێ فێر ببن    لە نەزانی دەربچن
ئێوەش خۆت و غیرەتتان    تەلاش بکەن بێ وچان
ڕەنجی دایکی مێهرەبان    مەخەنە ناو ئەشغاڵدان
ڕۆشن کەنۆ وجاخی    ببن بە گوڵی باخی
ڕەنجی بە هەدەر مەدەن    گوڵی هیوای سیس مەکەن
بەڵکوو نەمرن پێ بگەن    لەم دنیایە تێ بگەن
هەرگیز نەخلەتێن بۆکەس    ناموس بەرنەدەن لە دەس
یەک دڵ و یەک جەهەت بن    خاوەنی بەسیرەت بن
ئەخلاق لە دەس بەرنەدەن    بە ئەدەب ڕەفتار بکەن
دوور بن لە دوودی تریاق    لە سۆحبەتی بەد ئەخلاق
خۆتان پارێزن لە شەڕ    لە شەڕ خۆتان بکەن کەڕ
سەعی بکەن تا بەهار    شەویش بکەن بە نەهار
ئەوەی دەرستان پێ ئێژێ    خراپتان پێ نایەژێ
ئێوە فێر خوێندن ئەکا    لە جەهل دەرتان ئەکا
لە قسەیان دەر مەچن    ئیحترامیان ڕابگرن
بە ئەدەب بن لە گەڵیان    قیام بکەن لە بەریان
کە هاتنە دەشتەوە    لە بیرتان نەچێتەوە
موعەللیم گەورەتانە    وەکوو تاجی سەرتانە
ئەدەب بۆ خۆتان خاسە    دەستان نانێتە کاسە
بێ ئەدەب بەشخوراوە    بە سووک ناوی براوە
ئاخر وەسیەتم وایە    ئێژم دنیا کا و بایە
گشت ئومێد و هیوایە    هەمووی بە دەس خوایە
دەس لە خوا بەرمەدەن    ئیتاعەی ئەمری بکەن
لە گەڵ ئەوا ئەخوێنن    فەرمانی بە جێ بێنن
زانینێ سوودی هەیە    بۆندار بە وێنەی بەیە...

## ئەنوەر لهۆنیان

ساڵی ١٩٤٣ی زایینی لە گوندی «کیکن» لە ناوچەی خاو و میراوای مەریوان لە دایک بووە. باوکی محەممەد سەعید، ناسراو بە گرووبان سەعید بووە کە لە تەمەنی شەش ساڵی کاک ئەنوەردا لە شەڕی نێوان «لهۆن و جوانڕۆ» ئەکوژرێت. نەجیبە خانمی دایکی ئەرکی بەخێوکردن و پەروەردەکردنی لە گەڵ هاوسەرەکەی عەبدوڵڵا بەگی قامیشلە وەستۆ ئەگرێ. باوەپیارەکەش وەک کوڕی خۆی پەروەردەی ئەکات.

ساڵی ١٩٧٣ ئەبێ بە چریک و شەش مانگی ئاخری لە گوندی هەنجیران ئەمێنێتەوە. سەید محەممەد ئەمین ناوێک کە پیاوێکی ژیر و لێهاتوو بووە، هەموو ڕۆژێک لە ماڵەکەی خۆیدا دەرسی پێئەڵێت و تا فێری خوێندن و نووسینی ئەکات. دەست لە چریکی هەڵئەگرێت و بۆ بژێوی ژیان لای دۆستێکی فێری پیشەی بەرگدووری ئەبێت .

ساڵی ١٩٧٥ لە ئیمتیحانی پۆلی پێنج سەرئەکەوێت و بۆ پاراستنی دار و دەوەنی زێد و نیشتمانەکەی ئەچێتە ئیدارەی «جنگلبانی»، کە لە دوای سی ساڵ خزمەت کردن خانەنشین ئەبێت.

شەڕی هەشت ساڵەی نێوان ئێراق و ئێران کاک ئەنوەر ناچار ئەکات کە سی و حەوت جار بە ماڵ و منداڵەوە ئەم هەوار و ئەو هەوار بکات.

بۆ گەشە پێدان بە زانین و توانایی خۆی زۆر هەوڵی داوە. تا ئەوە جێیەی کە دەست لە ملی پێنووس ئەکات و حەز و ویستی خۆی وەک شێعر دەرئەبڕێت.

بەوتەی خۆی: «جوانی وڵاتەکەم و گیروگرفتی ژیان و کوێرەوەری زۆر، دەستیان دا بە دەستی یەکەوە تا توانیم ئەوەی لە دڵمایە باشتر بیخەمە سەر پانتای کاغەزەوە[1].»

کاک ئەنوەر خاوەنی چەند دەفتەر شێعرە کە ئامادەی چاپن.

---

١. وتووێژ لەگەڵ نووسەر.

## «پیرۆز بایی جەژنی نەوروز لە جێماو»[1]

هەوڵ بە نــــاوی خـــــودای دادگەر
لە پاشـــان ســـڵاو لە گیـــانی ڕێـــبەر
بـــرای بەڕێـــزم زانـــا و بـــا هـــونەر
یـــا خـــوا بە خۆشـــی دونیـــا بەیـــتە ســـەر
دڵـــسۆزی گەلـــی بە ناســـۆر خنکـــاو
چـــاو ســـاقی هەژار مەشـــهوور بە جێمـــاو
ســـاڵی تـــازەیە ســـەوزە کەش و کـــۆ
دڵ بـــۆ ســـەیری شـــاخ داخە وەک پـــشکۆ
موبـــارەک بـــایی عەرز ئەکەم پێتـــان
بەهـــار، جەژنـــی گـــوڵ پێـــرۆز بـــێ لێتـــان
لە تـــۆ و لە هەمـــوو پێنـــووس بەدەســـتان
لە گەلـــی کـــورد و خـــاکی کوردســـتان
خـــودای بـــانی ســـەر ئاگـــای لە حـــاڵە
ســـاڵ و مانـــگ و ڕۆژ تـــۆم لە خەیـــاڵە
لە ئـــاوێنەی دڵ شـــێوەی جەنابـــت
دیـــارە ئاکـــار و ڕەســـم و ئادابـــت
بە چەکـــی پێنـــووس خەریـــک خەبـــاتی
لە فکـــری مـــافی گەل و وڵاتـــی
لە خـــوا ئەخـــوازم هەســـتت پـــتەو بـــێ
بـــۆ خـــزمەت بە گەل فکـــرت پێـــشڕەو بـــێ
لای مـــن بەڕێـــزی گـــوڵی چـــوار وەرزی
وەک ســـیازاخ و شـــاهۆ ســـەر بەرزی
مامۆســـتای زانـــا ئەدیـــب و دڵـــسۆز
چـــرای ڕوونـــاکی خـــاک و گەل و هـــۆز

---

١. نازناوی شاعیر کاک عوسمان ئەشکاوەندە.

دیـــــسان ســــەلامی گەرم و بە تیـــــنم
هەڵقـــــوڵاو لە نــــاخ دڵەی حەزیـــــنم
پێــشکەش بە تەک تەک مــاڵ و خێزانــت
پەروەردەی فکــــری بەرز و لێزانـــــت
یــا خــوا پێنووســت هەر وا لە ڕێــی حەق
بـــــڕوا هەتــــاکوو ئەگـــا بە شــــەبەق
لە لــــووتکەی بەرزی ئاســـۆی ئــازادی
کۆتـــــایی بێنــــــی بە نـــــامۆرادی
«ئەنــوەر» موخلیـــسە هەتــا کــوو مــاوە
نـــــاوت لە پەڕەی دڵا نووســــــراوە
یەک وێـــنە لە نــاو بیــل بــیەلەی چــاوە
هەر چـــیٚ ئەڕوانــم شــێوەی جێمـــاوە
هەژدەی گــوڵانی ســاڵی هەشـــتا و نــۆ
پیــرۆز بــایم هــات بــۆ خزمەتــی تــۆ
سوپاســـــی خـــوایە ئــاخر کەلامــــم
هــــاتە کۆتـــایی عەرز و ســــەلامم

## حەمیدە خالدی

حەمیدە خالدی کچی خوالێخۆشبوو حاجی باوە شێخی ئەڵمـانەیە. سـاڵی ١٩٤٤ لە گونـدی «ئەڵمـانە» لەبنەمـاڵەیەکی ئایینی و نیشتمان پەروەر چاوی بە ژیان هەڵێناوە. بە هۆی نزم بوونی ئاسـتی هۆشـیاری کـۆمەڵایەتی و داب و نەریتـی ئەو سەردەمەی کۆمەڵگای کوردەواری لەئاست ژنـان و کچانـدا، ئەمـیش وەک ژنـان و کچانی سەردەمی خـۆی، لە خوێنـدن و فێـر بـوون بـیٚ بەش بـوو و نەیتـوانی چێـژ لە بەهرەی خواپێداوی خۆی وەربگریٚ.

لە ســاڵەکانی ١٩٩١ و ١٩٩٢ بە کەڵــک وەرگــرتن لە کەلاســەکانی(نهــضت سوادآموزی) توانیٚ تا ڕادەیەک خوێندن و نووسین فێـر بێـت. چەرمەسـەرێی ژیـان و

پەرستاری کردن لە دایکی خۆی کە نەخۆش بوو و هەست و سۆزی دایکی، وای لێ کرد کە دەست بۆ پێنووس ببات و ئەزموونی شێعری خۆی بخاتە بەردەست خزمان و دۆستانی. ئێستا خەرمانی لە کچ و کوڕ و ماڵی دنیا، ژیانی کۆمەڵێ شێعر و هەڵبەستە. ئاواتە خوازە کە رۆژێ دەفتەرە شێعرەکەی چاپ بکرێت و بکەوێتە بەردەست خوێنەران.

**«بێ وەفایی پیاوی خراپ»**

چەند ساڵ لە ماڵ مێرد ژن ڕەنج ئەکێشێت
خوێن و مۆخی خۆی هەموو ئەبێژێت
لە دەستی ئەدات قۆناغی جوانی
ئەبێت بە فیدای ماڵ و میوانی
ئەو لەشە جوانە هەمووی تێکئەشکێت
لەزەت و خۆشی لە دەستی ئەچێت
قەدری نازانێت پیاوی بێ وەفا
پێی ئەڵێ بڕۆ خوا پەکم ناخا
ژن عومری گەیشت بە چل و پەنجا
پیاو بۆ ژنتر ئینجا هەوڵ ئەدا
ڕیش و سمێڵی بە دەواو دەرمان
هەمووی ڕەش ئەکات پیاوی فرەزان
لیباسی تازە ئەکاتە بەری
کەوشی قاوەیی، بۆیە بۆ سەری
خۆی بۆن خۆش ئەکات بە عەتر و گوڵاو
سەرو زبان خۆش لە گەڵ ژن و پیاو
بە خاتر ئەوە ژنتر بهێنێت
بۆ ژنی کۆنەی گۆڕ هەڵئەکەنێت
هیوای ژن هێنان کەڵلەی ئەدات جۆش
لە لای نامێنێت عەقڵ و فام و هۆش
بە جێگەی بەحس و تەکبیر لە ناو ماڵ
جوێن و هەرا بوو لە گەڵ قسەی تاڵ

ئەو پیـــــاوە وەهــــا فکــــری ئەشــــێوێت
مـــاڵ و منـــداڵ و زنـــدەگی ناوێـــت
فکـــری ژن هێنـــان وەهـــای لـــێ ئەکـــات
خـــۆراك و خەوی لـــێ حەرام ئەکـــات
ئەم جـــارە ئەڕوات بـــۆ خواســـتگاری
زوو مـــارەی ببـــڕێ و تەواوکـــا کـــاری
چەنـــد پیـــاوی مـــاقووڵ ســـمێڵ چەخمـــاخی
ســـەرو ڕەشـــتی زل، قەیـــیم گەڵبـــاخی
ئەحـــمەد و مەحمـــوود لە گەڵ کـــا مووســـا
ئەکەونە پـــشت ســـەر حـــاجی و مامۆســـا
چەنـــد ژنـــی گوســـتاخ بـــۆ کاروفرمـــان
مەحبـــووب و مەعـــسووم، شـــلێر و جیـــران
لیبـــاس و کەوش و مێخەکـــی خـــۆش بـــۆن
گۆشـــت و بـــرنج و قەن و چـــایی و ڕۆن
ئـــاوێنە و ســـابوون، عەتـــر و گـــوڵاوی
نوقـــڵ و شـــیرینی، کـــلە بـــۆ چـــاوی
مارەیـــان بـــڕی بـــێ قـــڕە و هەرا
بـــۆ گـــوێزانەوەی تەکبیـــری کـــرا
خۆیـــشی ئەزانـــێ کـــاری وا شـــیرین
هیچ کەس نەیکردووە لە سەر ڕووی زەمین
کچـــیش و دایـــك هەردوو نەزانـــن
هەر دوو مەغـــرووری دەورو زەمـــانن
ئەم فکـــرە کـــۆنە کـــاری نەزانە
ژن بە ســـەر ژن دان دوژمنـــی گیـــانە
دوژمنـــــــی درۆ زۆر ئاشـــــــکرایە
دوژمنـــی نـــاو مـــاڵ مـــاری پەنـــایە
بە پێکەنینـــێ جەرگـــت ئەکـــا کـــون
درەختـــی عـــومرت دەردێنێـــت لە بـــن

تـــۆ بە چەن ڕۆژێ ئـــابڕووی خـــۆت ئەبەی
بـــۆ پـــوولْ و پـــارە خـــۆت ریـــسوا ئەکەی
پیـــاو چـــۆنە بـــۆ ئەو، بـــۆ تـــۆش هەروایە
ڕەنجـــی گەلـــێ ژن ئەچـــێ بە زایە
خوشـــکانی ئـــازیز کیژانـــی چاوکـــالْ
ئیتـــر بەســـیەتی ئـــاژاوەی ناومـــالْ
ئەم ڕەســـــمە قـــــۆڕە لابەن لە نـــاوا
کەم خۆتـــان گـــوم کەن لە نـــاو قـــوڕاوا
پیـــاو ئەگەر عـــوزر و بەهـــانەی ببێـــت
یـــا بـــێ منـــدالْ و یـــا ژن خـــراپ بێـــت
ئەو پیـــاوە حەقـــی ژن هێنـــانی هەس
ڕەنجـــی چەن ســـالەی بەر نـــادا لە دەس

### ئەحمەد نەزیری

ئەم نووســەرە کــوڕی مەلا عەلــی لە بنەمــالەی حــاجی مەلا نەزیـری تەوێـلەیە. سـالی ١٩٤٧ی زایینـی لە گونـدی «دەگاگـا» چاوی بە ژیان هەڵێناوە.

بنەمالەکەیان بە هۆگەلی تـایبەتەوە، زۆر شـوێن گەڕاون و ئەم دیو و ئەو دیویان کردووە. دوای شۆڕشی عەبدولکەیم قاسم، بۆ هەمیشە ئێراق بە جێ دێلن و بۆ مەریوان ئەگەڕێنەوە و باوکی دەبێتە مەلای «ڕێخەلان».

ئەم نووسەرە خوێندنی بە قورئانی پیرۆزەوە و لە لای باوکی دەست پێئەکـات. بـۆ درێژەدان بە خوێندن ئەچێتە ئاواییەکانی سیاناو، وەیسە، کانی سانان، بالک، نژمار و بەرقەلا.

لە تەمەنی شانزە سالیدا، باوکی مالئاوایی لە ژیان ئەکات و ئەمیش بەخێـو کردنـی سێ خوشک و برایەک ئەکەوێـتە ئەسـتۆی و هاوکـات ئەبـێ بە جێگـری بـاوکی لە مزگەوت. دوای ماوەیەک مەلایەتی، ڕێخەلان بە جـێ دێلێـت و دەچێـتە «مـازیبن» و دواتریش دەبێتە مەلای «ژریژە». لە پالْ مەلایەتیدا دەست ئەکات بە دارتاشی و شیـشە

بڕی و ڕەنگ کاری. لە گەڵ پێکهاتنی ڕێکخراوی «پیکار با بیسوادی[1]» دوای سەرکەوتن لە تاقیکاریدا ئەبێ بە مامۆستای قوتابخانەی «ژریژە» و دواتریش «دێوەزناو». لە درێژەی خزمەتی مامۆستاییدا، لە دایەرەی پەروەردە و بارهێنانی مەریوان بەرپرسیاریەتی وەئەستۆ ئەگرێت. دواتر بۆ سنە ئەگوێزرێتەوە و لە قوتابخانەکانی شاری سنەدا وانە ئەلێتەوە. ساڵی ١٩٨٨ لە تاقیکاری پلەی سێی مامۆستایانی ئایینیدا بەشداری ئەکات و لە لایەن «وەزارەتی زانست و فێرکاری باڵا» دوکتورای پێ ئەبەخشرێت.

مامۆستا قانع کاریگەرییەکی یەکجار زۆری لە سەر داناوە و بەرە و نووسین هانی داوە. هەنووکەش دانیشتووی شاری سنەیە و خەریکی خوێندنەوە و نووسین و لێکۆڵینەوەیە.

**کارنامەی فەرهەنگی ئەحمەد نەزیری:**

**بڵاو کراوەکان:**

١ـ زایەڵەی زرێبار. ٢ـ کۆکردنەوەی «دیوانی مەلاحەسەنی دزڵی». ٣ـ ساخ کردنەوە و لە چاپ دانی «تاریخ سلاطین هورامان».

بڵاو نەکراوەکان:

١ـ کتێبی «هەورامان ناسی» لە هەشت بەرگ و شەش هەزار لاپەڕەدا. (لە بەر زۆر بوونی هێشتا چاپ نەبووە، بەڵام کورتەیەک لە باسەکانی ئەم کتێبە بە ناوی «بەرکولێک لە هەورامانناسی» لە ژێر چاپدایە.

٢ـ بەرهەمی بڵاو نەکراوەی «مامۆستا مەلا ساڵحی ئەسپەرێزی» ناسراو بە «موحریق».

٣ـ کتێبی «گەنجینەی وشەی کوردی».

٤ـ کۆکردنەوە و ئامادەکردنی «دیوانی فەریقی».

٥ـ کتێبی «قسە خۆشە کوردییەکان و گوڵبژێرێک لە ڕشتەی مرواری».

---

١. «پیکار با بیسوادی» واتە بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری، لە دەیەی شەستی زایینیدا لە ئێران دەستی بە چالاکی کرد و ئەرکە سەرەکییەکەی خوێندەوار کردنی گەورە ساڵانی نەخوێندەوار بوو.

٦- کتێبی «کایەکوردییەکان» کە دووسەدو چوار گەمەی کوردی ئەگرێتە بەر.

٧- نووسین و کۆکردنەوەی قسەخۆشە کوردییەکانی ناوچەی مەریوان و دەوا و دەرمانی زووی ئەم ناوچەیە.

هاوکاری کردن بە شێوەی نووسین و وتار لەگەڵ زۆربەی ڕۆژنامە و حەوتوونامەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات و باشوور، بەشداری کردن لە کۆنگرەکانی ناوخۆ و دەرەوەدا، وەک: هەورامانناسی،کۆنگرەی مەولەوی، کۆنگرەی مەولانا خالید نەقشبەندی، کۆنگرەی مەشاهیری کورد و... نووسین و ئامادەکردنی بەرنامەگەلی جیا جیا بۆ میدیا کوردییەکان و بەشداری ڕاستەوخۆ لە بەرنامەکانیاندا.

## محەممەد ڕووستایی(مامۆستا حافز)

مامۆستا حافز، مانگی سێی ساڵی ١٩٤٧ی زایینی لە گوندی «باشماخ» لە بنەماڵەیەکی مام ناوەندی چاوی بە ژیان هەڵێناوە. باوکی «حاجی ئەحمەد» و دایکی «ئامینە» خاتوونە.

مامۆستا لە خزمەتی مامۆستایان: مامۆستا عارفی بێیەرە لە باشماخ، مامۆستا مەلا ئەحمەد گەرمیانی لە سلێمانی، مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا زەرواوی لە سلێمانی و مامۆستا مەلا محەممەدی خوداجو لە باشماخ، چۆکی فەقێیەتی داداوە. ساڵی ١٩٧٢ ژیانی هاوبەشی پێکهێناوە و باخی ژیانی بێ گوڵە و لەگەڵ «زەڕین» خاتوونی خێزانی بێ منداڵ ئەژین و دنیای پان و بەرینی بە دوو چاوی سەر نەبینیوە. ئەم پیاوە نەفس بەرز و قسەخۆشە، لە ژیانیدا بۆ جارێکیش دەستی بۆ لای کەس ڕانەکێشاوە و وەک کاسبێکی لێهاتوو، زۆر لە خزمەتی هەژاران و نەداران دایە. لە ماڵە خنجیلانەکەی وەک قوتابخانەیەک کەڵک وەرئەگرێت و بێ چاوەڕوانیی ماڵی دنیا وانەی قورئان ئەڵێتەوە.

وەرگێڕانی کتێبی «جوهرالنضید»ی شێخ مەعرووفی نۆدهی ( لە سەر زانستی تەجوید) لە عەرەبییەوە بۆ کوردی یەکێک لە چالاکییەکانی مامۆستا لە بواری نووسیندایە کە وەک سی. دی. کەوتۆتە بەر دەست هۆگرانی. مامۆستا حافیز ئێستا(٢٠١١) دانیشتووی مەریوانە.

## موسلێح شێخەلئیسلامی (ڕێبوار)

ساڵی ١٩٤٧ی زایینی لە مەریوان چاوی بە ژیان هەڵێناوە. باوکی سەید ئەحمەد و دایکی فەهیمە خاتوونە و لە بنەماڵەی شێخەکانی «وشکێن»ە. خوێندنی سەرەتایی لە مەریوان دەست پێئەکات. بۆ درێژەدان بە خوێندن ئەچێتە تاران و بڕوانامەی بەکالۆریۆسی ئابووری لە زانکۆی تاران وەرئەگرێت. دواتر ئەگەڕێتەوە سنە و لە دایەرەی بەرنامە و بودجەدا دائەمەزرێت. لە سەر داوای خۆی ئەچێتە شاری زەنجان. دواتر ئەکەوێتە بەر شاڵاوی لە سەر کار لابردن و ساڵی ١٩٧٩ مەریوان بە جێدێڵێت. هەواری ژیانی بۆ وڵاتی سوید ئەگوێزێتەوە. ڕێبوار بە دوو زمانی کوردی و سویدی بەرهەمی ئەدەبی هەیە.

**بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر:**

١ـ گەشتێك لە کوردستان(کۆمەڵە شێعر).

٢ـ سروودی ئاڵای ئازادی(کۆمەڵە شێعر).

٣ـ دەنگ هەڵبڕە(کۆمەڵە شێعر).

٤ـ چەپکێك چیرۆکی جوان بۆ منداڵان.

٥ـ «ترێسی چاپمەن» شاعیر و گۆرانی بێژی ئەمریکای لاتین(بە زمانی فارسی).

## ئیبراهیم مەردۆخی

بنەماڵەی ئیبراهیم مەردۆخی لە بنەڕەتدا خەڵکی گوندی بەرقەڵای مەریوانن. شێخ نەجمەدینی باوکی، لە دەورو بەری ساڵی ١٩٢١ی زایینی کەوتووەتە گوندی «زونجی»سەر بە ناوچەی کەڵاتەرزان. بەڕچەڵەك ئەگەڕێنەوە سەر مەردۆخییەکانی دەگاشێخان.

ساڵی ١٩٤٨ی زایینی لە گوندی زونج چاوی بە دنیا هەڵێناوە. هەر لە سەردەمی منداڵیدا خراوەتە بەرخوێندن؛ لە ساڵی ١٩٦٠ بۆ درێژەدان بە خوێندن هاتووەتە کانیسانان

**چالاکییەکانی نووسەر:**

سەرەتای چالاکییەکانی ئیبراهیم مەردۆخی بۆ ساڵی ١٩٦٠ ئەگەڕێتەوە. لە وانەشە

ئەم بابەتە هەندێ جێگای سەرنج و گومان بێت و بە قسەیەکی زل بدرێتە قەڵەم و لە قەوارەی منداڵێکی دە دوازدە ساڵانەدا نەگونجێ. بەڵام لە ڕاستیدا هەوێنی مێشک و بیری بە هۆی برای لە خۆی گەورەتر، شێخ عوسمانی مەردۆخی، شێخ ئەحمەدی مەردۆخی کانی میرانی شاعیر، ناسراو بە شەپۆل و مامۆستا مەلا عەلی لێوی(بیارە) گیرسا.

هەر لەو چرکەساتەوە خۆشەویستی گەل و نیشتمان و زمانە زگماکییەکەی و نووسین و خوێندنەوەی کوردی، ئاوێتەی بیر و هۆشی بوو. هەر ئەم دیاردەیەش بوو دوای چەند ساڵ مانەوە لە حوجرەکانی مەریواندا، بەرە و سلێمانی هەڵینا و لە ساڵی ١٩٦٨ لە «مەعهەددی ئیسلامی مزگەوتی گەورە» گیرساوە؛ درێژەی بە خوێندندا و هەر لەوێش دیپلۆمی عەرەبی وەرگرت. بەهاری ساڵی ١٩٧٦ بەرەو ئێران گەڕایەوە.

ساڵی ١٩٧٧ یەکێ بوو لە دامەزرێنەران و بەڕێوەبەرانی مەدرەسەی قورئانی مەریوان. لەو کاتەوە چالاکی خۆی دژی ڕژێمی پاشایەتی ئێران دەست پێکرد. بەشداری کردن لە خۆپیشاندان و مانگرتن و کۆبوونەوەکان هەندێک لەم چالاکییانەن. بە شوێن سەرکەوتنی شۆڕشی ١٩٧٩ ئیبراهیم مەردۆخی بەنوێنەرایەتی مەدرەسەی قورئان، ئەبێتە ئەندامی شۆرای گشتی شاری مەریوان. لە ئووتی ١٩٨٢دا لە شاری سنە گیراوە.

خۆی ئەڵێت: «پاش سێ چوار مانگ کوناوکون پێ کردن و هەڕەشە و گوڕەشە لێ کردن، چوار ساڵ زیندانیان بە سەردا سەپاندم. لە گەڵ هەندێ لە هاوبیرانمدا بەرەو بەندیخانەی تەورێز ڕاپێچ کراین. پاش سێ ساڵ و سێ مانگ و دوازدە ڕۆژ، قاپیە گەورەکەی بەندیخانە کرایەوە و جارێکی دی بە زێدی خۆشەویستی خۆمان شاد بوینەوە. کورد وتەنی نەخۆشینە کۆنەکە وەک ڕەگی گولی لێی هەڵدامەوە و سەر لە نوێ کەوتمەوە وتوویرە...[1]»

ئیبراهیم مەردۆخی لە ساڵی ١٩٧٩وە دەستی بە نووسین کردووە. هەوەڵین بەرهەمی لە گۆڤاری «زرێبار» و هەر لەم ساڵەدا بڵاو کرایەوە. لە ماوەی ئەم سی ساڵەدا زیاتر لە سی وتاری لە ڕۆژنامە و گۆڤار و ئەنتەرنێتدا بڵاو کردۆتەوە. لە کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا چالاکانە بەشداری کردووە. بەرهەمەکانی ناو براو لە ڕێی ئەم دەزگا

---

١. وتوویژ لەگەڵ نووسەر.

و چاپەمەنییانەوە گەیشتووەتە بەردەنگی خۆیان: ڕادیۆی سنە و ڕادیۆی کرماشان؛ حەوتەنامە و گۆڤارەکانی: بانگی حەق، ئاسۆ (گۆڤاری زانکۆی سەنعەتی ئیسفەهان)، ڕوانگە (گۆڤاری زانکۆی کوردستان)، و هاوار.

وەکوو کتێب ئەتوانین ئاماژە بە وەرگێڕانی قورئانی پیرۆز بکەین کە ئامادەی چاپە. ئێستاش خەریکە کار لە سەر کتێبێک ئەکات لە مەڕ مێژووی شار و ناوچەی مەریوان.

## ناسر حەیدەری کانی سانانی

کوڕی حەمەخان کوڕی مەحموود خانی کانی سانان و دایکی «تاووس» خاتوون کچی سلێمان خانی جافە. ساڵی ۱۹۴۸ی زایینی لە گوندی «شەیان»[1] لە ناوچەی شلێر لە کوردستانی ئێراق چاوی بە ژیان هەڵێناوە.

ئەم نووسەرە ئەڵێت[2]: «هەر لە کانی سانان چومە مەدرەسە. لە بیرمە بەشێک لە ماڵەکەی خۆمان بۆ مەدرەسە و ماڵی ماموستا تەرخان کردبوو. ئەو شوێنە لە مێژەوە مەدرەسەی تێدا بوو[3]. یەکەم مامۆستام پیاوێکی قسەخۆشی خاوەن هەستی شێعری سنەیی بوو بە نێوی ئاغای «هوشیار». من کە کوڕی سەرۆک عەشیرەی حەیدەری بووم، وەک قوتابیەکانی تر سەیری

---

۱. لە دوای کۆچی دوایی خوالێخۆشبوو مەحموودخانی کانی سانان لە ساڵی ۱۹۴۱ لە زیندانی «قەسری قاجار»ی تاراندا، حەمەخانی کوڕی ئەکەوێتە ژێر زەبر و زەنگ و موڵک و ماڵی لێزەوت ئەکرێت. حەمەخان کە خوێنەواری ئاکادمیای نیزامی لە تاران بووە، لە گەڵ پتر لە ۷۰ کەس لە هاوڕێیانی لە مەریوان، لە سەر بانگهێشتی قازی محەممەد ئەڕواتە مەهاباد و تێکەڵ بەو شۆڕشە ئەبێت و پلەی سەرهەنگی پێ ئەبەخشرێت. پێش لە هاتنی سوپای نیزامی و هەرەس هێنانی کۆماری کوردستان، لەسەر پێشنیاری پێشەوا قازی، مەهاباد بەجێدێڵێت. ئەچێتە «مێشیاو»و بە هۆی ڕاوەدونانی دەوڵەتی ئێراقەوە، ئەوێش بە جێدێڵێت و ئەڕواتە «شەیان»و پەنا ئەبا بۆ شێخ مەحموودی نەمر و لای شێخ دائەنیشێت. بە تاوانی بەشداری چالاکانە لە کۆماری کوردستاندا، بە شێوەی غیابی بڕیاری لە سێدارەدانی لە لایەن حکومەتی ئێرانەوە بۆ دەر ئەچێت. پاش ساڵێک لە لایەن «سپەهبود ڕزم ئارا»وە ئەو بڕیارە هەڵئەوشێتەوە و بەم جۆرە ئەگەڕێتەوە زێدەکەی خۆی کانی سانان.

۲. وت و وێژ لە گەڵ نووسەر.

۳. یەکەم خوێندنگا لە مەریوان لە ساڵی ۱۹۲۶ لەو شوێنەدا، لە سەر خواست و ویستی خوالێخۆشبوو مەحموودخانی کانی سانان دائەمەزرێت. پاش گرتن و دوورخستنەوەی سەرۆک عەشیرەکانی کوردستان لە ساڵی ۱۹۳۰و۱۹۳۱ لە لایەن حکومەتی ڕەزاشاوە، ئەو قوتابخانەش دائەخرێت. ساڵی ۱۹۵۴دیسان دائەمەزرێتەوە.

ئەکردم. باوکم خوێنەوار بوو و بایەخی بە زانست ئەدا. لەو سەردەمەدا کتێبخانەیەکی بچکۆلەمان هەبوو، من و دوو خوشکەکەمی بۆ خوێندن هان ئەدا و لێپرسینەوەی لێئەکردین. دوای تاقیکارییەکی گشتی کە لە شاری مەریوان بەڕێوە چوو، خوێندنی سەرەتاییم تەواو کرد و چوینە قۆناغی دواتری خوێندن کە لەو کاتەدا(١٩٦٠) پێیان ئەوت «سیکلی ئەوەڵی دەبیرستان» لە دەبیرستانی فەرۆخی مەریوان. من سەرجەم سێ ساڵ لە مەریوان دەرسم خوێند و ساڵی ١٩٦٣پلەی یەکەمی ناوەندیم تەواو کرد. لە پاییزی ئەو ساڵەدا بۆ درێژەدا بە خوێندن چومە شاری سنە و لە دەبیرستان ڕازی لە «رشتەی طبیعی» دیپلۆمم وەرگرت. ساڵی ١٩٦٦ لە بواری زانستە کۆمەڵایەتیەکان لە «زانکۆی میللی تاران» درێژەم بە خوێندن دا. ساڵی ١٩٧١ بەکالۆریۆسم وەرگرت. پاش تەواو کردنی سەربازی، لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن کە ئەیویست لە مەریواندا ئیزگەیەك بکاتەوە، دامەزرام. لە بەهاری ساڵی ١٩٧٤دا لە سنە دەستم بەکار کرد. دواتر ڕەوانەی مەریوان کرامەوە و کاری ئیداریم تا ساڵی ١٩٨٠ بەردەوام بوو. دوای ماوەیەك لە سەر کارلابرام و دواتر بانگهێشت کرامەوەو ساڵی ١٩٩٧ خانە نشین بووم».

ئەم نووسەرە، نووسراوەکانی کە بریتین لە بابەتی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و مێژوویی، لە ڕۆژنامە و گۆڤار و سایتەکاندا بڵاو ئەکاتەوە. لە بواری شێعر و هەڵبەستدا چالاکی ئەنوێنێت و بەرهەمی ڕەنجی لەم بوارەدا کۆمەڵە شێعرێکە. نازناوی شێعری «غەریب»ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە. خۆی ئەڵێت: «سێ هاندەری سەرەکیم بۆ چوونە ناو بواری نووسین هەبوو. یەکەم هاندانی خوالێخۆشبووی باوکم، دووهەم بوونی کتێبخانەکەی ماڵی خۆمان لە کانی سانان، سێهەم لە سەردەمی منداڵییەوە هەر شێعرێکم پێ جوان ببوایەت لە دەفتەرێکدا ئەم نووسیەوە و لای خۆن هەڵم ئەگرت. ئەو دەفتەرە کۆکراوەیە، لە گەڵ حەز و ویستی خۆمدا بوو بە هەوێنێك بۆ دەر بڕینی هەستی شێعریم».

**«دونیای خەیاڵ»**

ئـــازیز خـــاڵییە، ئـــازیز خـــاڵییە

دونیـــام وە بـــێ تـــۆ، ئـــازیز خـــاڵییە

سەر بە سەودای تۆم، وەیلان و پەشێو
بۆ هەرلا ئەچم، بێ تۆ خاڵییە
شەوان تا سەحەر، هەزارە ئەکەم
هەر کوێ ئەگەڕێم، لە تۆ خاڵییە
بە ڕۆژ چوون مەجنوون، هەردەگێڵم من
گێڵیانم بێ خێر، جێگەت خاڵییە
مەریوان بێ ڕەنگ لە سەوزەی بالآت
هەروەک بیابان بۆ من خاڵییە
سنە سەیرانگای تۆ بوو ئازیزم
ئێستە سەیرانگات بۆ من خاڵییە
بێ نەشئەی نیشات لەقای سیمای تۆ
زەوق بێ ڕەونەق لە شەوق خاڵییە
بێ نیگای پڕ هەست ئەلەستی مەستت
مەیخانان بۆ من لە مەی خاڵییە
بێ جام جەمین جلوە ئارای تۆ
مینام شکستە، جامم خاڵییە
بێ تەنین سەدای، دڵ نشینی تۆ
دونیام لە نەغمە و نەوا خاڵییە
بێ ئالآی بالآی مەردانەکەی تۆ
ئالآم یەکالآ، مەیدان خاڵییە
دات لە شەقەی باڵ بۆ مەودای خەیاڵ
هەی داد هەی بێداد هێلان خاڵییە
یاران، یاوەران یەکیان گرتەوە
لە ناو کۆڕیانا، جێگەت خاڵییە
خەیاڵ وەخولیای تۆ خەملاوە خەم
خاتر پڕ ماتەم لە هەست خاڵییە
بە فەسڵت ئەی گوڵ «غەریب» غەرقی غەم
چوار فەسڵەی حەزان، لە گوڵ خاڵییە

## محەممەد یۆسف ڕەهنموون

ئەم شاعیرە ساڵی ١٩٥٠ی زایینی لە گوندی «ساداوا[1]»ی مەریوان لە بنەماڵەیەکی زانست پەروەر و ئایینی چاوی بە ژیان هەڵێناوە و نازناوی شێعری «کۆچەر»ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە.

دایکی زوبەیدە خاتوون لە سەیدەکانی بێلوو و باوکی حاجی مەلا سەعیدە کە مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس لە کتێبی «علمائُنا فی الخدمةِ العلم و الدین» دا باسی زانایی و لێهاتوویی ئەم بەڕێزەی کردووە.

مامۆستا محەممەد یۆسف لە لای باوکی خوێندن بە قورئانی پیرۆز و گوڵستان و بوستان و کەلیلە و دیمنەوە و ... دەست پێئەکات و بۆ درێژەدان بە خوێندن و پاراو بوون لە کانیاوی زانست لە خزمەت ئەم بەڕێزانەدا بووە: مامۆستا مەلا زاهیدی مووسکی، مەلا محەممەدی خوداجو باشماخ، مامۆستا سەید مەجیدی شانەدەری، مامۆستا سەید ئەحمەدی بانی بنۆک، مامۆستا مەلا عەبدوڵلای بایەوە، مامۆستا مەلا مەحموودی سیاناو، مامۆستا مەلا محەممەدی مل چەوری بەردەڕەشە و مامۆستا مەلامحەممەد ئەمینی کانی سانان کە زۆربەی کتێبە گرینگەکانی لە خزمەت ئەم زانایەدا خوێندووە.

ساڵی ١٩٧٠ی زایینی لە تاقیکردنەوەی مەعهەدی هەڵبجەدا بەشداری ئەکات و بڕوانامەی بەکالۆریۆسی پێ ئەبەخشرێ و لە ساڵی ٢٠٠٦ لە ئێران بەکالۆریۆسی دووهەمی وەرئەگرێت.

بە واتای مامۆستا ڕەهنموون لە درێژەی ژیانیدا ئەوەندە ئەم دیو و ئەو دیوی کوردستانی کردووە کە خۆیشی بۆی ساخ نابێتەوە خەڵکی کام لایە. خۆی ئەڵێ: «ئەوەندە ئەم شار و ئەو شار و ئەم گوند و ئەو گوندم کردووە کە تا چێشتی مجێوری مامۆستا هەژار و ئاڵەکۆکی مام غەنیم نەخوێندبۆوە، وام ئەزانی تەنیا من دەربەدەر بووم کە تا ئێستا چل و یەک جار کۆچم کردووە.»

بۆ مەلایەتی ئەم شوێنانە گەڕاوە: قاینەجەی شارەزوور، پێنجوێن، سەید سادق،

---

١. کورت کراوەی سەعید ئاوا.

سلێمانی، سنه و مەریوان.

هۆنراوەکانی کەڵە شاعیرانی نەتەوەی کورد وەک قانع، مەولەوی، ناری، نالی، مەحوی و شەپۆل، کانیاوی بیر و هەستیان تەقاندووە و بەرە و سارای ئەدەب و هۆنراوە هانیانداوە و بە واتای خۆی خۆشترین کات و سات بۆی، بینین و بیستنی هۆنراوەی پڕ ماناو واتایە. هۆنراوەی بە زمانی کوردی و فارسی و عەرەبی لە بابەت گەلی ئەوینداری و کۆمەڵایەتی و نیشتمانیدا هۆنیوەتەوە کە وەک جگەرگۆشەی خۆشیانی ئەویێ و ئەڵێ:

لەجگەر گۆشەی شێعرم مەدە مەعنای خراپ

بە سەبەب کەس نیە ڕازی کە لە ئەولادی درێ[1]

ئەم زانا بەڕێزە بێجگە لە نووسین و هۆنینەوەی شێعر و بوونی دەفتەرێکی شێعر و نووسینی ژیانی پێغەمبەری ئیسلام(د.خ) بە کوردی و بە شێعر، چەند خزمەتی بەرچاو و گەورەی لە بواری فەرهەنگ و ئەدەبدا بە گەلی کورد کردووە کە جێگای ڕێز و پێزانینە:

١ـ پاراستن و لە فەوتان ڕزگار کردنی دیوانی مامۆستا شەپۆل بەو شێوەی کە خۆی باسی ئەکات[2]:

«مامۆستا شەپۆل(مامۆستا شێخ ئەحمەدی کانی میران) لە گەڵ دایکم پێوەندیی بنەماڵەییان بووە و دراوسێ دێشمان بووە(کانی میران و ساداوا) زۆر ئاشنایەتیم لە خزمەتیدا هەبوو، خولیای شێعر و هۆنراوەی بووم. لە دوای کۆچی مامۆستا لە بالک، بۆ بژێوی کچەکانی ـ کە برایان نەبوو ـ کتێبەکانی هەڕاج ئەکرێ، مامۆستا عەزیزی «نەچێ» کە لە کانی سانان فەقێ بووین دوو کتێبی زۆر باشیان لێ ئەکڕێ. یەکەم دیوانە دەس نووسەکەی مامۆستا شەپۆل کە بە خەتێکی زۆرجوان و خۆش نووسرا بوو ئەویتریش باشترین دیوانی مامۆستا ناری بوو.

من زۆر خولیای شێعرەکانی مامۆستا شەپۆل بووم و ئەترسام شێعرەکانیم لێ دوور کەوێتەوە، چونکوو مامۆستا عەزیز نزیکی تەواو بوونی دەرسی فەقێیەتی بوو بە فرسەتم زانی، بۆی دانیشتم و لە سەرەتاوە تا دوا دێڕی شێعرەکانم نووسییەوە.

---

١. ئەم بەیتە لە نالی یە.

٢. وتووێژ لەگەڵ نووسەر.

ماموستا عەزیز خوێندنی لەوێ تەواو بوو. کابرایەک بە نێوی سەید محەمەد ئەمین کە لە بەر فڕ و فێڵ و لاری لە ناو خەڵکدا بە «ابن الشیطان» ناوی لێ ئەبرا، بە بیانووی لە چاپدانی بە بێ هیچ بەرانبەر و بەڵگەیەک دیوانەکە ئەبات و زۆر چەواشەکاری و تەحریفی تێدا درووست ئەکات. بۆ وێنە لە دیوانەکەی ماموستا ناریشدا چەندە «ناری» ڕق و کینەی لە شا و بنەماڵەی پەهلەوی بوو ئەیگۆڕێت و بە بنامەڵەی پەهلەویدا هەڵ ئەخوێنێت و زۆر نارێک لە چاپی ئەدات و دیوانەکەی شەپۆلیش ئەفەوتێنێ.

ئەو نوسخەی کە نووسیبوومەوە لای من مایەوە. وابزانم کاک عەلی ڕەحمانیش فتۆکۆپییەکی لە نوسخەکی من گرتبوو. بەو جۆرە لە فەوتان ڕزگارم کرد.

کاتێک لە کۆڕی ڕێزگرتنیدا ماموستا «مەلا محەممەدی جەوانڕوودی» باسی چۆنییەتی فەوتانی دیوانەکەی ماموستا شەپۆلی لە وتارێکدا کرد، دوای ئەو منیش باسی چۆنییەتی نەفەوتانیم بۆ دانیشتوان کرد. دیوانەکە بە هاوکاری کاک مەحموود مەحموودی ئامادەی چاپ کرا. نازانم بۆ لای ئەو ماوەتەوە و هێشتا لە چاپ نەدراوە.»

٢ـ کۆکردنەوە و پێداچوونەوەی شێعرەکانی «محەممەد عەلی خەم فرۆش» کە چەند جار لەگەڵ خەم فرۆشیشدا پێیدا ئەچێتەوە و پێشەکی بۆ نووسیوە.

بەشداری کردن لە چەندین کۆڕ و کۆبوونەوەی گەورە و خوێندنەوەی وتار وەک : کۆنگرەی ماموستا قانع لە مەریوان، کۆڕی ڕێزگرتن لە ماموستا ناری لە مەریوان، کۆڕی ڕێزگرتن لە ماموستا شەپۆل لە مەریوان و ...

**«نیگاری نازەنین هات»**

به حەمدی لـلا نیگاری نازەنین هات
سروری قەلبی زار و ماتەمین هات

بە بالای هەروەکوو سەروی خەرامان
کەهات لام وام بوو عەینەن یەومی دین هات

بە داوی زوڵفی شەوڕەنگی بەقینە
لە بۆ غارەتگەری ئەهلی زەمین هات

بە ڕەنگــــی تاووســــی و دەنگــــی قــــومری
بە شــەوق و پــڕتەوی نــووری جەبــین هــات
بە شــیری ئەبــــروان و تیــــری برژانــــگ
دەڵــێن بــۆ قەتــڵ و ســینە هەڵــدڕین هــات
بە کــــوڵمی وەک گـــــوڵی نەرم و لەتیفــــۆ
بە خــاڵی ســوور و زەرد و ســەوز و شــین هــات
بە غــــــونچەی دەم نەداوەی لێوەکــــــانی
بە عەینــی کــانی شــەکر و ئەنگبــین هــات
بە تیــری چــاوی لەت بــوو جەرگ و ســینەم
بە وەش ڕازی نەبــوو بــۆ ســەلبی دیــن هــات
لە حەســـرەت بــــاخی ڕوخــساری جــوانی
خەزان کەوتە گــــوڵان و هەڵــــوەرین هــــات
نەوەک شــــاد بــــبم تــــۆزێ بە وەســــڵی
ڕەقیبــی ســەگ ســفەت بــۆ هەڵــوەڕین هــات
کە زوڵــــف و ڕوومەتــــی دەرکەوت لە دوورۆ
عەجەب مــاوم کە شــەو بــۆ ڕۆژ قەریــن هــات
نە تەنیــا شــێت و شــەیدای تــۆ ئەمــن بــووم
بە شــــێتی ســــەد هەزاری وردە بــــین هــــات
لە بــــۆ کەوتــــن لە ڕێبــــازی ئەوینــــا
وەکــوو زوڵفــت ســەرم بــۆ ســەر زەمــین هــات
ئەمەش ئێعجــــازی بــــاڵای شــــەنگی تــــۆیە
کە عەقــڵ و شــێعر و هەســتم زۆر بە تــین هــات
کە شــــانەی دا لە زوڵفــــی عەنبەرینــــی
لە ســەر عەرز بــۆنی فیردەوســی بەریــن هــات
ئەوەن بــــاری خەمــــی زۆرە لە سەرشــــان
لە بــۆ دڵ خەم لە بــۆ پــشتم چەمــین هــات

لە سەر کوێستانی خۆشیدا کەوی دڵ
کوت و پڕ تووشی شاباڵی شەهین هات
ڕوخی تۆ و زوان و چاوم زۆر عەجیبە
مەلیح هات و فەسیح هات و نمین هات
کە سۆفی دی لە تۆدا سڕی قودرەت
بەشۆر و شەوق و وەجد و هەڵپەڕین هات
لە حەسرەت لێو و کولمی تۆ و دڵی خۆم
لە چاوم خوێن بە هاژە و هەڵقولێن هات
بەشەر بووم و بەسەرهاتم بە سیلمۆ
بەشەڕهاتی لە گەڵما کاتێ شین هات
لە دەوری شەمعی ڕوخساری ئەبینی
کە پەروانە بە فەوج و تیپ و چین هات
لە گوڵزاری عوزاری بۆ گوڵی زار
هەزارێ هەر هوزاری دڵ خەمین هات
لە دەریایی تەبیعەت دووڕ و گەوهەر
گەلێ بوو چووم نەهەنگی خەم بە قین هات
لە هەر لا «کۆچەر»ی بێچارە دەرکەوت
ئەڵێن مەجنوونەکەی سەحرای ئەوین هات

## ئەحمەد ڕۆستەمی

مامۆستا مەلا ئەحمەد، کوڕی مەلاحەسەن ساڵی ١٩٥١ی زایینی لەگوندی «دەرەکێ» لە دایک بووە. لە تەمەنی شەش ساڵیدا ناردوویانەتە حوجرەی فەقێیان و فێری قورئان و کتێبە سەرەتاییەکانی ئەو سەردەمە بووە. بۆ بەدەست هێنانی زانستی زۆرتر زێدی خۆی بە جێ هێشتووە و ڕووی لە گوندەکانی دەوروبەری شاری مەریوان کردووە و ساڵی ١٩٧٦ لە خزمەتی عالمی زانا و گەورە، خوالێخۆشبوو «مامۆستا محەممەد ئەمینی عالی»، ئیجازەی مامۆستایی وەرگرتووە. بۆ

پەرە پێـــدان بە زانـــستی خـــۆی ســـەردەمانێکیش لە خرمەتـــی «شـــێخ عوســـمانی سێڕاجەددینی» (موریدی ڕێبـازی نەقـشبەندی) و مامۆسـتا «سـەید عەتـای چۆڕی»دا چـۆکی فەقێیەتـی داداوە. لەسـەر داوای مامۆسـتا و خەڵکـی گونـدی دەگاشـێخان و ئیجازەی مامۆستا محەممەد ئەمین عالی، ئەبێ بە پێش نـوێژی مزگەوتـی ئەوگونـدە. دواتـر بە هاوکـاری خەڵـک قووتابخـانەیەکی ئـایینی دائەمەزرێـنن و بە هاوکـاری خوالێخۆشبوو مامۆستا «سەید عەتای چۆڕی» دەست بەوانە وتنەوە دەکات. ئیجـازەی مامۆسـتایی بە زۆر فەقـێ داوە. لە دوای بیـست سـاڵ نیشتەجێ بـوون لە دەگاشـێخان هاتووەتە شاری مەریوان.

**بەرهەمەکانی ئەم نووسەرە:**

١ـ بورهانی لاوان. ٢ـ تەڵاقی سەلاسە. ٣ـ تەوحید. ٤ـ مەحەببەتی پێغەمبەر(د.خ).
٥ ـ ڕیبا و سوو. ٦ ـ ئادابی حەج. ٧ـ وەسییەتنامە بۆ فەقێکان. ٨ ـ ڕیسالەی بینینی مانگ.

**مامۆستا لەتیف ڕەحیمی**

مامۆسـتا لەتیـف کـوڕی مەلا عەلـی کـوڕی عەبـدوڵڵای سەفاخانەی هەوشارە. ساڵی ١٩٥١ی زایینی لە گونـدی «بـارام ئاوا» لە بنەماڵەیەکی ئایینی چاوی بە ژیان هەڵێناوە.

دوای تێـپەڕ بـوونی بەهارێـک بە سـەر ژیانیـدا، وێـڕای بنەماڵەکەی ڕوو لە گوندی قەڵاگا ئەکەن. خوێندنی بە قورئان و کتێـبە وردەکـانی ئەو سـەردەمەوە لە لای بـاوکی دەسـت پێئەکات. دواتر لە خزمەتی ئەم مامۆستایانەدا درێژە بە خوێندن ئەدات: مامۆستا عەلـی سەعادەتی(هەوشاری)، مامۆستا مەحموودی مودەڕیس(کاڵی)، مامۆستا سـەید عەلـی خالیدی (نێ)، مامۆستا ڕەحیمی شەریف(شارانەیی)، مامۆسـتا ئەحـمەد(دەرەمەری) و ساڵی ١٩٧٦ لە گوندی چۆڕ لە سەر دەستی مامۆسـتا سـەید عەتـای چۆڕی ئیجـازەی مامۆستایەتی وەرئەگرێت. لەو سـەردەمانەوە ئەگەڕێتەوە «قەڵاگا»و وەک وانەبێـژ و پێش نوێژی مزگەوتی ئەو گوندە دائەنیشێت.

ئەم مامۆستایە وێڕای خزمەت لە بواری ئایین و زانستدا، خـاوەنی بەهـرەی خەت خۆشییە و لە بواری وێژە و ئەدەبیشدا، دەستێکی توانای هەیە. بە دوو زمانی کوردی و

فارسـی و بە دوو شـێوەی کلاسـیک و نـویێ شـێعر ئەهـۆنێتەوە و بەرهەمـی ڕەنـج و تێکۆشانی دوو کۆمەڵە شێعرە کە لە بەر باری نالەباری ژیان و دەسـت کـورتی بـۆی نەلواوە چاپ و بڵاویان بکاتەوە.

**«لە خەڵوەی ئەشق»**

لە مێژە من لە تەکییەی ئەشقی تۆدا
لە سەر بەرماڵی شەو
بەرەو مێحرابی ئەبرۆی کەعبەی چاوت خەریک سوجدەم
ئەوا بەرماڵەکە کوون بوو
واشوێنی سوجدەگا شڕ بوو
ئەزانی چی عەزیزی من؟!
لە یەلدای پرچی سەر شانت
بە درێژایی «گردەڵانی» ئاخی من
ببڕە
هەتا بیکەم بە تارو پۆی

**ئەحمەد قازی زادە**

١١ی ژوئـیەی سـاڵی ١٩٥٢ی زایینـی لە بنەمـاڵەیەکی مـام ناوەنـدی لە گونـدی ڕەزاو چـاوی بە ژیـان هەڵێنـاوە. قۆتـاغی سـەرەتایی خوێنـدن لە زێـدەکەی خـۆی دەسـت پێئەکـات و بـۆ درێژەدان بە خوێندن ئەڕواتە شاری سنە و قۆناغی دوا ناوەندی لە و شـارە تەواو ئەکـات. لەو سـەردەمەدا گۆڤـارێکی بیر کـاری ـ زانستی بە نێوی «یکان» لە ئێراندا دەرئەچێت کە بە هێنانە گۆڕی پرسیاری بیرکاری، ئەو کەسـانەی کە وڵامـی دروسـتیان داوەتەوە نێویـانی وەک قوتـابی چـالاک بـاس لێکـردووە و چـاپی کـردون هەر ئەمە لە گەڵ بـوونی بـاوکێکی ژیـر و تێگەیـشتوو مامۆسـتایەکی دڵسۆزی بیرکـاریش بە نێـوی ئاغـای «موحـسین حیـسامە ددینـی» بـۆ خۆێندن و بڕینی پلەکانی زانست هانی ئەدەن.

ساڵی ١٩٦٦ بۆ بەشی بیرکاری زانکۆی تاران بە پلەی چوارەمی ئێرانەوە قبوولْ ئەبێت. هاوکات لە گەڵ ئەمەش بۆ ئەندازیاری زانستاگای «ئاریامێهر»ی ئەو دەمە وەرئەگیرت کە بە هۆی زۆر بوونی پووڵی خوێندن (دوو هەزار تمەن) ناتوانێ بچێت و وازی لێدێنێت. بۆ وەدەست هێنانی بژێوی خۆی لەو کاتەدا کە لە زانکۆی تاران دەرسی خوێندووە هاوکاتیش لە قوتابخانەکانی تاراندا وانەی وتووەتەوە. ساڵی ١٩٧٨ ژیانی هاوبەشی پێک دێنێت.

لە دوای وەرگرتنی بەکالۆریۆس، لە ساڵی ١٩٧٩دا بە پلەی دووهەم بۆ زانکۆی تاران بۆ ماستەر لە بەشی ژمێرکۆدا سەر ئەکەوێت و ئەبێ بە قوتابی مامۆستای گەورەی ژمێرکۆی ئێران بەڕێز دوکتور «غوڵام حسێنی مەساحەب» کە یەکێ بووە لە قوتابییەکانی «برتراند راسل»ی بە ناوبانگ.

تینوویەتی زانست و فێر بوون دیسان بەرەو کانیاوی زانستگاکان هانی ئەدات و ناسرەوێ تا ئەوەی کە لە ساڵی١٩٩١ بە پلەی سێهەمەوە بۆ قۆناغی PHD (دوکتۆرا)ی «زانکۆی برۆکسل» لە وڵاتی بلژیک وەرئەگیرێت. لە دوای وەرگرتنی دوکتورا بە بیرێکی زانستی قووڵەوە ئەگەڕێتەوە ئێران و وەک مامۆستای ژمێرکۆ لە زانستگاکاندا وانە ئەڵێتەوە.

جێگای ئاماژەیە ئەم نووسەرە یەکەمین کەسە کە پلەی زانستی دانشیاری لە زانکۆی زانستە پزشکیەکانی کوردستان(دانشیار دانشگاه علوم پزشکی کردستان) بە دەست هێناوە و هەنووکەش دانیشتووی شاری سنەیە. ئەم مامۆستا لە گەڵ وانە وتنەوە و دەرس خوێندندا بە گەرمی خەریکی نووسین و لێکۆڵینەوە بووە کە کارنامەیەکی پڕ لە چالاکی زانستی هەیە.

**ئەمانەش بەشێکن لە چالاکیە فەرهەنگی و زانستیەکانی:**

١ـ جمعیت شناسی در پزشکی، یەکەمین کتێب لەم بابەتە کە لە ئێراندا چاپ و بڵاو بووەتەوە.

٢ـ جمعیت شناسی تحلیلی وتنظیم خانواده، چاپ و بڵاو بووەتەوە.

٣ـ وەرگێڕانی چوارده کتێب و پەرتووک بۆ سەر زمانی فارسی لە ئینگلیزییەوە کە بەشێکیان چاپ کراون و بەشێکی تریان ئامادەی چاپن.

٤ـ نووسین و بڵاوکردنەوەی بیست وتاری زانستی لە گۆڤارە زانستی و

پزشکییەکانی ناو خۆی ئێراندا وەک: «بهداشت ایران»، «تنظیم خانواده»، «اندیشه رفتار»، «علمی ترویجی» و «یکان».

٥ـ نووسین و بڵاوکردنەوەی پێنج وتاری زانستی ـ تەندروستی لە گۆڤاری نێونەتەوەیی ڕێکخراوەی بێهداشتی جیهانی(سازمان بهداشت جهانی).

بەشداری لە سێ کۆنگرەی نێونەتەوەیی و چواردە کۆنگرەی ناوخۆدا.

## شەمسەددین فەتاحی (دواکەوتوو)

ساڵی ١٩٥٢ی زایینی لە گوندی «شێخ شەربەتی» مەریوان لە بنەماڵەیەکی ئایینی چاوی بە ژیان هەڵێناوە. باوکی حاجی عەلی محەممەد و دایکی فاتمە خاتوونە.

لەتەمەنی هەشت ساڵاندا ئەنرێتە بەرخوێندن و سەرەتای خوێندنی بە قورئانی پیرۆز و کتێبە ئایینییەکانەوە دەست پێ‌ئەکات. دوو ساڵ پاش دەست پێکردنی خوێندنی، دوو کارەساتی ناخۆش ڕەوتی خوێندنی ئەشێوێنن و بۆ ماوەیەک لە خوێندن دووری ئەخەنەوە، کۆچی دایکی و دوومانگ دواتر کۆچی مامۆستاکەی.

وەک نەریتی فەقێی کورد بۆ خوێندن و فێر بوون زۆر شوێن گەڕاوە: پیرخزران، قەتەون، وەنێنە، بەرقەڵا، بالک و کانی سانان و خوردە لۆکێ.

لە سەردەمی خوێندنیدا لە کانیاوی زانستی ئەم بەڕێزانە چێژی بردووە؛ مەلا مەحموودی پیرخزران، مەلا تۆفیق سالحی، مەلا محەممەد چاڵی سووری، مەلا محەممەد ئەمین دەروێشانی، مەلامحەممەد کۆماسی، مەلا ڕەحیم بەرقەڵا، مامۆستا باقری بالک و مامۆستا محەممەد ئەمین عالی. ساڵی ١٩٧٠ لە سەردەستی «مەلا عوبەیدوڵڵای خوردەلۆکێ» ئیجازەی مامۆستایەتی پێئەدرێت. ساڵی ١٩٧٩ دیپلۆمی زانستە مرۆییەکان (علوم انسانی) لە قوتابخانەی فەرۆخی مەریوان ئەگرێت. چەند ساڵێک وەک مامۆستای قوتابخانەکانی دایەرەی پەروەردە و بارهێنانی مەریوان خزمەت بە منداڵانی گەلەکەی ئەکات. ساڵی ١٩٨٥ ئەم شوێنە بە جێ دێڵێت و لە دایەرەی پۆستی شاری مەریوان دائەمەزرێت. دوای یازدە ساڵ خزمەت لەو شوێنەش دەرئەکرێت. لە ڕێگای دووکانداریەوە بژێوی ژیانی دابین ئەکات و ساڵی ٢٠٠٢

دەگەڕێتەوە زێدەکەی خۆی واتە شێخ شەربەتی.

سەرەتای نووسینی شێعری ئەگەڕێتەوە بۆساڵەکانی ٥٠ و لە بواری ئایینی و کۆمەلآیەتی و ڕامیاریدا حەوت هەزار بەیت شێعری هۆنیوەتەوە و نازناوی«دواکەوتوو»ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە. بە واتای خۆی: «لە سەردەمی ئەم نووسینانەمدا زۆر جار دڵسارد و نائومێدیان کردووم بەڵام کۆڵم نەداوە و کۆڵیش نادەم.»

بە ناوی خوای تەوانا و عادڵ
بێزار لە بیر و بۆچوونی باتڵ
لاڕەیب ئەحەد قەت نابێت بە دوو
موبەڕڕا لە عەیب هەمیشە زیندوو
ناوت سەر لەوحە و تەکیەگای کەلام
لە سەر موحەممەد سەلات و سەلام
هەروەها لە سەر گشت ئەو کەسانە
ڕێڕەوی ڕێگای شاهی مەردانە
یاران موژدە بێت جەژنی مەولوودە
جەژنی پیرۆزی سوپای مەحموودە
با نەڵێت پێمان سەحبانی عەرەب
لە کوردستانی پڕ عەقڵ و ئەدەب
بە کوردی نایکەن مەدحی موحەممەد
هەزاران سەڵوات بۆ ڕۆحی ئەحمەد
ڕەبیع دڵان ڕەبیعول ئەوەل
شەوی هاتنی موستەفای مورسەل
بەرزە لای یاران یادی ئەم لەیلە
دڵ بڕواداران لە شادی کەیلە

پیــرۆز بێــت مەولــوود لە ئیــسلام دۆســتان

لە ســـەرتا ســـەری گەلـــی کوردســـتان

ســـەڵواتێک ســـافتر لە تیـــشکی هەتـــاو

لە ســـەر مـــوحەممەد عەزیزتـــر لە چـــاو

شـــەوی بە نرخـــی دووازدە مەولـــوو

لە خێـــر و ڕەحـــمەت ســـەرزەوی پـــڕ بـــوو

ڕووا گـــوڵاڵەی ئـــازادی و ســـروور

ســـەلات و ســـەلام بـــێ حەد و ســـنوور

گەلـــی کـــورد هەمـــوو دروشـــت و وردی

پێـــشکەشت ئەکەن بە زمـــانی کـــوردی

هەزاران ســـــەلام هەزاران ســـــەڵوات

هەتـــا گەلـــی کـــورد ئەگـــات بە ئـــاوات

**محەممەد فەهیم**

کوڕی مامۆستا حەیدەری فەهیم، ساڵی ١٩٥٢ی زایینی لە ئاوایی «ئەوێهەنـگ» سـەر بە نـاوچەی ژاوەرۆ لە بنەمـاڵەیەکی ئایینیدا هاتووەتە دنیا. لە دوای قۆناغی سـەرەتایی لە گونـدی ئەوێهەنـگ، لە خزمەتـی باوکیـدا دەرسـی عەربـی دەسـت پێ ئەکات و بۆ فێر بوونی زیاتر ئەینێرنە گوندی سەراو قامیشی سنە بۆ چێژ وەرگـرتن لە وانەکانی مامۆستای زانـا و پـایەبەرز مەلا فەیـزوڵڵای بێساراني. دواتـریش ئەچێتە مەدرەسەی زانستە ئایینییەکانی سنە و تا ساڵی ١٩٧١ لە وێ ئەمێنێتەوە.

لەو ساڵەدا لە ئێزگەی کوردی سنە وەک بێژەر و وەرگێـڕی بەشـی هەورامـی کە نیو کاتژمێر بەرنامە بـڵاو ئەکـاتەوە دائەمەزرێ. دوای دامەزرانـدی ڕادیـۆ مەریـوان لە ساڵی ١٩٧٣دا کاک محەممەد بۆ مەریوان ڕائەگوێزرێت. لەو دەمەدا ڕادیـۆ مەریـوان ڕۆژانە دوو کاتژمێر بەرنامەی بڵاو کردووەتەوە.

ساڵی ١٩٧١ لە گەڵ «مریەم خانمی» کچی نووسەر و زانـای گەورە خوالێخۆشبوو

میرزا عەبدوڵڵای ئەقدەسی ژیانی هاوبەش پێک دێنێت و بەرهەمی ئەو ژیانەش دوو کوڕ و دوو کچە.

تا ساڵی ١٩٧٩وەک نووسەر و بێژەر و وەرگێڕ ئەمێنێتەوە. پاشان بۆ ماوەی ساڵێک ئەینێرن بۆ ئێزگەی کوردی ڕادیۆ تاران و لە گەڵ زانای گەورە و بلیمەتی کورد «مامۆستا هەژار» ئاشنا ئەبێت.

دیسانەوە ئەینێرنەوە مەریوان و ئەبێ بە سەرپەرەستی ڕادیۆ. دوای ساڵێک ئەچێتەوە دەنگ و ڕەنگی سنە کە زۆر ناخایەنێت دەرئەکرێت و ساڵێکش ئەبێ بە میوانی گرتووخانەی تەوڕێزا! پاش ئازاد بوونی بۆ چەند ساڵێک ئەبێ بە تەلەفزیۆن ساز! دوای بە جێ هێشتنی ئەم پیشەیەش لە گەڵ کۆمپانیایەکی فەرهەنگیدا دەست بە کار ئەکات و بە خوێندنەوەی دیوانی شاعیرانی هەورامان بە شێوەی کاست و سی. دی. چالاکی فەرهەنگی خۆی درێژە پێ ئەدات. لە زۆربەی کۆنگرەکان کە بۆ شاعیران و مەشاهیری هەورامان ئەبەسرێت بە وتار و هۆنراوە بەشداری ئەکات. هەنووکەش لەگەڵ چەند مامۆستایەکی هەورامیدا لە ڕووی بەڵگە دەسنووسەکان خەریکی ڕاست کردنەوەی شێعرەکانی مەولەوین. بە مەبەستی ئەوە کە بیخەنە سەر تۆڕی ئینتەرنێت. تازەترین کاری ئەم بەڕێزە دوو سی. دی.یە کە کەوتووە بەردەستی هۆگرانی. ناو براو پیاوێکی قسەخۆش و نوکتەزانە و دەفتەرێکی شێعری ئامادە چاپە. ئێستاکەش دانیشتووی سنەیە.

**«پیاوی کزۆڵ»**

هەزار ئاخ و داخ پەی پیای کزۆڵی
پەی وەرچەم نەبیەی لالۆی شڕۆڵی
واتەو قانعی مامۆسای پیرم
شاعیری زانا؛ هەم ساحێب ویرم
«هەر جە ویرمەن تا وەڕۆی مەردەن
پەی مەرگی فەقیر کێ شیوەن کەردەن
یا کێ کۆر ناشەو عەیبو دارایە
یا گۆشش دارا پەی پا خەراویە»

هەرچەن مەزانـــۆ واتەو هەژاریـــن
ســۆمای بینـــایی گـــرد کـــوردەوارین
«کەســـیو فەقیـــری بە پیـــاو مەزانـــۆ
دایـــم جە یـــانەش پەپـــوو موانـــۆ
فەقیـــر لوقمـــان بـــۆ عـــالم و دانـــا
گێلـــو نەفـــامێ بە گەوجـــش زانـــا»
بەڵام خـــۆ پەی مـــن لالـــۆی دەس هـــاڵی
تـــۆ ڕەحمەتەنـــی و شـــنەو شـــەماڵی
کەم کەس مەزانـــۆ تـــۆ وەرو چێـــشی
بـــیەی گەمە جـــاڕ بێگـــانە و خوێـــشی
خۆتـــۆیچ تـــاوێنی هەر بە وەس وەســـە
بە ڕیـــا بـــازی و درۆ و دەلەســـــە
یـــا خەیـــر بە گیـــردای دەســـە و هەژاران
یـــا بە نـــۆکەری پەی تـــاوان بـــاران
بە قلـــیچکە لەقـــی و بە چڵکـــاو وەری
ســـەر و ســـامانی پەی وێـــت وەش کەری
تـــیکەی چەرب و نەرم بـــدەی کڵفەتـــت
هەتـــا پـــارێزیۆ ئـــاوڕوو حورمەتـــت
نەک وەرو نەبـــیەی وێـــنەی وەرگـــی هـــار
جە ڕۆزگـــــارت بەر بـــــارا دەمـــــار
عەینـو هەورێـشی هەر پەی وێـت ڕەمـای
تـــانجی ئاســـایی کەســـــی وەر نەدای
تـــۆ نەکەوتـــی جەنـــگ چەنـــی ئانیـــشا
نە تۆشـــــا دیە و نە مژناسیـــــــشا
نەبـــیەی ســـەرواز و ســـپای تـــاریکی
هەرچەن ژیوایچـــت کەوتەو بـــاریکی

تــۆ خــاس تــاوینی بە ســەهل و ئاســان
پــلە و پــایەت بــۆ جە لای ناکەســان
بەڵام کــێ دیەن جەکــام مــاواو کــۆ
پــاک و ناپــاکی ڕەفێقیــشا بــۆ
کــاکەی شــیرینم دڵــت تەنــگ نەبــۆ
هەرچەن زەمــانە گژیــان چەنــی تــۆ
ســفرەی شــەرەفت پەڕ جە گەوهەرەن
بــاوەکو ژیوایــت جەبەد بەد تەرەن

## مامۆستا بورهان عالی

بورهان عالی کوڕی مامۆستای پایەبەرز «محەمەدئەمین عالی» و دایکی مەلێحا خاتوون کچی «باوەڕەحمانی چۆڕ»ە. بەهاری ساڵی ١٩٥٣ی زایینی لە گوندی کانی سانان چاوی بە ژیان هەڵێناوە. خوێندنی بە قورئان و کتێبە سەرتاییەکانی ئەو سەردەمە لە لای باوکیدا دەست پێئەکات. تا وەرگرتنی ئێجازەی مامۆستایەتی لە ساڵی ١٩٧٢دا، هەر لە خزمەتی باوکیدا ئەمێنێتەوە و لە باخچەی زانستی چێژی پێویست وەرئەگرێت. دوای تەواو بوونی شەڕی نێوان ئێران و ئێراق و ئاوەدان بوونەوەی شاری مەریوان، لە پەنای مامۆستایەتی و خزمەت لە بواری دایینداا، لە دایەرەی پەروەردە و بارهێنان دائەمەزرێت. ساڵی ١٩٩٧ هەواری ژیانی بۆ سنە ڕائەگوێزێت و وەک پێش نوێژ و وانەبێژی مزگەوتی ئاغەزەمانی ئەگیرسێتەوە. ساڵی ١٩٩٧ لە تاقیکاری مامۆستایانی ئایینی لە زانکۆی تاران بەشداری ئەکات و بڕوانامەی بەکالۆریۆس و ساڵی ٢٠٠١یش بڕوانامەی ماستەر وەرئەگرێت. ساڵی ١٩٩٨ لە سەر خواستی خەڵک ئەبێ بە مامۆستای مزگەوتی نووری گەڕەکی بەهاران و دواتر ئەچێتە مزگەوتی جامێعی ئەوگەڕەکە و تا دواساتەکانی ژیانی لەو مزگەوتە ئەمێنێتەوە. ساڵی ٢٠٠٩ لە لایەن چەند کەسێکی نەناسراوەوە ئەکەوێتە بەر دەستڕێژ و ماڵئاوایی لە ژیان ئەکات. ئەم مامۆستایە لە بواری نووسین و شێعردا دەستێکی کارای بوو و خاوەن کارنامەیەکی فەرهەنگیی ڕەنگینە.

**بڵاوکراوە:**

١ـ لێکۆڵینەوە و وەرگێڕانی کتێبی «لب الاصول». ٢ـ لێکۆڵینەوە و پێداچوونەوەی کتێبی «المنطق المهدوی »ی مامۆستا محەممەد باقر مودەڕیسی مەریوانی. ٣ـ تەڵقین و یاسین و ڕێوڕەسمی نوێژی مردوو. ٤ـ کۆمەڵە وتاری سەبارەت بە پێغەمبەری ئیسلام و سیستەمی حکوومەتی و ڕاڕەوە کردەوەییەکان.

**ئامادەی بڵاو بوونەوە:**

١ـ دیوانی شێعری «عالی».٢ـ مناسک حج و عمره.٣ـ احکام ذبح و شکار.٤ـ مناقب اهل بیت.٥ ـ شعر و موسیقی از دیدگاه اسلام.٦ ـ مولود نامه و میعراج نامه به کردی.٧ـ فن خطابه و سخنوری به عربی.٨ـ توسل و سفاعت و استمداد.٩ـ ارث در اسلام.١٠ـ فضایل جمعه و جماعت.

**«هۆنراوەیەک لە بارەی دیمەنی جوانی مەریوانەوە»**

مەریوانە مەکانی عیلمو دینە
مەریوانە ئەڵێی باخی بەرینە
لە ناو ئەم ناوچەیە گۆلی زرێبار
وەکوو پیرۆزە ڕەنگین و بەشینە
دوو چاوم شین ئەکاتْ وەک هەوری «ئەسحاب»
لە بۆ «میراجی» دڵ مات و حەزینە
فیدای گوڵ باخی سوور و شەستپەرت بم
وەنەوشەت لارەمل هەر وەک خەمینە
گوڵاڵەی دەشتی «دۆڵاشت» چە جوانە
بە ڕاستی مەرهەمی زام و برینە
«پژاوت» وا پژاوە ئاوی پاکی
لە بۆ «سیروان» ئەچێ هۆی سوود و ژینە
«قەڵە بەرد» هەڵ ئەدا بێ شەک لیواکەی
لە فەسڵی گوڵ بە دیمەن سەوز و شینە
لە پای بەفراو ئەڵێن سوورە هەڵاڵە
ئەخێزێت هەر وەکوو چاو پڕ گرینە

لە هاژەی قەڵبەزە و کانیاوی تازە
دڵی عالەم ئەبزوێ و دوور لە قینە
لە بەر سەیر و سەفای «گۆلبەن» بە جارێ
هەموو ئەندامی لاشەم پڕ لە تینە
نەسیمی خۆشی «سەرماوە» لە سەرکەل
هەناسەی بەردی «قاراوا» ئەوینە
لە بەر لالە و چنوور و شنگ و ڕێحان
ئەبینم «بیسەران» خولدی بەرینە
حەرامی شێت و شەیدایە لە بۆ گول
لە «گاڕان» یاسەمەن لاولاو بە چینە
هەوای سووک و نەسیمی سوبحی سوورێن
مەڕەسوور دێت و لەنجەی زۆر شیرینە
قەتارەی قاز و سۆنەش وەک سوپایەک
شەماڵەی نوور لە سەر ئەم سەر زەمینە
تەواو نابێ «عالی» وەسفی مەریوان
کە مەڵبەندی کەماڵ، شێعر و ئەوینە

### سەید عەبدوڵڵا حسێنی

ئەم نووسەرە مانگی فەبریەی ساڵی ١٩٥٣ی زایینی لە شارەدێی «هەورامان» لە بنەماڵەیەکی ئایینی کە بە ڕچەڵک ئەچنەوە سەر ساداتی چۆڕ چاوی بەژیان هەڵێناوە. سەرەتای خوێندنی بە قورئانی پیرۆزەوە لای حاجی «سەید محەممەد»ی باوکی دەست پێئەکات. بۆ تێر کردنی بیر و هزری لە کانیاوی زانست زۆر شوێن و مەڵبەند لە کوردستانی ئێران و ئێراق گەڕاوە. لای «مەلا محەممەدی بداقی» ئیجازەی مامۆستایی وەرئەگرێت. ئەگەڕێتەوە مەریوان و ژیانی هاو بەشی پێک دێنێت. بۆ بژێوی ژیانی خۆی و ماڵ و منداڵی دوکانداری و مەلایەتی و وانەبێژی کردووە. وەک مامۆستایانی تری ئایینی کورد بۆ خزمەت بە ئایین لەم

شوێنانەدا مامۆستای ئایینی بووە: گوندی «ڕۆوەرێ» لە هەورامان، گوندی بەرقەڵا و ... تا ئەوەی لە مزگەوتی سەلاحەددینی ئەییوبی مەریواندا گیرساوەتەوە و هەنووکەش دانیشتووی مەریوانە.

**چالاکیی ئەم نووسەرە:**

**بڵاوکراوە:**

١ـ ئارامی دڵان. ٢ـ دیوانی شێعر بە دوو زاراوەی سۆرانی و هەورامی بە نێوی دیوانی «مامۆستا سەید عەبدوڵڵا حسێنی». ٣ـ خدا را چگونە بشناسیم؟

ئامادەی بڵاوکردنەوە:

١ـ ژیاننامەی ئیمام شافێعی(ر‌ە) و ئیمامی نەوەوی لە کتێبی کۆن و نوێدا.

٢ـ سێ هێڵی چەپ بناسە.

## عەبدوڵڵای نیکخا (سەفایی)

ساڵی ١٩٥٣ی زایینی لە گوندی «ساوجی»مەریوان لە بنەماڵەیەکی ئایینی چاوی بە ژیان هەڵێناوە. باوکی مامۆستا ئەحمەدی ساوجی و دایکی خاتو عالیە کچی مەلا ئەحمەدی پیرسەفایە و نازناوی شێعری «سەفایی»یە.

سەرەتای خوێندنی بە قورئانی پیرۆز و وردە کتێبەکانی ئەو سەردەمەوە دەست پێئەکات و بۆ پەرەپێدان بە زانست و تێراوکردنی بیر و هزری لە کانیاوی زانین، زۆر گوند و شاری ئەم کوردستانە زاناخێزە گەڕاوە و لە خزمەتی زۆربەی زانایانی بە ناوبانگی کوردستانی ئەم دیوو ئەو دیو بە تایبەت لە ناوچەی مەریوان کەڵکی وەرگرتووە و وانەی ئایینی و خواناسی و نەتەوە دۆستی خوێندووە، وەک: مامۆستا ئەحمەدی ساوجی، مامۆستا مەحموودی سیاناو[1]، ئاغا عەتای چۆڕ، مامۆستا سەید عەلی خالیدی نێ، مامۆستا محەممەدی خورماڵ، مامۆستا زاهیدی پاوە

---

١. یەکێ لە مامۆستایانی ئایینی و خواناسانی گەورەی مە ریوان بووە، کە لە گوندی سیاناو دائەنیشت و ساڵی (١٩٨٩ز.) ماڵ ئاوایی لە ژیان کرد.

و مامۆستا محەممەد ئەمینی کانیسانان. تا ئەوەی کە، ساڵی ١٩٧٥ لە خزمەتی مامۆستای کانیساناندا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە.

ئەم شاعیرە وەک نەریتی مامۆستایانی ئایینی کورد کۆچاوکۆچ و مزگەوتا و مزگەوتی زۆری کردووە وخەڵکی لە زانستی بەهرەمەند بوون. هاوکاتیش مامۆستای قوتابخانەکانی مەریوان بووە. ساڵی١٩٩٨ لە تاقیکردنەوەی مامۆستایانی ئایینیدا بەشداری ئەکات و «فەوقدیپلۆم» وەرئەگرێت.

«سەفایی» هەر لە سەرەتای خوێندن و فەقێیەتییەوە، تێکەڵاوی دنیای شێعر و ئەدەبیات و وەرگێڕان ئەبێت و لە بواری ئامۆژگاری، زانست، گازە و پاڕانەوە، سەنا و سکاڵا، ژیانی خەڵکی ناوچە و جوانی سروشت و نیشتمان، دیوانێک شێعری ئامادەی چاپ و بڵاو بوونەوەیە. ئێستا ٥٨ ساڵ تەمەنیەتی و دانیشتووی مەریوانە.

### «کتێب»

کتێب مامۆستای جوان و دڵسۆزم
مایەی سەربەرزی بۆ گەل و هۆزم
دۆسە چاکەکەی شیرین کەلامم
گوڵشەنی ڕەوزەی داروسەلامم
بینا و سەرچاوەی ئاوی ژیانم
گریکی دڵ و ئارامی گیانم
لابەری تەم و خەم و خەیاڵم
خۆشەویستترین سەروەت و ماڵم
شەتاوی ئاوی جاری و زوڵاڵم
مایەی دەسکەوت و ڕۆزیی حەڵاڵم
دۆستی بە وەفا و بە سەفا و حەیام
ڕێزت واجبە هەمیشە لە لام
هاوەڵی ڕاستی و ڕۆژ و شەوانم
فەرەحی دڵ و ڕۆحی ڕەوانم
هۆی تەندروستی و سەرمایەی هەستیم
هۆی شەوق و نیشات شادی و سەربەستم

ڕانومای دەشتی وەشتی مەینەتم
بەڵگەی ئازادی و موژدەی خۆشبەختم
ئەنیسی شەو و کاتی تەنیاییم
گرێکی دڵ و نووری بیناییم
شنەی شەماڵ و سروەی بەربەیان
ئارامی بەخشی دڵ مەخفی و عەیان
«کاف»ت کارەبا و کانی کەرەمە
سەری کەوسەر و کەعبەی حەرەمە
کار و کەسابەت، کەوکەبەی شاییم
کەشف و کەرامەت، کاریز و کانیم
«ت»ت هۆی تەرەقیی عامەی ئوممەتە
تەفسیر و تەعلیم دوور لە تۆهمەتە
«ی»ت یار و یاوەر یومن و یەمینە
«ب»ت بارە و باوەڕ بیر و بینینە
کارنامەی فەتح و پیرۆزی و خەبات
هەرتۆی بە بەشەر ئەدەی بەخەڵات
نیکتە و وەرگێڕان فەلسەفە و هونەر
لەتیفە و حیکمەت ئەدەی بە بەشەر
ڕەمز و فائیدە و زانست و مایە
بێ حەد و حیساب هەواڵت لایە
ئادەمیزادی بێ ناو و نیشان
ئەکەی بە زانا و پادشای جیهان
هەموو لاپەڕەت پەڕەی گوڵی سوور
جوان و بە سوود و بە عەتر و پڕنوور
بوڵبوڵم موژدەی بەهاری هانی
لە سەر لووتکەی کێو گوڵزاری و کانی
سەلامت لێ بێ عیلم و حەیاتم
ئازیزگیان منیش بەرە و ڕووت هاتم

پێشوازیت ئەکەم دەست لە سەرکەمەر
دات ئەنێم لە سەر دڵ و چاو و سەر
هەتا هەم بەدڵ ڕێزت لە لامە
ناوت شیرینتر هەمووتەعامە
ناتکەم بە بۆق و سندووق و دەفتەر
یا کیف و دەوری و باوەشێن بۆ سەر
خوا لە بەر خاتر کتێب «سەفایی»
ببەخشی تەواو ڕۆژی دوایی

**فریشتە عەلەویی (دایکی سەلام)**

لە ١ی ژوئەنی ساڵی١٩٥٣ی زایینی لە گوندی «بانیشار» لە کوردستانی ئێراق لە دایک بووە. باوکی «سەید محەممەد»ە کە لە ساداتی نوێن لە ناوچەی هەورامانە و دایکیشی سارا خاتوونە کە کچی «مەلا محەممەد شەریفی» شاعیر لە مەردۆخییەکانی دەگاشێخانی مەریوانە. یەکەم مامۆستای ئەم خاتوونە باوکی بووە کە مەلای مزگەوت بووە و بە خوێندنی قورئانی پیرۆز بەردی بناغەی یەکەمین وشەی زانستی لە مێشکیدا دائەمەزرێت و دواتریش ئێقباڵ نامەی مەلا خدری ڕووار درێژە پێ ئەدات.

دوای پێکەوەنانی ژیانی هاوسەری لە گەڵ ئامۆزایەکی خۆی، ئەویش ئەبێ بە هاندەرێکی باش بۆی و لە هەموو کتێبێک بە تایبەت دیوانی «سەیدی هەورامی» و دیوانی شاعیرانیتر کەڵک وەر ئەگرێت.

فریشتە خاتوون توانای نووسینەوەی زۆر کەمە و لە پلەیەکی زۆر نزمدایە بەو بۆنەوە منداڵەکانی یارمەتی ئەدەن و ئەو شێعر دەهۆنێتەوە و منداڵەکانیش بۆی ئەنووسنەوە.

بە تێکڕا ئەتوانین بڵێن کە باوکێکی دڵسۆز، مێردێکی تێگەیشتوو و منداڵانێکی گوێگر و خزمێکی وەک مامۆستا «سەید ڕەئووفی حسێنی» شاعیر، دەس بە دەستی یەکەوە ئەدەن تا خاتوونێکی شاعیر درووست ئەبێت. خاتوونی شاعیر ئەڵێت:

«کاتێک لە ئێراق بووم بۆردومانی گوندەکان فارس گوتەنی « عدو شود سبب خیر گر خدا خواهد.» و ئاوارەیی و سەر لێشێواویی خەڵک و ڕاپەڕینە مەزنەکەی ساڵی ١٩٩١ی گەلی کورد دژ بە ڕژێمی بەعسی لە ناو چوو، وەک پزیسک هەستی شێعریان بزواندم.

ناو براو دیوانێکی شێعری لە ژێر ناوی «هۆنراوەکانی دایکی سەلام» چاپ و پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی کردووە. ئەم شاعیرە ئێستا دانیشتووی مەریوانە.

**ئەحمەد بەهرامی**

بەهاری ساڵی ١٩٥٤ی زایینی لە گوندی «سەعدئاوا»ی ناوچەی خاو و میرئاوای مەریوان لە بنەماڵەیەکی ئایینی هاتۆتە دونیا. دوای ساڵێک دایکی کۆچی دوایی ئەکات و یەکەمین لەمپەری ژیانی شاعیری ڕێی پێئەگرێت. دایە گەورەی (دایکی باوکی) ئەرکی گەورەکردنی بە ئەستۆ دەگرێت. قۆناغی سەرەتایی هەر لە گوندەکەی خۆی تەواو ئەکات. لە بەر نەبوونی و تەنیا باڵیی باوکی بە شێوەی ئازاد(موتەفەریقە) درێژە بە خوێندنی ئەدات.

ساڵی ١٩٧٥ وەک مامۆستا لە دایەرەی پەروەردە و بارهێنان دائەمەزرێت و ئەرکی مامۆستایی دەست پێئەکات. لە دوای هەڵگیرسانی شەڕی ئێران وئێراق، ئاوارەیی و سەرلێشێواوی پەڕەوازەی زۆر جێگای ئەکات. لە گوندی کانیدینار ئەگیرسێتەوە و ئێستاش دانیشتووی مەریوانە. هاوڕێی منداڵانی خوێن گەرم و ئێسک سووک لە قوتابخانەکاندا هانیدا لە بواری ئەدەبی منداڵاندا هەنگاو هەڵبگرێت. ئەم نووسەرە لەم بوارەدا زیاتر لە بیست بەرهەمی ئامادە کردووە بەڵام بواری بڵاوکردنەوەی هەموویانی بۆ نەڕەخساوە.

**بەرهەمی چاپ کراو:**

١ـ باخچەی منداڵان. ٢ـ قاڵاوی تینوو. ٣ـ هەروەکوو خۆم. ۴ـ گوڵزاری پەپوولە.

**سەید باباشێخ حسێنی**

ساڵی ١٩٥۴ ی زایینی لە بنەماڵەیەکی ئایینی لە گوندی «سەوڵاوا» لە دایک بووە و کوڕی خواناس و عارفی گەورە خوالێخۆشبوو حاجی کاکە شێخی سەوڵاوایە.

قۆناغی سەرەتایی هەر لە زێدەکەی خۆی، قۆناغی ناوەندی لە مەریوان و قۆناغی دواناوەندیشی لە سنە تەواو کردووە. خولی فێرکاری مامۆستایی لە کرماشان تەواو ئەکات و جلوبەرگی مامۆستایی لە بەردەکات. لە دوای سەرکەوتنی گەلانی ئێران بە سەر ڕژیمی پاشایەتیدا ئەویش وەک زۆر کەسی تر ئەکەوێتە بەر شاڵاوی لە کار لابردن. سەید باباشێخ هەنووکە خەریکی باخەوانی و کشتوکاڵە و خۆشی لە باخەوانی مێژو و زمانناسی، زمانی زگماکی نەبواردووە و بە پێی توانا، خۆی بە خزمەتکار و ئەمەگناسی گەلەکەی ئەزانێت.

ئەم نووسەرە زۆر وتاری لە چاپەمەنییەکاندا بلاوکردۆتەوە کە دەتوانین ئاماژە بکەین بە: «پژوهشی پیرامون زبان اورامی وزبان های کهن باستانی»، «ژیاننامەی مەولانا موسەننیف چۆڕی» و «مستورەی اردلان و اردلانی ها».

**چاپکراوەکانی نووسەر:**

١ـ اسما در زبان کردی ٢ـ هامشی بر زبان شناسی

**عیسا ئەحمەد زادە**

ساڵی١٩٥۴ی زایینی لە گوندی «نگلّ» لە دایک بووە. دایکی کابان و باوکی مامۆستای ئایینی بووە. لە پێنج ساڵیدا دەستی بە خوێندنی قورئانی پیرۆز و وردە پەڕاوە کوردی و فارسییەکانی باوی ئەو سەردەمەی قوتابخانە ئایینیەکان کردووە.

ساڵی ١٩٦١ فێرگەی سەرەتایی لە زێدەکەی دائەمەزرێت، بەڵام بە هۆی تەنگ و چەڵمەی جۆراوجۆر، هەلومەرجی ژیانی ڕێی پێ نەدراوە بە شێوەی فەرمی لە فێرگەی نوێ و وانەکانی کەڵک وەربگرێت. بەو بۆنەوە ڕۆژان سەرقاڵی جێبەجێ کردنی ئەرکی ماڵ و بە شەوان لە پۆلی خوێندنی چراو و بڕاوی

شەوانەدا تا وەدەست هێنانی بڕوانامەی شەشەمی سەرەتایی ئەخوێنێت، پلەکانی تری خوێندن بە شێوەی ئازاد، تا وەگرتنی دیپلۆم لە ساڵی ١٩٧٣ لە سنە درێژە پێ ئەدات. ساڵی ١٩٧٦ لە ئیمتیحانی زانکۆدا بەشداری ئەکات. سێ ساڵ دواتر زانکۆ تەواو ئەکات و وەک مامۆستای زمانی ئینگلیزی لە شاری مەریوان دائەمەزرێت. دوای سی ساڵ خزمەت بە منداڵان لە وەرزی پاییزی ساڵی ٢٠٠٦ خانەنشین ئەبێت.

بیر و هزری باوکی نیشتمان پەرەوری لە سەری کاریگەر بووە. لە گەڵ شێعرەکانی قانع ئاشنا دەبێت و خواست و سکاڵای دەروونی بە شێوەی دەق و چیرۆک و هەڵبەست بۆ هەڤاڵانی ئەنووسێت و ئەهۆنێتەوە. لە گەڵ گۆڤارە کوردی و فارسییەکاندا بە شێوەی نووسین و وتار هاوکاری کردووە.

جێگای ئاماژەیە کە عیسا ئەحمەدزادە کوڕی شاعیر «مامۆستا سادقی نگڵی»یە کە دیوانە شێعرێکی لێ بەجێماوە.

**ئەمانە بەرهەمە چاپ کراوەکانن:**

١ـ ژن و پیاوە هەڵکەوتووەکان (وەرگێڕاو لە ئیگلیزییەوە). ٢ـ مێژووی نگڵ.

٣ـ پێغەمبەران لە ئاوێنەی مێژوودا (وەرگێڕاو لە عەرەبییەوە).

**ئامادەی چاپ:**

١ـ کۆمەڵە شێعرێک. ٢ـ لذت مادی یا کرامت انسانی؟! (وەرگێڕاو لە ئینگلیزییەوە).٣ـ کۆمەڵە چیرۆکی جۆراوجۆر.٤ـ وەرگێڕانی کۆمەڵێ وتار و کورتە چیرۆک لە عەرەبی و ئینگلیزییەوە بۆ سەر زمانی کوردی و فارسی.

### ئیسماعیل مەحموودی

ئیسماعیل کوڕی سوبحان کوڕی محەممەد ئەمین(خیتلە) و نەهیە خاتوونە. ساڵی ١٩٥٥ی زایینی لە گوندی «دەمەیەو» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. ئەم شاعیرە نەخوێندەوارە، بەڵام لە هەڵبەست و شێعردا دەستی هەیە. سەبارەت بەوەی کە چۆن هاتوەتە نێو شێعر و هەڵبەستەوە ئەڵێت: منداڵ بووم لە گەڵ باوکم بۆ مزگەوت ئەڕۆیشتم، مامۆستای گوندەکەمان(مامۆستا شێخ جەلیل فارۆقی) شێعری «ڕۆڵە بزانی مەلا خەدر ڕووار»ی

بۆ ئەخوێندینەوە و ئێمەش لەبەرمان ئەکرد. هەر ئەو شێعرانە بوون بە هەوێنی گیرساندنی هەستی شێعریم. بە پێی هەل و دەرفەتەکان شێعرم بۆ دێت.[١]

سەد مەخابن شێعرەکانی ئەم شاعیرە لە بەر خەم ساردی تا ئێستا تۆمارنەکراون و نەنووسراونەتەوە. هەر بۆیە زۆرێک لە شێعرەکانی لە بەر چوونە سەرەوەی تەمەن فەوتاون یان نیوەو ناتەواو لە بیری ماون.

### «گفتوگۆ چەنی دڵی»[٢]

ئـی پـارچە شـێعرە جە بەحسوو دڵـی
جە بەحسوو ڕاسی بەحس و سەر چڵـی
بـاکێ مـن و دڵ کەرمـێ گفتوگـۆ
تـۆ دڵ چەنـی مـن، مـن دڵ چەنـی تـۆ
دڵەی بێ ئاگـا و بێ فکـر و بێ هـۆش
دڵە گوفتـارم مەکە فەرامـۆش
گوفتـارم ئێـنەن دڵە بە حـاڵی
عەقـڵ وەرگێـرە و سـاڵ چەنـی سـاڵی
گوفتـارم ئێـنەن دڵ مەبە سـەرچڵ
دائـیم ڕۆشـن بە وێـنەی دەسـەی گـوڵ
دڵ تـۆ مەکەرە زەنـی نـاحەقی
مەنیـشە چـڵ و عەینـوو لەق لەقـی
وێـنەی بـایەقووش مەوانە سـەر کەڵـک
تـا خاسـیت واچـا ئـاوەدانی و خەڵـک
دڵ غەرەز حەسـوود سـەنگ سـیای ڕەقـا
چڵاوچـڵ کەرۆ ئەجـۆ لەق لەقـا

---

١. وت وێژ لە گەڵ نووسەر.

٢. ئەم شێعرە کاک مادح ڕۆستەمی بۆی دابەزاندووم جێگای ڕێز و پێزانینە.

ڕەنــگ زەرد و زەعیــف جــا بــێ ئــازیزا
دایـــمە وەهـــارش ئەجـــۆ پــاییزا
ڕەنــگ زەرد و زەعیــف بــێ مــاڵ و مەنــزڵ
دڵ وێـــنەی قازانـــگ جــا مەوەرۆ قـــووڵ
وێـــنەی بۆشـــکەی قیـــر قـــوڵێ مەشـــانۆ
قـــــوڵی غەرەزن ســـــیاو مرمـــــانۆ
ئەی دڵـــی دڵـــدار تـــۆ بە مـــن ســـاچە
ئیتـــر نـــۆرەت بـــۆ گوفتوگـــۆت واچە
دڵ تـــۆ مەعـــدەنت غەزەب یـــا نـــوورا
چێش جە لات نزیک چێش جە لات دوورا
پەیمـــا گێڵـــنەوە وێـــردەی ســـاڵت
بزانمـــێ چێـــشا حـــاڵ و ئەحواڵـــت
جـــا دلـــیش واتـــش مـــن بە تـــۆ ســـاچوو
دەقیـــق مەزانـــو چێـــشت پەی واچـــوو
چێـــشت پەی گێلنـــووە وێـــردەی ســـاڵم
مـــن ئەشـــۆم چـــێش بـــۆ حـــاڵ و ئەحـــواڵم
داخـــێم فرێنـــێ چـــوون گەڵاو باخـــا
داخیـــۆ تـــۆیچ بـــیە سەرباشـــقە و داخـــا
دەقیـــق مەزانـــوو تـــۆ نامێـــت چێـــشا
پەی گوفتـــارو مـــن تـــۆ کـــارت چێـــشا
ئەی دڵـــــی پـــــڕ داخ دڵ عاســـــەبانی
ئەگەر گەرەکتـــا تـــۆ نـــامێم زانـــی
بابـــایە فەقیـــر خەڵکـــوو ئێرانـــی
ئیـــسماعیلەنا کـــوڕوو ســـوبحانی
بابـــام حەمەومـــین پـــڕ عەقـــڵ و فـــام بـــێ
ئـــایچ شـــاعیر بـــی و مەشـــهوور بە عـــام بـــێ

دڵە یـــا مەســـــنی یـــا شـــەوقت نیـــا
یـــا قەدری مێمـــان تـــۆ جە لات نیـــا
دڵ وات ئیـــــسماعیل کـــــوڕو ســــوبحانی
ئیـــسە حەز کەرو گوفتـــاریم زانـــی
گوفتـــــارم ئیــــنەن ویەردەی ســــاڵم
ئیـــسە پەیـــت مـــاچوو حـــاڵ و ئەحـــواڵم
پارچەگۆشـــــتێنا ئیتـــــر مـــــن دڵنـــا
بەینـــیێ دڕەینـــا جـــا بەینـــیێ گوڵنـــا
بەینـــــیێ بــــایەقوش بەینـــــیێ بوڵبوڵنــــا
بەینـــی شـــیریننا جـــا بەینـــیێ تاڵنـــا
کەم کەســـــــیێ زانــــــۆ بە خەیـــــاڵاتم
بەینـــیێ بە شـــەوقم جـــا بەینـــیێ مـــاتم
هەر ڕوێـــچ وانـــوو چـــوون کەڵـــی ســـەرکەش
ســـەیادێ کوشـــام گۆشـــتم کەرا بەش
هەر ڕوێـــــچ کەروو غەرەز حەســـــــادەت
ئـــارۆوە نییـــام تـــا ســـەر ئیـــسراحەت
هامـــــــساو بەرهامـــــسا چەنەم عەجـــــزا
وێرەگـــــا بەرق و مەنـــــزڵیم کـــــزا
ئیتساڵیـــــــشا بەرقـــــــی مەنـــــــزڵم
غەرەزی ســـۆچنان بـــاخەکەی گـــوڵم
وەســـــیەتم ئیـــــنەن پەی گـــــردوو دڵا
غەرەز حەســـــادەت فـــــرە مـــــشکڵا
غەرەز حەســـــادەت، فیتـــــنەی بەخێڵـــــی
بـــۆ بەســـەرەتان پەی دڵێـــو خێڵـــی
غەرەز حەســـــادەت بـــــۆ بە ســـــەرەتان
هـــیچ دوکتورێـــوە مەکـــرۆش دەرمـــان

دڵ وات ئیـــــسماعیل ڕەفێـــــق گوفتـــــارم
چێش مـــاری ســـەوقات مەی پەی هەوارم
ســــــەوقاتم ئیـــــــنەن دڵە بە حـــــاڵی
دڵە بەش نەبـــــی ســـــەتڵە و ئەشـــــغاڵی
جـــــا دڵ ســـــــەتڵەنەو غەرەز ئەشـــــغاڵا
دڵـــــــی غەرەزن شــــــایش بەتـــــاڵا
ســــــــەوقاتم ئیـــــــــنەن دڵ مەبە نەوەش
جە ڕەحمـــی خـــوا تـــا نەبـــی بـــێ بەش
نـــــوورو قورئــــانی بــــا وەزۆ دڵـــــت
ئیـــشەڵا خـــاس بـــۆ مـــاڵ و مەنزڵـــت
ســــەوقاتم ئیــــنەن دڵ ئیـــــنە خاســـــا
وێـــــت کەری ڕەفێـــــق خـــــوا ئەشناســـــا
خـــوا ئەشـــناس کـــێن ڕەســـووڵی ســـەروەر
پاســـە کەلـــیمەی تەوحیـــد کەوتەن وەر
خـــوا ئەشـــناس کـــێن چـــوار یـــاری نەبـــی
ئەبـــووبەکر و عـــومەر عوســـمان و عەلـــی
جـــــا ئیتـــــر بلمـــــێ هەوارو دڵـــــی
دڵـــی پـــاک وەنـــێ عەیـــن و بولبـــوڵی
هەوارو دڵـــــی هەر فـــــرە وەش بـــــێ
دڵـــــــی غەرەزن بەڵام نەوەش بـــــــێ
ئاســـمان ڕۆشـــن بـــێ زەمـــین وەش ڕەنـــگ بـــێ
دڵـــی غەرەزن هەر دائـــیم تەنـــگ بـــێ
تـــۆ خـــوا دڵە گیـــان خاســـترین دڵ بە
بـــایەقووش مەبە و عەینـــی بولبـــوڵ بە
تـــۆ دڕەی مەبە هەر وێـــنەی گـــوڵ بە
بـــۆ یـــادی خـــودا دائـــیم بە قـــوڵ بە

عیبـــــادەت کەرە تـــــۆ هەتـــا تـــاوی
ڕیـــــشەت نەگەزۆ مـــــاری زەهـــراوی
ڕیـــشەی دڵ وێـــنەی ڕیـــشەی درەختـــا
درەختـیش زەرد بـــۆ جـــا یـــاگێش سـەختا
دڵ مەکە غەرەز ، غەرەز بـــــۆ بە ســـــەخت
چوون درەخت زەرد بی ئەی دڵەی بەدبەخـت
دڵە حـــــــــــاڵی بە دڵە حــــــــــاڵی بە
ئەر حــــاڵی مەبـــــی هەر ناحـــــاڵی بە
حـــاڵی و ناحـــاڵی گـــرد تـــێکەڵ بیـــیەن
ناحـــاڵی فـــرەن حـــاڵی کەم بیـــیەن
ئەگەر حـــاڵی بـــی پەی کەســـێ خاســـی
کۆمەکیــــــت کەرۆ ئەگەر بــــــشناسی
ئەر حـــاڵی مەبـــیچ بـــا هەر وێـــڵ بیـــنە
هەر بـــا ســـەرگەردان هەردەگێـــڵ بیـــنە
دڵە یــــــــــاد کەرە دڵە یـــــــــاد کەرە
وەشـــــی قەدیمــــی ئیـــسە یـــاد کەرە
نەک وەشــــــی ئیـــــسە هەر زەهرەمــــارا
ئاســــمان گـــــرەوۆ زەمـــین غەمبــــارا
بـــاکەرمێ بەحـــسی ویەردەی ســـاڵان
دەســـکاری قەدیـــم گـــرد شـــی بە تـــاڵان
چــــونکێ کـــز بـــیەن دیـــن و دیانـــت
هۆرگیریـــان وەشـــی و شـــادی و ئیسراحەت
جیــــــــای ڕەحمەتــــــــی غەزەب مەوارۆ
زەمـــین و باخـــات بەریـــات نمـــارۆ
هەر جە ڕۆی ئەزەڵ تـــــــــــــا ڕۆی
هەر چـــی بەر مەیـــۆ جە ڕووی سەربیـــسات

شـــەو و ڕۆژ چەنـــی دەقـــیقە و ســـاعات
هەر دەقـــیقەیە و ســـــەد هەزار مەڕات
هەر مەڕاتێـــــوە ســـــەد هەزار زەڕات
بەڕووی نـــازەنین محەمـــمەد ســـەڵەوات
شـــاعیر ئیـــسماعیل بـــێ ســـەواد، عەوام
عەزێـــم نەمەنەن بـــاقی و ســـەلام
بەشـــکوو ئـــی شـــێعرا یـــاگە گیـــرێ بـــا
پەی دەرد و دڵـــی جـــوان و پیـــرێ بـــا

## سەید ئیسماعیل حسێنی

سەید ئیسماعیلی حسێنی کوڕی سەید حەسەن لە سەیدەکانی (حەوتاش)ی لای (بانە)یە. ساڵی ١٩٥٦ی زایینی لە سەرشیوی مەریوان لەدایک بووە. خوێندنی سەرەتایی لە لای باوکی دوایی هێناوە و پاشان بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕووی کردووەتە خوێندگا ئایینیەکانی مەریوان. بە هەوڵ و تێکۆشانێکی زۆر توانیوویەتی لە هەموو زانستەکاندا سەرکەوتنێکی باش وەدەست بهێنێت.

هاوکات لە گەڵ زانستی ئایینی، لە فێرگە و قوتابخانە دەوڵەتییەکانیشدا دەرسی خوێندووە و تا پلەی بەکالۆریۆسی گەیشتووە. ساڵی ١٩٧٨ لە بەشی عەرەبی و کوردی ڕادیۆ کرماشاندا دەستی بە کار کردووە و ئێستا یەکێکە لە نووسەران و وێژەرانی کارامەی رادیۆ و تەلەفزیۆن لە هەموو بەشە جۆر بە جۆرەکانیدا.

هەر بە منداڵی بە هەڵبەست و هۆنراوە لە زمانی فارسی و کوردیدا، چێژی هونەری خۆی پیشان داوە.

**ئەمانەی خوارەوە بەشێک لە بەرهەمەکانی ئەون:**

١ـ دوانزە سوارەی مەریوان. ٢ـ گڕوگاڵ (سەرجەمی شێعرەکانی بە فارسی و کوردی). ٣ـ ژن لە فەرهەنگ و ئەدەبیاتی نەتەوەی کورددا. ٤ ـ دایک لە وێژە و ئەدەبی کورددا. ٥ ـ لێکۆڵینەوە لە ژیان و بەرهەم و ئەندێشەی ماه شەرەف خاتوون،

مەستوورەی کوردستانی.٦ـ ئەندێشەی ڕامیاری و ئایینی سەید قوتب (وەرگێڕان).

٧ـ پەندی پێشینیانی هاوبەش لە زمانی کوردی و فارسی و عەربی دا. ٨ ـ بەستێنی فەرهەنگی کوردستان لە پتەو کردنی یەکیەتی نەتەوەیی.٩ـ وەرگێڕانی کتێبی «یەزیدییەکان مێژوو و بیر وباوەڕیان» لە عەرەبییەوە بۆ سەر زمانی فارسی.١٠ ـ ذبیح محراب. ١١ـ هابیل در میقات.١٢ـ سیمای پیامبر اعظم (ص) در آئینه شعر شاعران کورد. ١٣ـ طلاق ثلاثه روایتی که ناگفته ماند. ١٤ـ رمضان در فرهنگ و عقاید مردم کردستان.

جگە لەمانەش تا ئێستا سەدان لێکۆڵینەوە و وتاری زانستی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانی وڵات و هەروەها لە کۆڕ و کۆنگرەکان و بیرەوەرییەکاندا، بڵاو کردووەتەوە و پێشەکی و پەراوێزی لە سەر بەرهەمی زۆرێک لە زانایان نووسیوە.

**«بۆ دیمەنە جوانەکەی مەریوان»**

«مەریوان»ی جوانی من! نموونەی شاری کوردانی
مەکانی عالمانی دین، قەڵای ئازادە مەردانی
ئەگەر تالیب بە جەننەت هەی، بچۆرە سەیری هەردانی
وەها خەملیوو و دڵگیرە کە دائیم شاد و خەندانی
سوپاهی خەم ئەتارێنێ هەوارگەی خۆش و دڵگیرت
دڵی کوردان ئەبێ حەیران لە سەیری دیمەنی خۆشت
ئەبن سەرمەست لە بەر بۆنی گوڵاڵەی دەشتی سەوز پۆشت
«زرێبار»ت وەکو ساوا بە گەرمی ناوەتە کۆشت
لە ئاوی سەر چیاکانی ئەگەر تۆزێ بکەی نۆشت
ئەوی وا مەرگ وتیاچوونە مەحاڵە نایەتە بیرت
ئەتۆ دووری لە ئینسانی دەنائەت پیشەو هەرزە
بوڵەندی کێوی «میراجی»ت نیشانەی سەد هەزار ڕەمزە
«ئیمام»یشت وەکو هیمەت گەلی کورد مەحکەم و بەرزە
کە وا بو مێهری تۆ بێ شک لە بۆ ئێمە هەموو فەرزە
بە گیان و دڵ هەتا مردن ئەکەین تەعریف و تەقدیرت

لە نـــاو جەرگەی بەهارانـــا بچـــۆ ســـەیری دەرو دەشـــتی
ئەگەر ئەهلـــی ســـەفا و زەوق و گەڕان و جەولە وگەشـــتی
چ موحتاجی «ڕامسەر»! ئەی بێ خەبەر یا بەندەری «ڕەشت»ی
کەنـاری ئـاوی »ڕوکنابـاد» مەچـۆ لادە لە گـوڵ گەشـتی
بەهەشـتی خـوا لە ئەو دونیـا لە وێـدا دێـتەوە بیـرت
لەنـــاو جەرگەی بەهارانـــا دەر و دەشـــت و «زرێبـــار»ی
وەکـــوو بـــووکێکی ڕازاوە سەراســـەر خۆشـــی لـــێ بـــاری
لە جـێگەی جەنـــنەتە بۆمـــان تەماشـــای بـــاخ و گـــوڵزاری
لە «بێلـــوو»دا لە خەودایە کەســـێکی هەروەکـــو «نـــاری»
یەقیـــنە نـــامرن هەرگیـــز «شـــەپۆل» و «قـــانع»ی ژیـــرت
بە ڕووخـــاوی نمایـــانە قەڵا و ئاســـاری چەنـــد میـــران
لە باوەشـــتایە چەنـــد مەرقەد گـــوممەز و بارەگـــای پیـــران
«ســـەفائەددین»ە، هەم «کابـل»، لە «یـونس» پیـری هەنجیـران
بەرەی ســـاداتی پیرخـــزری کە دۆعایـــان هەمـــوو گیـــران
ئەتـــۆ خـــاکێکی پیـــرۆزی بە بـــۆنەی ســـەیید و پیـــرت
ئەوی دوژمـــن بە زانـــستە، ژیـــاوە هەر بەســـەر شـــۆڕی
هەزاران ڕەحمەتـــی یەزدان ببـــارێتە ســـەری گـــۆڕی
«عەلامەی بالـک» و قەبـری «موسـەننیف» سـەییدی چـۆڕی
بە شـــۆڵەی عـــیلم و خواناســـین دڵانـــی تاریـــان گـــۆڕی
ئەسەف دەرچوو لە دەس ئێمە کە زانای عـیلم و تەفسیرت
مەریـــوانم هەرێمـــێکە لە ڕوخـــساری چیـــا و هەردی
ئەبـــارێ ڕەمـــزی سەربەرزی؛ســـەرەفرازی و جەوانـــمەردی
لە نـــاو جەرگەی بەهارانـــا بچـــۆ ســـەیری «قەڵەبەرد»ی
بڵـێ:ئـاوی چیـا و کوێـستان، شـیفای هەر عـیللەت و دەردی
کلەی چاوانی هەرکـوردە بە بـێ شـک خـاکی ئەکـسیرت

هـونەر وەختـێ ئەبووژێتـۆ کە خەڵکـی لێـی بـکەن تەجلیـل
ئەگەر ئەمــڕۆکە بــازاڕی هــونەر بــێ ڕەونەقە و تەعتیــل
هەمــوو خەڵکــی لە بــۆ ســامان گرفتــارن، ئەســیر و دیــل
بەڵام چـون ئەرکـی سـەر شـانە دەخـیلە هەرگیـز «ئیسماعیل»
نەگـۆڕی شـوێن و ڕێبـازی بە نرخـی بـاب و بـاپیرت

## عوسمان ئەشکاوەند (جێماو)

لە وەرزی بەهـاری سـاڵی ١٩٥٦ی زایینـی لە ئـاوایی «نـێ» لە بنەماڵەیەکی جوتیاری چەوساوە، پێی نـاوەتە گۆڕەپـانی ژیـانەوە. باوکی ناوی سۆفی عەلییە و دایکی ناوی مینایە.

ئەم شاعیرە لە تەمەنی حەوت ساڵاندا باوکی لە ژیان ماڵئاوایی ئەکـات و بە هەتیـوی ئەکەوێـتە باوەشـی دایکێکـی فەقیـر و دەسـکورت و دڵـسۆز، دایکـی هەرچەنـد نەخوێنـدەوار بـووە بەڵام بـۆ پەروەردە و بارهێنان ڕەوانناسێکی لێهاتوو بووە. کاک عوسمان تا تەمەنی چواردە ساڵان بە هـۆی نەبوونی و ناتەواوی و لاواز بوونی بارودۆخی ئـابووری لە خوێنـدن بـێ بەش بـووە و لەبەر ئەوەی جل وبەرگی زۆر شڕی لە بەرکردووە پێیان گوتووە «عوسێ شێت».

ساڵی ١٩٦٠چووەتە قوتابخانەی سـەرەتایی گەورەسـاڵانی شـەوانە و خوێنـدنی تـا پۆلی سـێهەمی ناوەنـدی بە شـێوەی ئـازاد(مـوتەفەریقە) درێـژەی هەبـووە. «زۆر جـار خەڵکی بە سەر سووڕمانەوە وتویانە عوسێ شێتی سۆفی عەلی خەریکە فێری خوێندن ئەبێ».

لە سـاڵی١٩٧٧ پەنجەکـانی، بەتاسـەوە دەسـیان کـردووەتە مـل پێنـووس و بەرە و سارای سپی و ڕووناکی تێنووس، دوای کـاروانی شـاعیران و نووسـەران کەوتـووە و نازناوی «جێماو»ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە.

ساڵی ١٩٨٠ ژیانی هاوبەشی دەس پێئەکات و بە تەواوی لە کاری کشت و کاڵ و وەرزێری دەس هەڵئەگرێت و لە شاری مەریوان ئەبێ بە خەیات .

ئەم شـاعیرە خـاوەنی شـەش دەفـتەر شـێعرە کە بەداخەوە لە بەر ژیـانی لاوازی ئابووری توانای لە چاپ دانیانی نییە.

«شەپۆلی شەوق»

شەق بوو شیشەی شانازی شەو   شڕ بوو شکڵی شادەواری
شەبەق شێوەی شۆمی شکاند   شەتاو شۆردی شوێنەواری

شۆڵەی شەم و شێعر و شانۆ   شەپۆلی شەوق، شنەی شەماڵ
شوانی شوجاع شێت و شیدای   شاخ و شیو و شینی شمشاڵ

شان و شەوکەت و شاڵاوی   شابالی شێرانی شەرزە
شێواندی شەقڵی شەرم و شۆی   شاری شوغاڵی شپرزە

## محەممەد ئەمین میرزایی

نازناوی ئەم شاعیرە «میرزای هەورامی»یە. ساڵی ١٩٥٦ی زایینی لە گوندی «کەماڵە»ی هەورامانی تەخت چاوی بە ژیان هەڵهێناوە. هۆنینەوەی هەڵبەست و شێعر بە زمانی عیرفان و خواپەرستانەی ئەو سەردەمانەی هەورامان، میرزای هەورامیش بۆ ئەو کەش و هەوایە ڕادەکێشێ. بۆ یەکەم جار ساڵی ١٩٧٥ شێعرێک لە ڕادیۆ مەریوان بە مۆسیقای ئەهووراییی ئەخوێنێتەوە. سەردەمانی شۆڕشی گەلانی ئێران دژی دەسەڵاتی پاشایەتی وەک کوردێکی تۆخ شێعری شۆڕشگێڕانە دائەنێ. یەکەمین بەرهەمی ناوبراو دیوانێکی شێعرە لە ژێر ناوی «سەوزەی کۆساڵان» چاپ ئەبێت و ئەکەوێتە بەردەست ئەویندارانی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی. ناو براو بە نووسینی وتار و هەڵبەست لە گەڵ زۆربەی گۆڤارە کوردییەکاندا وەک ئامانج و سروە و... هاوکاری ئەکات و نووسەر و بێژەری بەشی هەورامی ڕادیۆ سنەشی لە ئەستۆیە.

کۆمەڵە شێعری «زەردی خەزان»یشی ئامادەی چاپ و بڵاو کردنەوەیە. ناوبراو ئێستاش مامۆستای ئایینی و دانیشتووی گوندی «سەراو قامیش»ی سنەیە.

## سابیر سەعیدی

ساڵی ١٩٥٧ی زایینی لە گوندی «شەڕەکان»ی ناوچەی هەورامانی لهۆن سەر بە شاری پاوە لە دایک بووە. باوکی فەرەج و دایکی مەلیحە خاتوونە. بە بۆنەی بڕێک گرفتی ئەو

سەردەمانەوە واز لە خوێندنی مەکتەب دێنێت، بەڵام وەک دۆست و هەڤاڵ چاو لە کتێب دەکات و لە بوارگەلی ئایینی، کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی و ئەدەبیدا موتالا ئەکات. سابیر لە تەمەنی ١٦-١٧ساڵیدا یەکەم شێعری خۆی ئەنووسێت. دواتریش بە دڵگەرمییەوە درێژە بە نوسین ئەدات و یەکەم بەرهەمی خۆی لە ساڵی٢٠٠٥ لە ژێر ناوی «هەنگی ڕۆح» بە دوو زاراوەی هەورامی و سۆرانی و بە دوو شێوەی شێعری کلاسیک و نویَ چاپ و بڵاو ئەکاتەوە.

دووهەم بەرهەمی بە ناوی «هاوار بیَ دەنگیم» لە ساڵی ٢٠١٠ چاپ و بڵاو بۆتەوە. نابراو کاسبە و نیشتەجێی مەریوانە.

**عادڵ محەممەدپوور**

هەرکەس تەوەلود دووبارەش نییەن ئەڵبەت سەعادەت ستارەش نییەن

(مەولەوی تاوەگۆزی)

**عادڵ محەممەد پوور لە زمانی خۆیەوە بناسین:**

لە وەرزی پاییزی ساڵی ١٩٥٧ی زایینی لە گوندی «دزڵی» سەر بە هەورامان لە دایک بووم. باوکم یووسف ودایکم فەهیمەیە. هەر لەو گوندە پۆلی شەشەمی سەرەتاییم تەواو کرد و بۆ درێژەدانی خوێندن، هاتمە شاری مەریوان. پاش تەواو کردنی قۆناغی دوا ناوەندی لە تاقیکردنەوەی زانستگادا، بەشداریم کرد. لە سەر حەز و خواستی خۆم ڕشتەی ئەدەبیاتم لە تەربیەت موعەلیمدا هەڵبژارد. دوو ساڵ لە شاری سنە دەرسم خوێند. لە سەرووبەندی شۆڕشی گەلانی ئێراندا بوو کە لەو شارە ئاشنای هەندێک چالاکی بواری ئەدەبیات و ... بووم. بازاڕی سیاسەت و خوێندنەوە پڕ ڕەونەق بوو، بەڵام بە شێوەی پراکتیکی بە قەرەی سیاسەتدا نەدەچووم. حەزم لە بازاڕی کتێب و خوێندنەوە بوو. لەم جموجۆڵەدا بوو، چێژی ئەدەبی من فراژۆی کرد. بە شێوەی فەرمی بووم بە مامۆستا، لە قوتابخانەی مەلا ئاوارەی ئەو دەم لە شاری مەریوان، دەستم بە وانە گوتنەوە کرد. لەو دەمانەدا بوو کە لە زەمینەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی کەڵکەڵەی زۆرم هەبوو و حەزیشم ئەکرد لە زێدەکەم، گوندی «دزڵی»، خزمەت بکەم، هەر بۆیە زوو لە سەر داواکاریی خۆم ساڵی ١٩٧٩ نەقڵی ئەو

گونده بووم.

بەڵای نەخوازراوی شەڕی ئێران و عێراق ساڵی ١٩٨٠ دەستی پێکرد. بە هۆی بوردمانی گوندەکە، بە شێوەی کاتیی قوتابخانەکەمان گواستەوە بۆ شاری مەریوان، نەمانهێشت قوتابییەکان لە وانەکان دوا بکەون.

لە مەریوانیش دەرپەڕێنراین و ئاوارەکراین. ساڵی١٩٨٧سەرەڕای ئاوارەیی، خولیای زانین و فێر بوون دیسان بەرەو زانکۆ هانی دام. دوای چوار ساڵ بەکالۆریۆسم وەرگرت و لە زانکۆی ئازادی شاری سنە ماستەری ئەدەبی فارسیم تەواو کرد و نامەکەشم لە سەر «سبك شناسی شعرهای بیسارانی» لێ وەرگیرا. گەڕامەوە مەریوان و لەوێ دەستم کرد بە وانە وتنەوە لە زانکۆی «پەییام نوور» کە تازە ڕێکەوتبوو. لە مەریوان شوێنێك نەبوو کە شاعیران و نووسەران و هۆگرانی فەرهەنگ و ئەدەب کۆ بکاتەوە؛ بۆیە هەستمان بەم بۆشاییە دەکرد. بە هاوکاری دۆستان (جەلیل ئازادیخواه، ئەنوەر ڕەوشەن ، محەممەد بانی و شێخ ڕەشیدی حسێنی و...) ساڵی ١٩٩٠ ئەنجومەنی فەرهەنگی ــ ئەدەبیی مەریوانمان دامەزراند. هەر لەو سەردەمانەدا بە هاوبیریی ئەندامانی ئەنجوومەن بیرۆکەی بڵاڤۆکی زرێبارمان داڕشت و دوای پێنج ساڵ مۆڵەتی بڵاو کردنەوەی پێدرا و لە پاییزی ساڵی ١٩٩٧ یەکەم ژمارەمان دەرکرد و تا ئێستاش کە ئەم وتووێژە ئەنجام ئەدەم، حەفتا ژمارەی لێ دەرچووە. بە خەیاڵی خاو لە بزاڤی دووەمی خورداد[١] پێشوازیم کرد و بۆ وەڵامدانەوەی هەندێ پتانسیەل، لە هەوەڵین هەڵبژاردنی شۆرای شاردا بەشداریم کرد. بەڵام هەر زوو سەرم دای لە بەردی پەشیمانی و پاشەکشێم کرد.

لەم دواییەدا بە هۆگەلی زۆر، وەك کار و وانەگوتنەوە و کارو باری ڕۆژنامەوانی ماندووییەك لەمندا سەری هەڵدا، پاشان بوو بە نەخۆشینی ڕۆحی و جەستەیی، بە ناوەخت دەستم لە مامۆستایی و وانە گوتنەوە هەڵگرت و ئێستاش خانە نشینم.»[٢]

عادڵ محەممەدپوور لە ماوەی ئەو چەند ساڵ هەوڵ و تێکۆشانەیدا، توانیویە ئەم

---

١. مەبەست دووی جۆزەردانی ١٣٧٦ی هەتاوییە کە لەم ڕۆژەدا محەممەدی خاتەمی بە دروشمی چاکسازییەوە بوو بە سەرۆك کۆماری ئێران.

٢. وت و وێژ لەگەڵ نووسەر.

بابەت و نووسراوانە پێشکەش بە گەل و نیشتمان بکات:

١ـ سرود خزان (تحلیل سبک شناسانه بیسارانی شاعر غنایی پەرداز) ناشر: زرێبار.

٢ـ شەبەنگی زوانی کوردی هۆرامی لە گاساکان تا... ناشر:چاپخانەی بابان.

٣ـ سۆزی لیریکا لە ئەزموونی شێعری کوردی، ناشر: ئیحسان، لە ژێر چاپ.

٤ـ زمانەوانی کوردی، ناشر: مەڵبەندی ڕۆشنبیری هەورامان، لە ژێر چاپ.

٥ـ ترجمه بە کوردی(دە ق و ڕاڤە) ناشر لە ژێر چاپ.

٦ـ کتێبی «ادوار شعر کوردی هورامی» ئامادەی چاپ.

زۆرتر لە چل وتار کە لەم گۆڤار و حەوتەنامانەدا بڵاو بوونەتەوە: سروە، ئاوێنە، ئاویەر، سیروان، ڕۆژهەڵات، ئاشتی، ئاسۆ، زرێبار، ڕامان، ئاینده، سەردەم.

ئەم نووسەرە لە زۆرێک لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانی ناوخۆو دەرەوەدا (وەک: کۆنگرەی بێسارانی، ناری، قانع، شەپۆل، هورامناسی، کۆنگرەی مەولەوی، کۆنگرەی مەستوورە، فستیواڵی گەلاوێژ و...)بەشداری کردووە.

**باقی سەفاری**

باقی سەفاری کوڕی وەستا عەباسی مسگەر، لە شاری پاوە، لە مانگی فەیبریەی ساڵی ١٩٥٨ی زایینی لە دایک بووە. تا پلەی شەشەمی دواناوەندی لەو شارە خوێندووە و پاشان لە پاییزی ساڵی ١٩٧٧ لە زانکۆی ڕازی شاری سنە لە بەشی کیمیا وەرگیراە. پاش کرانەوەی زانکۆکان لە دوای شۆڕشی گەلانی ئێران، بۆ خوێندن ڕوو لە شاری کرماشان ئەکات هەر لەوێ زانکۆ تەواو ئەکات و لە پاییزی ١٩٨٦ وەک مامۆستای قوتابخانەکانی مەریوان ئەرکی مامۆستایەتی پێ ئەسپێدرێت.

ئەوینی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردەواری هانی داوە دەست بۆ پێنووس درێژ کات. نازناوی شێعری «مسگەر»ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە. ئەو کارەیشی بە کۆکردنەوەی بە سەرهات و حیکایەت و هەر وەها ئەفسانەکانی ناوچەی هەورامانەوە دەست پێکردوە کە ساڵی ٢٠٠٢چاپ کراوە. دووهەم بەرهەمیشی ساڵی ٢٠١٠ بڵاو بۆتەوە. نوسراوەکانی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانی سیروان، زرێبار، ئاویەر و دەلاقەدا بڵاو

بوونەتەوە.

باقی سەفاری بە دنیایەک ئاواتی وەدی نەهاتووەوە بەهاری ساڵی ٢٠١٠ دڵە گەورەکەی لە لێدان کەوت و ماڵاوایی لە وێژەی کوردی کرد.

**حسێن فیداکار**

لە یەکەم ڕۆژی نەورۆزی ساڵی ١٩٥٨ی زایینی لە گوندی «نێ» لە بنەماڵەیەکی مام ناوەندی لە دایک بووە. باوکی مەلا محەممەد ئەمین و دایکی فاتمە خاتوونە.

خوێندنی سەرەتایی لە زێدەکەی دەست پێئەکات و لە بەر نەبوونی و هەژاری بنەماڵەکەی و بارودۆخی ژیانی گوندنشینی واز لە خوێندنی قووتابخانە دێنێت. لە دوای تەواو کردنی سەربازی و پێکەوەنانی ژیانی هاوبەشی، بژیوی لە ڕێگای کشت و کاڵ و شۆفیرییەوە دابین دەکات.

بۆ یەکەم جار و بە ڕێکەوت دیوانی شاعیری گەورە و نیشتمان پەروەری مەریوانی مامۆستا قانعی دەست ئەکەوێت و هەر ئەوەش ئەبێ بە هەوێنی گیرساندنی حەز و خولیای شێعر لەم شاعیرەدا.

بێبەش بون لە نێعمەتی دایک و ناسینی دوانزە باوەژن لە درێژەی تەمەنیدا، وای لێ ئەکات یەکەم بەرهەمی خۆی لە تەمەنی دوانزە ساڵیدا بە نێوی «باوەژن» بهۆنێتەوە.

یەکەم دەفتەری شێعری لە دوای شۆڕشی گەلانی ئێران و بە هۆی ئاڵۆزی باردۆخی ئەو ڕۆژەی کوردستان ئەشارێتەوە و دواتر ڕێی ناباتە سەر و وەک نووسراوەکانی زۆربەی شاعیرانی کورد ئەبێت بە پێخۆری گڵ!

ئەم شاعیرە ژیانی ڕۆژانەی خۆی و شێوە ژیانی شارێکی سەر سنوور و کوردنشینی وەک مەریوان، وەک شێعر و هەڵبەست و بە شێوەی تارۆز بە نێوگەلی: شلەخەجێی با هونەر، باوک و بۆڵدێزر، تویتای دوو هەزار و... هتد ئەهۆنێتەوە.

کاک حسێن خاوەن دوو دەفتەر شێعری کۆمەڵایەتی و نەتەوایەتیی و ئاڵوگۆڕی نامە و نووسراوەیە و جێگای ئاماژەیە کە پێش ئەوەی عەبدوڵڵا پەشێو بناسێ ماوەی سی و دوو ساڵە نازناوی «پەشێو»ی بۆ شێعرەکانی هەڵبژاردووە. ناوبراو ئێستا

دانیشتووی مەریوانە.

**«یاران بەینێکە»**

یـــاران بەینـــێکە فکـــرم مەشـــغوولّە
هەرچـــی ئەپێـــوم گەزەکەم کـــولّە
سەر لـێ شـێواوم وەکـوو سـەرعی و شـێت
ئەڕۆم بەڕێـــدا چـــپەی لێـــوم دێـــت
هەنگـاو هەڵـدەگرم بەرەو لـووتکەی یـاڵ
تـــا نـــاو قەد ئەڕۆم بە هەزار ئەحـــواڵ
پـــام هەڵ ئەکەوێ لە بەرد یـــا لە دار
دێمۆ بـۆ گـوێی چەم بـۆ جێـی یەکەم جـار
خـــودا بەخـــاتر ئەو پێغەمـــبەرە
نەجـــاتم بـــدەی لەو دەردی ســـەرە
هەر چەنـد کە «پەشـێو» خەجـاڵەت بـارە
چـــاوەڕێی لـــوتفی پەروەردگـــارە

**غەفوور(فەرەیدوون) بەهرامی**

غەفـوور بەهرامـی سـاڵی ١٩٥٨ی زایینـی لە گونـدی «هـانە گەرمەڵە» چـاوی بە ژیـان هەڵێنـاوە. بـاوکی «کـەیخوسـرەو» و دایکی «لەیلا» خاتوونە. سـەرەتایی خوێنـدنی تـا تەواو کردنـی قۆناغی ناوەندی لە زێدەکەی خۆی ئەمێنێتەوە. بۆ درێـژەدان بە خوێندن ئەچێتە شاری پاوە و لەوێ دیپلۆم وەرئەگرێـت. دوای سەرکەوتن لە تاقیکاری، لە ناوەندی بارهێنانی مامۆستایان لە شائاباد وەرئەگرێت و لە ساڵی ١٩٨٩ەوە خەریکی بە جێهێنانی ئەرکی مامۆستایەتییە.

سەرەتای چوونە ناو سارای شێعر و هەڵبەستی، ئەگەڕێتەوە بـۆ سـەردەمی منـداڵی، کە خوێندنەوەی شـێعری شـیرین و فەرهـاد، لەیلـی و مەجنـوون، ڕۆسـتەم و زۆراب، وەفات نامە و مێعراجنامە و ... شەوچەرەی ماڵانی کوردەواری بووە. بە وتەی خـۆی: «لە دامەزراندنی ئەنجوومەنی ئەدەبی پـاوەدا بەشـداری چالاکـانەی هەبـووە و هێـدی

هێدی هەستی خۆی بە نووسینی شێعر دەربڕیوە». ساڵی ١٩٩٤هەواری ژیانی بۆ مەریوان ئەگوێزێتەوەو بارودۆخی فەرهەنگی مەریوان دەلاقەیەکی نوێ بەڕویدا ئەکاتەوە. ئەم شاعیرە یەکەم بەرهەمی شێعری خۆی بە نێوی «هەوای محەمەد» پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی ئەکات.

## فاتح وەیسی

ساڵی ١٩٥٨ی زایینی لە گوندی «سەڵەسی» مەریوان چاوی بە ژیان هەڵێناوە. باوکی مەلا حەسەن و دایکی سۆیبە خاتوونە. تەمەنی یەک ساڵ ئەبێ کە کۆچ ئەکەنە گوندی شارانی. لە شەش ساڵیدا نراوەتە بەر خوێندن، لەخزمەت باوکیدا قورئان ئەخوێنێت و هاوکات کتێبێ پۆلی یەکیش تەواو ئەکات. تا پۆلی شەش درێژە بە خوێندنی قوتابخانە ئەدات و لە سەر خواستی باوکی قوتابخانە بە جێ دێڵێت و ئەڕواتە حوجرە و لە گوندەکانی کانی‌سانان، سەرنژمار، باشماخ و ئەڵمانە و دواتر سنە وانەی مەلایەتی ئەخوێنێت. هاوکات بە شێوەی شەوانە لە قوتابخانەش درێژە بە خوێندن ئەدات.

ساڵی ١٩٧٩ لە ئیدارەی بەربەرەکانی لە گەڵ بێسوادی (پیکار با بیسوادی) دائەمەزرێ. پاش شۆڕشی گەلانی ئێران دژ بە دەسەلاتی پاشایەتی، پەیکار هەڵ ئەوەشێتەوە و ئەدرێ بە دایەرەی پەروەردە و بارهێنان. دوای چەند ساڵ مامۆستایەتی لە گوندەکان و لە شاری مەریوان، ساڵی ١٩٨٤ لە سەرکار وەلائەنرێت.

ماوەیەک مەریوان بە جێ دێڵیت و دوای هەڵگیرسانی شەڕی ئێراق و ئێران لە ساڵی ١٩٨٥دا ئەگەڕێتەوە مەریوان و ئەبێ بە دوکاندار، ئاخر مانگی زستانی ئەو ساڵە مەریوان بۆردوومان ئەکرێ و زامدار ئەبێ.

وێڕای هەبوونی ماڵ و خێزان خولیای فێر بوون هانی ئەدات کە لە کاتی ئاوارەییدا دیپلۆم وەربگرێت و لەتاقیکاری کونکوری ساڵی ١٩٩٤ لە زانستگای عەلامەی تاران لە ڕشتەی علوم ارتباطات وەرئەگیرێت و ئەو قۆناغەش سەرکەوتووانە ئەبڕێت.

ئەم نووسەرە وێڕای ئاوارەیی و کەم ئەندام بوون و چەرمەسەرێی زۆر، خەریکی کاری فەرهەنگی بووە و وازی لێ نەهێناوە و ئەمەش کارنامەی فەرهەنگییەتی:

١ـ کوردستان و ڕۆژنامەگەری، ئامادەی چاپ.
٢ـ مەریوان لە ڕووپەڕی مێژوودا، ئامادەی چاپ.
٣ـ نووسینی سێ شانۆنامە بە ناوەکانی: دز و بۆقلە، دز و نۆکەر و فریشتەکانی هیلال ئەحمەر.
٤ـ کۆکردنەوەی فەرهەنگێکی کوردی پێکهاتوو لە گشت زاراوە کوردییەکان (هێشتا تەواو نەبووە).

## سەید ئەحمەد حسێنی (دڵپڕ)

ئەم شاعیرە کوڕی شێخ عەبدول کوڕی شێخ عەلی کوڕی شێخ عارفی دۆڵاشە و دایکی مینا خاتون کچی حەمە سەعی کوڕی سۆفی حسێنی دەرەتفێیە.

ساڵی ١٩٥٩ی زایینی لە گوندی «کانی‌سانان» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. دوا منداڵ لە هەشتەمین منداڵی بنەماڵەکەیەتی.

ساڵی ١٩٦٥ ناردویانەتە قوتابخانە و تا پۆلی شەشەمی سەرەتایی دەرسی لە قوتابخانە و قورئانی لە مزگەوت خوێندووە. لە بەر بارودۆخی لاوازی ئابووری بنەماڵەکەی نەیتوانیوە درێژە بە خوێندن بدات.

لە دوای ماڵئاوایی لە قوتابخانە شان بە شانی باوکی دەست بەکاری کشت و کاڵ و جووتیاری ئەکات و تا هەنووکەش کە پەنجا و یەک ساڵ تەمەنییەتی هەر خەریکی ئەو ئیشەیەیە. بە واتای خۆی نانی سەربەرزی و حەلاڵی بە ماڵ و منداڵی داوە. ئەو شەش ساڵ خوێندنە کاریگەرییەکی زۆری لەسەر دائەنێ و بە واتای خۆی دنیایەک بایەخ و قیمەتی بۆی هەبووە. هەرچەند لەو سەردەمەدا کتێب و نووسراوە و مامۆستای ڕێزمانی کوردی زۆر کەم بووە و بەدەگمەن دەسکەوتوون، بەڵام ماڵی ئەمان خاوەنی کتێبخانەیەکی نایاب بووە و لە سەر حەز و خواست و لێبڕانی خۆی فێری کوردی خوێندن و نووسین ئەبێت. شێعرەکانی شاعیری گەورەی بنەماڵەکەی «مامۆستا قانع» ئەبێ بە هەوێنی گیرساندنی شێعر لە بیر و هزریدا. ساڵی ١٩٧٤ بۆ کاریگەری ئەچێتە باشووری ئێران و لە گەڵ چەند کوردی ئاوارەی هاوزمانی خۆی کە دوای پەیمانە نگریسەکەی ئەلجەزایر لە ئێراقەوە چوو بوونە ئەوێ، ئاشنا ئەبێت و بیری نەتەوەیی و

خۆشەویستی گەل و نیشتمانەکەی لە دەروونیدا ڕیشە دائەکوتێت.
هەست بە خەم و ناسۆرەکانی گەل وای لێ ئەکات لە گەڵ پێنووس ببێتە هەڤاڵ و زاخاوی دڵی لە سەر پانتای سپی و بێگەردی پەڕاو هەڵڕێژێت.
ئەم شاعیرە خاوەنی سێ دەفتەر شێعرە بە ناوەکانی «نەکەرۆز»، «گڕ و گڵپە»، «پیرەکچ» کە ئامادەی چاپن بەڵام تا ئێستا بۆی نەلواوە بڵاویان بکاتەوە. هەروەها کورتە باسێکی لە سەر ژیان و کەسایەتی مامۆستا قانع ئامادە کردووە.
ئەم بەڕێزە ئێستا دانیشتووی گوندی «کانی سانان»ە و سەرقاڵی کشت و کاڵە. بە وتەی خۆی ڕۆژانە هەوای هاوینە هەواری گوێزە بەیخانی دۆڵاش هەڵئەمژێت.

**«ژینی مەردانە»**

بە نانی وشکی و چۆڕێ ئاوی کاڵ
ژین بەریتە سەر بە درێژایی ساڵ
لەوە باشترە نۆکەری میر بێ
بە سکی تێر و بە دەمی بەتاڵ
بژیت بە سەر بەرز با برسیشت بێ
نەک پەت لە مل بی وەک تانجی و گەماڵ
نان خەنە بەرت تێرت کەن بۆ ڕاو
ئەویش چ ڕاوێک ڕاو هاوسێ و هاوماڵ
مردن باشترە لە ژینێ وایە
ئاغە تاوێ شەق تاوێک قسەی تاڵ
بڕۆ وەک هەڵۆ بژی بە بەرزی
نەک بە وێنەی قەل سەلوێنک و لاچاڵ
قارەمانانە عومرت تێ پەڕکە
پەلامار ببە وەک ڕۆستەمی زاڵ
ورگت شۆڕ مەکە بۆ چڵکاو خواردن
قەناعەت بکە بە کولێرەی گاڵ

له گه‌ل ئه‌وه‌شـــدا بـــۆ مـــافی ڕه‌وات
هه‌ڵمه‌ت به‌رێ به‌، وه‌ک هه‌ڵۆی سه‌ر یاڵ
تـۆ خـوا گه‌ر ناشبی به گـوڵ بـۆ کـۆمه‌ڵ
مه‌شـــبه به چقـــڵ و هه‌ژگ و دڕک و داڵ

## عه‌بدوڵلا ڕه‌حیمی

له ٢٣ی دیـــسه‌مبه‌ری ســـاڵی ١٩٥٩ی زایینـــی له گونـــدی «چه‌شمیه‌ر» له ناوچه‌ی ژاوه‌رۆ چاوی به ژیـان روونـاک بـووه. ژیـانی منـداڵی له سـه‌رده‌مانی ده‌سـه‌ڵاتی ڕژیمـی پاشـایه‌تی‌دا تێپه‌ڕاندووه.

قۆناغی سه‌ره‌تایی له لای ئه‌و مامۆستایانه بڕیوه که له ته‌وڕێز و سنه و... ئه‌هاتن. ئه‌و سه‌رده‌مه خه‌ڵکی ناوچه‌که نه‌خوێنده‌وار بوون و له شـوێنگه‌لی تره‌وه مامۆستایان بۆ هاتووه. به بۆنه‌ی باو بوونی دارکـاری و فه‌لاقه له قوتابخانه‌کـانی ئه‌و سه‌رده‌مه‌دا، خوێندن بۆ قوتابی زۆر سـه‌خت و دژوار بـووه به چه‌شـنێک که زۆر جـار منـداڵان له ترسـی چـوون بـۆ قووتابخـانه له نـاو که‌نـووه قـوڕینه‌دا خۆیـان شاردووه‌ته‌وه.

یه‌کێ‌تر له‌و شتانه‌ی له‌و سه‌رده‌مه‌دا کاریگه‌ری نیگه‌تیڤی بووه مردنـی خه‌ڵـک به هۆی نه‌خۆشی سیل بووه. وه‌ختێ پیت گه‌لی «د.د.ت»یان له سه‌ر ده‌رکی هه‌ر ماڵێک ببینیـایه‌ت وایـان ئه‌زانـی که ئه‌و بنه‌مـاڵه‌یه بـۆ باشـووری ئێـران یـان بـۆ ته‌وه‌س ڕائه‌گوێزرێن!!!

کـــۆچی دوایـــی بـــاوکی له مـــانگی ئۆکتـــۆبر(یه‌که‌م ڕۆژی ده‌ســـپێکردنی قوتابخانه‌کان)، هاوکات بـوو له گه‌ڵ خوێنـدنی عه‌بـدوڵلا له قۆنـاغی ناوه‌ندیـدا. هه‌ر بۆیه‌ش کۆسپێکی تری هاته سه‌ر ڕێگه. له به‌ر نه‌بوونی و هه‌ژاری بـۆ کرێکـاری ڕوو له شـاری تـاران ئه‌کـات، هاوکـات له گه‌ڵ ئه‌وه‌ش هه‌ر له تـاران به شـێوه‌ی ئـازاد (موته‌فه‌ریقه) قۆناغی دوا ناوه‌ندی ئه‌خوێنێت ودیپلۆم وه‌رئه‌گرێت.

ســـاڵی ١٩٨٧ وه‌ک مامۆســـتا له نێهزه‌تـــی فێرکـــاری (نهـضت سـواد آمـوزی) دائه‌مه‌زرێـت و درێـژه‌ش به خوێنـدن ئه‌دا و به‌کالۆریۆسـی «په‌روه‌رده‌ی سـه‌ره‌تایی»

(آموزش ابتدایی) وەرئەگرێت.

عەبدوڵڵا یەکەم بەرهەمی خۆی لە ژێر ناوی «گاو گۆراڵ» چاپ و بڵاو ئەکاتەوە. هەروەها بە هاوکاری چەند کەسێکی تر دیوانی «مەلا عەبدوڵڵا وەهابی ئاریانی» بە ناوی دیوانی «بەدبەخت» کۆ کردووەتەوە کە ئەویش ئامادەی چاپ و بڵاو بوونەوەیە. ئێستاش مامۆستای قووتابخانەکانی مەریوانە.

## مەهین بەهرامی کەمانگەر

ڕۆژی بیست و یەکەی ئاوریلی ساڵی ۱۹۵۹ی زایینی لە مەریوان چاوی بە ژیان هەڵێناوە. لە بەر ئەوەی باوکی پیشەی نیزامی بووە هەر پۆلێکی لە شارێك و لە مەڵبەندێك خوێندووە. قۆناغەکانی خوێندنی سەرکەوتووانە لە سنە و مەریوان و هەمەدان و بیجاڕ بڕیوە.

ڕوو لە ناوەندی بارهێنانی مامۆستایان لە شاری سنە ئەکات. دوای دوو ساڵ ونیو لە ساڵی۱۹۷۸ دا بە بیرێکی گەشاوە و زانستییەوە بەرگی مامۆستایی لە بەردەکات و لە زێدەکەی خۆی وانە ئەڵێتەوە. لە گەڵ نەخۆشی شێرپەنجە دەست بە ئێەخە بووە و ژیان بە خەبات دەزانێت.

خاتوو مەهینی کەمانگر شان بەشانی ئەرکی مامۆستایەتی توانیویەتی لە بواری نووسیندا خزمەتی بەر چاو بکات.

**کارنامەی فەرهەنگیی ئەم ژنە نووسەرە:**

**بڵاوکراوە:**

۱ـ تغذیە و تندرستی(لە ژێر چاوەدێری پرۆفیسۆر و پسپۆڕی خۆراک) دوو جار لە چاپ دراوە. ۲ـ آشپزی مریوان، دوو جار لە چاپ دراوە.

**بڵاونەکراوە:**

۱ـ تاریخ مریوان. ۲ـ شاعران و نویسندگان مریوانی. ۳ـ لێکۆڵینەوە لە سەر(کانسر) شێرپەنجەکان. ۴ـ بەسەرهاتی ژنێك کە هەرگیز نەحەساوەتەوە.

## ئەمین عەزیزی

لە سەرەتای بێ بەرگی و ڕوسووری باخ و ڕەزەکانی کوردستان ساڵی ١٩٦١ی زایینی لە گەڕەکی هەژارەی مەریوان چاوی بە دنیا هەڵێناوە.

دەسپێکی بەهاری زانستی تا وەرگرتنی دیپلۆم هەر لە مەریوان بووە. لە سەردەمی شۆڕشی ١٩٧٩ی ئێران بە داخەوە درێژەی خوێندنی پەکی کەوتووە.

تێکۆشانی فەرهەنگی و هونەری خۆی لە ساڵی ١٩٧٨ لە ناوەندی «قوتابی - خوێندکاری» مەریوان، کە لە لایەن کۆمەڵێک خوێندکار و قووتابیانی ئەو سەردەمە پێکهاتبوو، دەست پێئەکات. لە کومیتەکانی چاپ و بڵاوکردنەوە و شانۆ و وەرگێڕانی «ناوەندا» بەشداری چالاکانەی هەبووە. لەو کاتەدا بۆ یەکەم جار کتێبی «ماسیە ڕەشە بچکۆلەکە»ی سەمەدی بێهرەنگی، بە زمانی کوردی چاپ و بڵاو ئەکاتەوە. هەر وەها لە دامەزراندنی پۆلەکانی فێرکاری زمانی کوردیدا بەشداری کردووە. لە گرووپە شانۆییەکانی ئەو سەردەمەدا وەک؛ ئەکتەر، شانۆنووس و هاوکاری دەرهێنەر تێکۆشانی چالاکانەی هەبووە.

خولی دووهەمی تێکۆشانی فەرهەنگی خۆی و ژیاندنەوەی قەڵەمەکەی بە بەشداری و هاوکاری لەگەڵ ئەنجوومەنی فەرهەنگی ـ ئەدەبیی مەریوان دەست پێئەکاتەوە. خولێکی دوو ساڵەش ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری ئەنجوومەن بووە. هاوکات خەریکی وەرگێڕان بووە و بەرهەمەکانی لە گۆڤاری ئاسۆ و ڕەوتدا بڵاو بوونەتەوە.

ئەم پێنووس بەدەستە ئێستاکە دانیشتووی مەریوانە و ئەندامی دەستەی نووسەرانی بڵاڤۆکی «چیا»یە و پیشە و کاری ئازادی هەیە.

## جەماڵ ئێرانی

ساڵی ١٩٦١ی زایینی لە گوندی «نیاوا» لە دایک بووە. قۆناغی سەرەتایی لە گوندەکەی خۆی و قۆناغی ناوەندی تا دوا ناوەندیش لە سەولاوا دەرسی خوێندووە. ساڵی ١٩٨٤ لە سنە

دیپلۆمی وەرگرتووە و هەر لەو ساڵەشدا لە بەشی مامۆستای جۆغرافیا لە زانکۆی تاران وەرئەگیرێت. هاوکات لە گەڵ درێژەی خوێندنەکەیدا وەک مامۆستا لە قوتابخانەکانی تاران وانە ئەڵێتەوە و وەک یاریدەری مامۆستای زانکۆش کار ئەکات. ساڵی ۱۹۸۸ بەکالۆریۆس وەرئەگرێت.

هەر لەو ساڵەدا بۆ خوێندنی ماستەر لە بەشی «جۆغرافیای سروشتیدا» قبوول ئەبێت.

لە ساڵی ۱۹۹۱ دا بە دنیایەک زانست و دڵسۆزییەوە بۆ پارێزگای کوردستان ئەگەڕێتەوە و لە مەریوان ئەرکی مامۆستایەتی وەئەستۆ ئەگرێت. دواتر وەک مامۆستای زانکۆ و ناوەندی بارهێنانی مامۆستایانی شاری سنە درێژە بە ئەرکەکەی ئەدات و هاوکاتیش چالاکیە فەرهەنگی ـ زانستییەکانی خۆی دەست پێئەکات.

ساڵی ۲۰۰۱ تا ۲۰۰۶ بە بۆنەی چالاکییەکانییەوە وەک مامۆستای نموونەی وڵات هەڵ ئەبژێریەت. هەنووکەش دانیشتووی سنەیە.

ئەم مامۆستایە ئەرکێکی زۆری بۆ ناساندنی شوێنەوارە مێژووییەکانی پارێزگای کوردستان و شوێنە توورستییەکان و بە تایبەت گۆلی زرێبار کێشاوە. ئەمانەی خوارەوە بەشێکن لە چالاکیە زانستی و فەرهەنگییەکانی ئەم مامۆستایە :

۱- جغرافیای استان کردستان، ناشر:شرکت چاپ و نشر کتاب‌های درسی ایران.

۲- آزمون‌های طبقه بندی شده‌ی هدفدار جغرافیا، انتشارات علوی، تهران.

۳- جغرافیای طبیعی کردستان.

۴- توریسم با تاکید بر جاذب‌ه‌های گردشگری استان کردستان، ناشر، آماده چاپ.

۵- جغرافیای استان کردستان، کتاب درسی نهضت سواد آموزی، همکاری مولف، ۱۳۸۵.

۶- بەرپرسایەتی گۆڤاری ژینگە.(ئەم گۆڤارە شەش ساڵە لە لایەن مامۆستایانی جۆگرافیای کوردستانەوە دەرئەچێت)

جیا لە مانە بڵاوکردنەوەی چەندها وتار لە گۆڤار و حەوتەنامەکانی، رشد آموزش جغرافیا، ژینگە، علوم زمین، فرهنگ کردستان، ئاویەر، باران و ...

**فاتح ڕەحیمی**

مانگی ئـووتی سـاڵی ١٩٦١ ی زایینـی لە گونـدی «هانەگەرمەڵە» لە بنەماڵەیەکی هەژار و کرێکار چاوی بە ژیان هەڵێناوە. ساڵی ١٩٦٨خوێندنی سەرەتایی لە گوندەکەی خۆی دەست پێئەکات. هەر لە قۆناغی سـەرەتاییدا دەبـێ کە بـاوکی ماڵئاوایی لە ژیان ئەکات و سەرپەرشتی فاتح و پێـنج خوشـک و برابچکۆلەکەی ئەکەوێتە ئەسـتۆی دایکێکـی دڵسۆز و زەحمتکـێش و بە خـوری ڕستن و جاجم کردن بژیوی ژیانیان بۆ دابین دەکات.

لە قۆنـاغی ناوەنـدنی دەرس خوێنـدنی ئەم نووسـەرەدا دایکیـشی ماڵئاواییـان لـێ ئەکـات. ئەرکـی دابـین کردنـی ژیـانی خوشـک و براکـانی ئەکەوێتە ئەسـتۆی مێـر منداڵێکی قوتابی و نەدار. لەگەڵ بەخێـو کردنـی ئەوانـدا درێـژە بە خوێنـدن ئەدات و ساڵی ١٩٧٧ لە تاقیکردنەوەی مامۆستایەتی گوندەکاندا بەشـداری ئەکـات و بە پـلەی بەرزەوە وەرئەگیرێـت. دوای دوو سـاڵ دەرس خوێنـدن، لە گونـدەکانی نـاوچەی نەوسود وانە بە قوتابیانی ڕەش و ڕووت ئەڵێتەوە.

خولیـای فێـر بـوون هـانی دەدات کە لە سـاڵی ١٩٨٨دا لە تـاقیکردنەوەی گـشتی زانکۆدا بەشداری بکات. لە بەشی زمـان و ئەدەبیـاتی فارسـی زانکـۆی کوردسـتان لە (سنە) وەرئەگیرێت. دوای تەواو کردنی خوێنـدنی زانکـۆ وەک مامۆسـتای قونـاغی دواناوەندی لە نۆدشە و باینگان درێژە بە مامۆستایەتی ئەدات و سـاڵی ١٩٩٥خـۆی بـۆ مەریوان ڕاگویێز ئەکات. لە دوای سی ساڵ مامۆستایەتی و خزمەت کردن بە منداڵانی گەلەکەمان لە ساڵی ٢٠٠٨ دا خانەنشین ئەبێت.

**کارنامەی فەرهەنگی ئەم نووسەرە:**

١ـ دستور زبان کردی(هەورامی). ٢ـ «فەرهەنگنامەی هەورامی ـ فارسی» ئامـادەی چاپ. ٣ـ «بیان در شعر اورامی»، ئامادەی چاپ. ٤ـ «بدیع در شـعر اورامـی»، ئامـادەی چاپ. ٥ـ لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی دیوانی مەولەوی و ئەحمەد بەگی کۆماسـی، پـرۆژەی بەردەست.

## کوێستان یەزدان پەرست

لەیەکەم ڕۆژی وەرزی پاییزی ساڵی ١٩٦١ی زایینی لە شارۆچکەی «پێنجوێن» چاوی بەم دنیا هەڵێناوە و کچی مستەفا بەگی بانەیە.

لەدوای دەست پێکردنی شەڕی ناوخۆی ئێراق بە هۆی کوودتای عەبدولکەریم قاسمەوە ئێراق بوو بە کۆمار و کوردیش کە ڕاپەڕی و داوای مافی خۆی کرد، زۆربەی بەرە و ئێران ڕاو نرا. بنەماڵەی کوێستان خان ئاوارە بوون و لە مەریوان گیرسانەوە.

لەتەمەنی هەشت ساڵاندا بۆی دەرکەوت کە ئەتوانێت هەستی خۆی بە هۆنراوە دەربرێت. بەم چەشنە شێعر لە دەروونیدا ڕیشە دائەکوتێت. بەڵام لە بەر دەمارگرژی کۆمەڵایەتی لەو سەردەمەدا ناتوانێت هۆنراوەکانی دەربخات.

ساڵی ١٩٨٦بڕیار ئەدا هۆنراوەکانی بۆ بنەماڵەکەی بخوێنێتەوە کە ئەوانیش - بەتایبەت باوک و براکەی -لەو پەڕی ڕێزدا پێی خۆشحاڵ ئەبن و لەو ڕۆژەوە هاندەر و پشتگیری ئەبن.

جێگای ئاماژەیە ئەم شاعیرە بە زگماکی کەمئەندام هاتۆتە دنیا. بەڵام بە وتەی خۆی: «هەستی شێعر ئەم کەمئەندامییەی لەبیر بردومەتەوە.» شێعرەکانی ئەم شاعیرە لە دوو توێی دەفتەرەکانیدا ماونەتەوە و نەیتوانیوە لە چاپیان بدات.

وەک پەروینی ئیعتسامی ژیانی هاوبەشی ئەمیش زۆری نەخایاندووە و لە بەر نەخۆشی و وشک بوونی لاقەکانی دوای بەجێ هێشتنی منداڵێک لە گەڵ دایکیدا ئەژی.

**«مەریوان»**

من ڕۆڵەی کوردستانم
بە هەست و سۆز و گیانم
خۆشەویێ مەریوانم
مەڵبەند و نیشتمانم
شارم نەخشین و جوانە
هەوارگەی میوانانە
گۆمێ شین ئەشنێتەوە
خەم لە بیر ئەباتەوە
دڵ ڕفێنە ئاهەنگی
هاژە و شەپۆل و دەنگی
لە داوێن کێوەکانە
چیا و شاخ و هەردانە
زرێبار هەڵ قوڵاوە
وێنەی بەهەشت ڕازاوە

جێـــی ســـەیرانگای یـــارانە ئاشـــــــق و دڵ دارانە
وەفـــادارم تـــا مـــاوم ئەی پـــارێزم وەک چـــاوم

**جەلیل عەباسی (قەقنەس)**

جەلیل عەباسی ناسراو بە «قەقنەس» حەوتـی ژوئەنـی سـاڵی ١٩٦٢ی زایینی لە گوندی «کێمنە»ی سەر بە هەورامانی لهۆن لە دایک بووە. خوێندنی سەرەتایی لەوێ دەسـت پێکـردووە و لە شارەکانی تاران و پاوە و مەریوان تا قۆناغی دواناوەندی بڕیـوە. لە گەڵ تەوژمـی ئـاوارەیی بە هـۆی شـەڕی ئێـراق و ئێـرانەوە هاتووەتە شاری مەریوان و زۆرتر لەم شـارە ژیـاوە. ژیـانی تەژی بـووە لە ئـاوارەیی و ڕاوەدوونـان و... لە سـاڵی ١٩٨٥ ژیـانی هاوبەشـی پـێکەوە نـاوە و لەسـاڵی ١٩٩٩وە لە هەولێر گیرساوەتەوە و لەوێ ئەژی.

**بەرهەم و چالاکییەکانی:**

١ـ بەرپرسی نووسین و ئامادە و پێشکەشکاری بەرنامەکانی ڕادیـۆ و تەلەفزیـۆن لە سنە و مەریوان.

٢ـ لە دامەزرێنەرانی ئەنجوومەنی ئەدەبیی مەریوان.

٣ـ دامەزرێنەر و بەرپرسی کۆمیسیۆنی فەرهەنگی لە شۆرای شاری مەریوان.

٤ـــ دامەزرێـنەر و گـوتەبێژی (کـۆمەڵەی پـارێزەرانی کۆمەڵگـای مەدەنـی لە کوردستان).

٥ـ دامەزرێنەر و ئەندامی دەستەی نووسەرانی هەفتەنامەکانی (تیشک) و(میراجی) و (ئەندیشە) لە مەریوان.

٦ـ دامەزرێنەر و ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری زرێبار لە مەریوان.

٧ـ دامەزرێنەر و ئەندامی دەستەی کـارگێڕیی «کـانوونی نووسـەرانی کوردسـتان» بنکە لە نۆروێژ.

٨ـ ئەندامی ڕێکخراوی «pen»ی نۆروێژ.

٩ـ ئەندامی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان.

١٠ـ ئەندامی فیدراسیۆنی ڕۆژنامە نووسانی نێودەوڵەتی.

١١ـ ئەندامی دەستەی نووسەران و بەرپرسی مەلەفی دەق لە گۆڤاری کاروان.

١٢ـ سەرنووسەری ڕۆژنامەی شارۆ.

١٣ـ نووسەری ستوونەکانی؛ فەرهەنگی یەسنا لە گۆڤاری گوڵان و فەلسەفەی ئەشا لە ڕۆژنامەی بەدرخان و ئاهووورامان لە ڕۆژنامەی نوێ و ....

**پەرتووکە چاپ کراوەکان:**

١ـ ئاڤێستا مێژینەترین سروودی کورد، بەرگی یەکەم، گاتاکان/ پڕۆژەیەکی شەش بەرگی.

٢ـ ئاهورامان، بەرگی یەکەمی ڕوانگە/ پڕۆژەیەکی هەشت بەرگی.

٣ـ یەلدای شووم، کۆ شێعر.

٤ـ ژوانی یەسنا: بەشی یەکەم.

٥ـ نامەیەك بۆ باوکم، فرانتس کافکا.

٦ـ دوایین ژێر دەستە، کێشەی باکووری کوردستان لە سەرەتاوە تا ئەمڕۆ.

٧ـ ئێستا لە نێوان دوو هیچدا، هەڵبژاردەی شێعرەکانی نیچە.

٨ـ هەورامان و هونەر: بەرگی یەکەم/ پڕۆژەیەکی چواربەرگی.

## عەلی مەحموودی

لە٨ی ژانویەی ساڵی ١٩٦٢ی زایینی لە گوندی «گۆشخانی»، لە بناری کێوی کوڕەی میانە، لە بنەماڵەیەکی مام ناوەندی چاوی بەم دنیایەدا هەڵێناوە. قۆناغەکانی خوێندنی تا دواناوەندی درێژە پێئەدات. لە سەردەمی شەڕی ناو خۆی کوردستاندا بە تاوانی هاوکاری کردن لە گەڵ لایەنێکی سیاسی کوردیدا بۆ ماوەی بیست مانگ زیندانی ئەکرێت و لە درێژەی خوێندن و پیشەی حکوومی بێ بەش ئەبێت.

عەلی لە بواری فەرهەنگیدا یەکێکە لە چالاکانی شاری مەریوان و تا هەنووکەش ئەم ئەرکە فەرهەنگییانەی وەئەستۆ گرتووە:

١ـ «هەڵپەڕکێ»، ئامادەی چاپ.

٢ـ «وتە بەنرخەکانی زانا گەورەکان»، ئامادەی چاپ.

٣ـ ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری ئەنجومەنی فەرهەنگی ئەدەبی مەریوان.

## فایەق باتەش

فایەق باتش کوڕی عەبدولڕەحمان و ڕەحمە خاتونە، یەکەم ڕۆژی وەرزی بەهاری ساڵی ١٩٦٣ ی زایینی لە گوندی «وشکێن» لە بنەماڵەیەکی هەژار لە دایک بووە. لە تەمەنی حەوت ساڵاندا نراوەتە بەرخوێندن و قۆناغی سەرەتایی هەر لە زێدی خۆی تەواو کردووە. بۆ درێژەدان بە خوێندن نراوەتە شاری مەریوان و قۆناغی ناوەندیش هەر لەم شارە تەواو ئەکات. بە داخەوە لە بەر هەژاری و دەست کورتی بنەماڵەکەی، ناتوانێت درێژە بە خوێندن بدات.

هەست بەمە ئەکات کە ئەتوانێت، قسەکانی خۆی بۆ منداڵان بهۆنێتەوە. دەست بۆ پێنووس ئەبات و یەکەم بەرهەمی بۆ کۆرپەلەکان بە ناوی «پەپوولەکانی بەیان» بڵاو ئەکاتەوە.

## ئەنوەر ڕەوشەن

مانگی سپتەمبەری ساڵی ١٩٦٤ی زایینی لە بنەماڵەیەکی مام ناوەندی لە شاری مەریوان لە دایک بووە. باوکی کەریم و دایکی فەهیمە خاتوونە. بنەماڵەی باپیری یەکێک لەو بنەماڵە قەدیمییانە بوون کە بنەچەی شاری مەریوانیان دامەزراند. خوێندنی سەرەتایی تا دەبیرستانی هەر لە قوتابخانەکانی مەریوان تەواو کردووە. بەکالۆریۆسی ئەدەبیاتی فارسیشی لە سنە وەرگرتووە. ئێستا مامۆستای ئەدەبیاتی فارسی قۆناغی دواناوەندییە لە مەریوان.

هەر لە منداڵییەوە خولیای ئەدەبیاتی نەتەوەکەی بووە. لە ساڵانی خوێندنی ناوەندییەوە جاروبار بە زمانی کوردی هەستی ساکاری دەورانی لاوییەتی بە شێوەی شێعر و پەخشان دەنووسی. لە گەڵ دامەزرانی گۆڤاری سروە بە نووسینی وتار هاوکاری ئەکات و پاش تەواو بوونی شەڕی نێوان ئێران و ئێراق و گەڕانەوەی لە ئاوارەیی بۆ شاری مەریوان، لە گەڵ دەستەیەک لە هۆگرانی ئەدەبیاتی کوردی،

ئەکەوێتە بیری دامەزراندی ئەنجومەنی ئەدەبی. نیزیکەی دە ساڵ وەک بەرپرس یان جێگری بەرپرسی ئەنجومەن خەریکی چالاکی ئەدەبی و ڕۆشنبیری بووە.

ئەنوەر ڕەوشەن سێ ژمارە ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری زرێبار بووە. چەند ژمارەیەکیش کارەکانی حەفتەنامەی تیشکی ڕێک خستووە.

ئێستاش ئەم نووسەرە وەرگێڕانی نۆوێلێک، دەفتەرە شێعرێک و کۆمەڵە چیرۆکێکی ئامادەی چاپە. هەروەها سێ فیلمی دۆکیۆمێنتاری سەبارەت بە زرێبار و قەڵای مێژوویی مەریوان و بەردە بووکەکان ئامادە کردووە.

## «تاوانی بوون»

لەو ساتەوە زەوی خۆی ناسیوەتەوە

جەرگی هەستم هەڵ ئەقرچێ

شیری شۆڤار

پشتی یەکڕەنگیم هەڵ ئەدڕێ

لەو ساتەوە زەوی خۆی ناسیوەتەوە

چرۆی ئەشقی چڵی حەزم

بە کۆرپەیی شەهید ئەکرێ

زریان و ڕەشەبای دڕیان

بە گڕ گری مۆمی ئەندێشەما ئەچێ

ساڵهای ساڵە

خەمی نەزۆک بوونی چرۆ

چاوی سروە ئەکاتە خەو

پڵنگی یاخی دارستانم، ڕاو ئەکەن شەو

ساڵهای ساڵە

کراسی سووری مێژووی منیان

کردوه بە بەرگی ئەندێشەی
ئەم گۆی ئەرزە
ساڵهای ساڵە
بزەی لێوم تەنیا تۆزێ، باڵا ناکا و بە بێ خەندە
کە هەستیان کرد
هەستم قەت سوێی نابێتەوە
بزەی سەرلێو ناسڕێتەوە
چرۆی ئەشقم
دیسانەوە گۆپکە ئەکا
شۆڵەی بیرم هەڵدێتەوە
پەڵە شەرمێ
لە نێو چاوی مێژووی زەوی درایەوە
بۆ چاوترسان
هەتاوێکیان لە خوێن گەوزاند
هەناسەی شارێکمیان تاساند
هەزار هەزار گوڵیان ژاکاند
بەڵام دیسان
پەیکەرم بوو بە دارستان
پڵنگی یاخی، دڕ دڕ، دڵپڕ
کەوتنەوە خۆ حەشاردان

## ساڵح حەبیبی

ساڵی ۱۹۶۴ی زایینی لە گوندی «مازیبن» لە ناوچەی ژاوەرۆی مەریوان لە بنەماڵەیەکی جووتیاردا لە دایک بووە. کوڕی عەلی محەممەد و شیرین خاتوونە. باوکی خۆی بە چاو نەدیوە. لە تەمەنی هەشت ساڵیدا لە باوەشی گەرمی دایکیش بێ بەش ئەبێت و بە خێو کردنی ئەکەوێتە ئەستۆی برا و براژن.

قۆناغی سەرەتایی لە زێدەکەی خۆی تەواو ئەکات و ساڵی ۱۹۷۴ بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕوو لە شاری مەریوان ئەکات. ساڵی ۱۹۸۳ بە مەبەستی درێژەدان بە خوێندن بەرە و سنە، مەریوان بە جێ دێڵێت. ساڵی ۱۹۸۴دیپلۆم و ساڵی ۱۹۸۶یش فەوق دیپلۆم لە بەشی جۆغرافیدا وەرئەگرێت. ئەبێ بە مامۆستا و وانە گوتنەوە بە قوتابیانی ڕەش و ڕووت ئەبێ بە شەوچەرەی ژیانی.

ساڵی۱۹۷۴ برایەکی لە شاری مەهاباد سەرباز ئەبێت. دیوانێکی مەولەوی تاوەگۆزی لە گەڵ خۆی بە دیاری دێنێتەوە. ئەو دیوانە ئەبێ بە هەوێنی حەز و خۆشەویستی بەرانبەر بە ئەدەبی گەلەکەی.

**کارنامەی فەرهەنگی ئەم نووسەرە:**

١ـ وەرگێڕانی کتێبی «آهوی بخت من غزال» بۆ سەر زمانی کوردی.

٢ـ کۆمەڵە شێعر.

٣ـ وەرگێڕانی بڕێک لە شێعری شاعیران وەک: سوارە ئیلخانی زادە، حەسەن ڕەنجبەر، مەنیژە گوڵچین، جوبران خەلیل جوبران.

۴ـ هاوکاری کردن بە وتار لەگەڵ ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی: زرێبار، باران، تیشک، سیروان و ...

## ئەرسەلان عەزیزی

سەرەتای مانگی ئووتی ساڵی ۱۹۶۵ی زایینی لە گەڕەکی مزگەوتی هەزارەی شاری مەریوان چاوی بە ژیان هەڵێناوە. دایکی ئامینە خاتوون و باوکی مام تۆفیقی ناوە و چوارمین منداڵی بنەماڵەکەیەتی.

قۆناغەکانی خوێندنی هەتا وەرگرتنی پلەی دیپلۆم لە شارەکانی مەریوان و بەندەر عەبباس درێژە پێداوە.

ئەم نووسەرە لە وڵامی ئەم پرسیارەدا کە چ شتێک یا چ کەسێک بۆتە هاندەری ئەوەی بێتە دنیای ئەدەب و نووسینەوە، ئەڵێ: «هەرکەسێک بۆ خۆی لە کاتی منداڵییەوە یان دواتر هۆگری بە شتێکەوە پەیدا دەکات، منیش هەر لە منداڵییەوە حەزم لە خوێندنەوە و نووسین بووە و دواتر دەستم داوەتە نووسین و بە بیرمدا نایەت کەس هانیدابم و سەبارەت بە کاری فەرهەنگی هەر لە ڕاستای دیفاع لە پیشەی نووسینی ئازاد و ئازادیی ڕادەربڕیندا بووە. ئێستا دانیشتووی شاری «کوڵن»ە لە ئاڵمانیا.

**چالاکییە فەرهەنگییەکانی ئەم نووسەرە:**

ئەندامی کانوونی موحەسلین، ئەندامی بەشی فەرهەنگی دەفتەری پیشگام لە مەریوان، بەرپرسی کتێبخانەی قوتابخانە لە سەرەتای شۆڕشدا، کارکردن لە تیپی شانۆ وەک دەرهێنەر و ئەکتەر لە شانۆگەلی «مامۆستای قوتابخانە، دوکتور و مەلا و چەند شانۆیەکی تر.» ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری ئەنجوومەنی ئەدەبی مەریوان کە دواتر بووە «ئەنجومەنی فەرهەنگی ئەدەبی مەریوان» بۆ ماوەی سێ ساڵ (١٩٩٩- ٢٠٠١) ئەندامی دەستەی نووسەرانی ڕەوت و میراجی و ...

ئەم نووسەرە لەگەڵ ئەم ڕۆژنامە و گۆڤارانەدا بە شێعر وچیرۆک و وتار و نووسراوە هاوکاری کردووە: کەیهان، سەلام کوردستان، ئەخباری کوردستان، ئەبرار، سروە، ئاوێنە، ئاویەر، ڕەوت، زرێبار، تیشک، میراجی و ماڵپەڕە ئینتەرنتییەکان.

## ڕەئووف مەحموودپوور

ساڵی ١٩٦٥ی زایینی لە گوندی «دزڵی» چاوی بە دونیا هەڵێناوە. ژیانی منداڵی هەر وەک باقی منداڵانی گوند تێپەڕاندوە. لەبەر ئەوەی باوکی خوێندەوار و میرزای ئاوایی بووە، هەر لە سەرەتای منداڵییەوە بە داستان، ئەفسانە، حیکایەت، پەند و مەتەڵ مێشکی گۆش کراوە. لەگەڵ شێعری شاعیران، بە تایبەت مەولەوی تاوەگۆزی، قانع، سەیدی، بێسارانی، مەلاحەسەنی دزڵی، سەعدی، حافیز و... ئاشنا بووە. بە وەها تۆشەیەکەوە چووەتە قوتابخانە.

ژیانی گوندی بە تایبەتمەندییەکانییەوە تاقی کردۆتەوە. بەتایبەت جۆری ژیان و کوێستان و هەوارگەکان کاریگەری زۆریان لەسەری داناوە.

هێشتا پۆلی یەکەمی دەبیرستانی تەواو نەکرد بوو کە ژیانی بنەماڵەکەی بوویە دەستەچیلەی ئاگری شەڕی ئێراق و ئێران. دایک و براکەی دەبنە قوربانی و باوک و خوشکێکی بریندار دەبن. ئەم کارەساتە کاریگەری نیگەتیڤ و وێرانکەر لە سەر ڕۆحی ڕەئووف دائەنێت. پاش ساڵێک باوکیشی ماڵئاوایی لە ژیان ئەکات و سەرپەرشتی دوو خوشکەکەی ئەکەوێتە سەرشانی ئەو. لەگەڵ ئەوەدا کە ناچار ئەبێت بۆ دابین کردنی بژێوی بنەماڵە کار بکات، بە پێی وەسیەتی باوک و حەزی خۆی واز لە خوێندن ناهێنێت و لە ناوەندی خوارەزمی شاری سنە بە کالۆریۆسی «بەڕێوەبەرایەتی فێرکاری» وەرئەگرێت.

ڕەئووف مەحموودپوور لە دامەزرێنەرانی ئەنجومەنی ئەدەبیی مەریوان بووە و بۆ دەورەیەکیش وەک ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری ئەنجومەن کاری کردوە. لەو کەسانە بووە کە گۆڤاری زرێباریان خستووەتە ڕێ و لە دەورەی یەکەمدا وەک دەستەی نووسەرانی ئەو گۆڤارە کاری کردووە. یەکەم بەرهەمەکانی لە گۆڤاری سروەدا بڵاو بوونەتەوە. پاشان لە زۆر گۆڤار و چاپەمەنیدا بەرهەمی بڵاو کراوەتەوە. بەتایبەت: زرێبار، سروە، ئاوێەر، سیروان، ڕامان، کاروان، ئاسۆی فولکلور، گوڵان، تیشک، میراجی، ئاسۆ، ئایەندە، هەنار، هەڵەبجە، باران، هەژین و...

**پەرتووکە چاپ کراوەکان:**

١ـ کولتووری کوردی١ (کاڵەبەی). ٢ـ زەڕنە و ئاسۆی. ٣ـ هورپڕای گەچ و تەختەی. ۴ـ خێزگەی سەیدی و خەرمانەی ئەدەب. ۵ـ جێژنێک بۆ پیر، بنەمایەک بۆ ئوستوورەی کوردی.

**ئامادەی چاپ:**

١ـ کولتووری کوردی٢(خرۆشی نەغمە).٢ـ بنەماکانی هزری نەتەوەیی و ڕەهەندی ڕۆشنبیری. ٣ـ دەفتەری سێهەمی شێعرەکان.

## عەبدولمەجید خۆرمێهر

کوڕی «دەروێش عەبدوڵڵا»یە و ساڵی ١٩٦٥ی زایینی لە بنەماڵەیەکی هەژار لە گوندی «نژمار»ی مەریوان چاوی بە دنیا هەڵێناوە.

لە تەمەنی شەش ساڵیدا لە قوتابخانەی ئاواییەکەیان دەستی بە خوێندن کردووە. دوای تەواو کردنی قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی، قوتابخانە بە جێ‌دێڵێت و لە حوجرەی نژمار دەست بەخوێندنی قورئان و کتێبە سەرەتاییەکانی حوجرە ئەکات.

ساڵی ١٩٨٦ زێدی خۆی بەجێ دێڵێت و بە دوای فێربووندا ئەچێت. لە خزمەتی خوالێخۆشبوو «مامۆستا سەید عەتا»ی چۆڕیدا ساڵی ١٩٩١ ئیجازەی مامۆستایەتی وەرئەگرێت و تا دوا ساتی ژیانی پێش نوێژ و وانەبێژی مزگەوتی سەڵەسی بووە. ناو براو لە تەمەنی چل و دوو ساڵیدا بە کارەساتی هاتوچۆ گیانی لە دەست دا.

ئەم بەڕێزە دیوانێکی شێعری لە ژێر ناوی «ئاواتی دڵ»چاپ و بڵاو کردۆتەوە و چەند پەرتووکێکی تری ئامادەی چاپ و بڵاو بوونەوەن.

## ئەحمەد کۆنە پۆشی

ساڵی ١٩٦٦ی زایینی لە گوندی «بایەوە»ی مەریوان لە دایک بووە، لە تەمەنی پێنج ساڵاندا ئەنرێتە بەر خوێندن و دوای تەواو کردنی قۆناغی سەرەتایی بۆ درێژەدان بە خوێندن ئەچێتە مەریوان و لە ژیانێکی زۆر دژواردا بە وتەی خۆی: «برسییەتی و نەبوونی ئارامی لێ بڕیبووین و زۆر شەوان نانی وشکیش نەبوو بیخۆین.» دیپلۆمی زانستە تەجروبییەکان وەرئەگرێت. بۆ ماوەیەکی زۆر یەکێ لە یاری زانە زۆر باشەکانی والیباڵی مەریوان بووە. لە ساڵی ١٩٨٤دا و لە کاتی بۆردوومانی شاری مەریوان، لە لایەن فڕۆکە جەنگییەکانی بەعسەوە بە توندی بریندار ئەبێ و ئەمەش کۆسپێکی گەورەی لە ڕێگای خوێندن و وەرزش‌دا بۆ دروست ئەکات.

ساڵی١٩٨٥ ئەبێ بە مامۆستای قوتابخانەی گوندی دەرەوەران و هەنووکەش لە قووتابخانەکانی مەریوان ئەرکی مامۆستایەتی درێژە پێ ئەدات. یەکەم کتێبی خۆی لەژێر ناوی «تاثیر نماز در زندگی فرد و پایداری اجتماعی» (شوێنەواری نوێژ لە ژیانی مرۆڤ و سەقامگیریی کۆمەڵایەتیدا) بڵاو دەکاتەوە.

## محەمەد ناجی کانی‌سانانی

محەمەد ناجی کانی‌سانانی، کوڕی ئەحمەد خانی کوڕی مەحموودخانی کانی‌سانان و دایکی ئافاق خاتوون، کچی محەممەد سدیق خانی جافە[1]. ساڵی ١٩٦٦ ی زایینی لە گوندی «کانی‌سانان» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. خوێندنی سەرەتایی لە زێدەکەی تەواو ئەکات و تا وەرگرتنی دیپلۆم لە شارەکانی سنە و مەریوان درێژەی بە خوێندن ئەدات. ئەم نووسەرە هاوکات لە گەڵ پیشەی کشت و کاڵ و ژیانی گوندنشینی، وەك یەکێ لە دڵسۆزانی ژینگە لە ساڵی ١٩٩٩وە لە ئەنجومەنی سەوزی چیا چالاکی ئەنوێنێت و ئەندامی دەستەی نووسەرانی بڵاڤۆکی چیایە. کاك ناجی بە نووسینی شێعر و وتار لە گەڵ گۆڤار و ڕۆژنامەکانی سۆران، میللەت ما، کەرەفتو، ڕوانگە، چیا و... هاوکاری ئەکات و دانیشتووی ئاوایی کانی سانانە.

تا ئێستا ساڵی( ٢٠١١ ) دووهەزار و حەوت سەد پەندی پێشینیانی ڕاستەوخۆ لە زمانی خەڵکی ئاساییەوە قۆستۆتەوە و کۆی کردووەنەتەوە.

ناو براو هاوکات خەریکی کۆکردنەوەی ئەو وشە ڕەسەنانەیە کە تا ئێستا لە فەرهەنگە کوردییەکاندا لە قەڵەم کەوتوون.

**«بەهار»**

دیسان بەهارە وەرزی شیناوەرد — دیسان بنەبڕ زم[2] و سەرما و سەرد
دیسان بەرگەکەی ژینگە کەسك و سەوز — دیسان دار و گیا هەستان لە وەنەوز

---

١. محەمەد سدیق خانی جاف، فەرماندەی هێزی دەگاگای کۆماری کوردوستان لە ساڵی ١٣٢٤-١٣٢٥دا بووە.

٢. زم: زستان.

هــاژەی بەفـراو و شــاخەی قەڵـبەزان
ڕەنگــی ڕۆبـاری ئەرخەوانــی کــرد
دەوەن و داران ژیـــــانۆ یەکـــــسەر
دیـــسان چڵاوچـــڵ بولبـــول و مەلان
قـومری و مـراوی شـالوور چۆلەکە
قاســپە و چـریکە و سـەمای باڵنــدان
هـــاو دەنگییەکـــی لێوانلێـــو لە بەزم
تیـشکی خۆرەتـاو تینـی دا بە خـاک
هـــۆملکێی[1] داران بە شـــنە بـــاوە
نیـــشانەی ژیـــان دیـــسان لە نـــۆوە
ئەمـــانە بنـــوێن وەرزی بەهـــارن

نـــرکەی هەور زەوی هـــانییە لەرزان
ڕوومەتـی شـاخی سـەوزەڵانی کـرد
چــرۆ پـــشکووتاو ڕوانـــۆ یەکـــسەر
دیـسان هومهـومەی باڵنـدەی کەلان
کەوو و کـۆتر و شـمقار و سوێـسکە
شنەی نەسیم و خشپەی بـای هەردان
بلـوێرێکی کەیـل لە هێمنـی و نەزم
بەڕۆژ و نـــزار بووژانـــۆ ســـەرپاک
کەروێشکەی گـوڵان هەم بە سەماوە
گیانـــدار و مەل و مـــۆران بە کـــۆوە
نەخـشی پێدەشـت و کەل و کۆسـارن

**ئیبراهیم ئەحمەدی نیا**

ســاڵی ۱۹۶۸ی زایینــی لــە گونــدی «نێــزڵ» لــە نــاوچەی کەڵاتەرزان چاوی بە ژیان هەڵێناوە. باوکی مام تۆفێق و دایکی سۆیبە خاتوونە. لە سەرەتای منداڵییەوە وێڕای بنەماڵەکەی چۆتە سنە و خوێندنی لە سـەرەتاییەوە تـا دواناوەنـدی لـەوێ تـەواو کردووە، پاشان تا پلەی ماستەر لە بواری کشت و کاڵدا درێـژەی بە خوێندن داوە و ئێستاش کارمەندەی دائیرەی «جیهادی کەشاوەرزییە». لە سەرەتـای لاویدا ماوەیەک بە زمانی فارسی شێعری نوسیووە. پاشـان بـە شـانازییەوە خـۆی بـە ڕستەی پیرۆزی کوردی سپاردووە.

**چالاکی فەرهەنگی:**

۱ـ ساڵی ۱۹۸۸ لە دامەزرێنەرانی ئەنجومەنی ئەدەبیی «ئاویەر»ی سنە بووە.
۲ـ دەستەی دامەزرێنەری ئەنجومەنی ئەدەبیی «ئەندێشە» لە ساڵی ۱۹۶۶ لە مەریوان.
۳ـ سەرپەرشتی و بڵاوکردنەوەی گۆڤاری «کشت و کاڵ»، وەک یەکەم گۆڤاری

۱. هۆملکێ: شەکانەوەی لق و پۆی دار بە هۆی با، جۆرێ جوڵەی شان وەمل لە هەڵپەڕکێدا.

زانستی تایبەت بە بواری کشت و کاڵ بە زمانی کوردی (پاش چواردە ژمارە بۆ هەمیشە داخرا.)

٤ـ ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری زرێبار لە ژمارەی شەشەوە تا ژمارەی دە.

٥ـ بەشداری کردنی کۆڕ و کۆبوونەوە فەرهەنگی و ئەدەبییە سەربەخۆکان.

**بەرهەمی چاپکراو:**

١ـ مەداری زوقم، کومەڵە شێعر، ساڵی ٢٠٠٠.

٢ـ چاپی چەندین شێعر و چیرۆک و وتار لە چاپەمەنییەکاندا بە تایبەت لە گۆڤارەکانی سروە و زرێباردا.

٣ـ خیانەتەکانی ئاو، کۆمەڵە شێعری، ئامادەی چاپ.

## جەلال سەعیدزادە

سپتەمبری ساڵی ١٩٦٨ لە گوندی «بایەوە»ی سەر بە ناوچەی خاو و میرئاوای مەریوان لە دایک بووە. قۆناخی سەرەتایی هەر لەو گوندە تەواو کردوە. هێشتا پلەی یەکەمی دەورەی ناوەندی تەواو نەکردبوو کە جم و جوڵی شۆڕشی دژی دەسەڵاتی پاشایەتی بە ئاشکرا سەری هەڵدا. تەوژمی ئەو شۆڕشە هەر هەموو شار و گوندەکانی وڵاتی ئەگرێتە بەر. دیارە ئەویش وەک تازەلاوی ئەوسەردەمە، لە گەڵ ئەو شەپۆلە ڕێ ئەکەوێت. لە گەڵ شەڕی ماڵ وێرانکەری ناوخۆ و ئاوێتە بونی ئەو شەڕە لە گەڵ شەڕی ئێراق و ئێران و ئاوارەیی و پەنابردن بۆ گوند و شارەکانی دیکەی وڵات، لە قوتابخانەکانی مەریوان و سنە قۆناخی ناوەندی تەواو کردووە. پاش گەڕانەوەیان لە سنە (١٩٨٥)، ساڵەکانی دواناوەندی لە بەشی بیرکاری (ریاضی ــ فیزیک) هەر لە دەربەدەری و ئاوارەییدا درێژە پێ ئەدات. لە تاقیکاری سەرکەوتن بەرە و خوێندنی باڵادا دوو بەشی فرۆکەوانی و ئەندازیاری ئەهێنێتەوە. بە هۆی هەندێ گرفتی تایبەتەوە لە پۆلی چوارەمی دواناوەندی بەولاوە ئیزنی درێژەدان بە خوێندنی پێ نادرێت. بەڵام هیچ هەلێک بۆ فێربوون بە فیرۆ نادات.

لە دەرەوی زانکۆ خۆی بەخوێندنی زمان و ئەدەبی ئینگلیزی و هیندییەوە سەرقاڵ ئەکات و سەرکەوتنی تێدا بە دەست دێنێت.

هەر لە سەرەتای دامەزرانی ئەنجومەنی فەرهەنگی ـ ئەدەبی مەریوانەوە (۱۹۹۰) وەك ئەندامێکی هەڵسووڕ خۆی دەرئەخات و بەرپرسایەتی «کومیتەی وەرگێڕان» ئەگرێتە ئەستۆ.

جەلال سەعیدزادە وەك شارۆمەندێکی خاوەن هەڵوێست، ناتوانێت لە ئاست پەرەسەندنی «ئیعتیاد بە مادەسڕکەرەکان» بێدەنگی بنوێنێت. لە دەورەی یەکەمی شۆرای شاری مەریواندا ئەبێتە بەرپرسی کومێتەی بەرەنگار بوونەوە لە گەڵ مادەسڕکەرەکان. هەروەها ناوبراو ئەندامێکی هەڵسووڕی «ئەنجومەنی سەوزی چیا»یە. چالاکییەکانی ئەم ئەنجومەنە لە بواری «پاراستنی ژینگە»دایە.

**بەرهەمەکانی نووسەر:**

۱ـ کۆمەڵە شێعر.

۲ـ وەرگێڕانی ڕۆمانی «ئۆلیڤەر توویست»ی چارلز دیکەنز بە زمانی کوردی.

۳ـ وەرگێڕانی کتێبی «خەباتی کورد (۱۹۲۰ـ۱۹۹۴)» لە نووسینی ئێدگار ئۆبالانس.

ئەم نووسەرە چەندین وتاریشی لە گۆڤارەکاندا بڵاو کردۆتەوە. بۆ وێنە: «سەرنجێك بۆ پێویستی وەرگێڕان لە زمانی کوردیدا»، «پاراستنی ئاسەوارە مێژینەکانی گەلی کورد و ئەرکی نەتەوایەتی»، «بەرەنگار بوونەوە لە گەڵ مادە سڕکەرەکان و بەرخۆدانی[1] میللی» و «مین و ژینگە»و...

ئەم بەڕێزە ئێستا پیشەی دووکاندارییە و دانیشتووی مەریوانە.

**«کازیوە»**

گەردەلولی چاوەکانت
ئەوگزینگەن
زریان ماڵاوییان لێ دەکات.
دەتۆش...!!
زویر مەبە

۱. بەرخۆدان: خەبات، بەرگری و خۆڕاگری.

شەوە زەنگە قەتیس نابێ !
بۆیە، ئەگەرئێوارەش بێ ... سبەینێش ... کازیوە دێ

**مامۆستا سدیق محەممەدی**

مامۆستا سدیق ساڵی ١٩٦٨ی زایینی لە بنەماڵەیەکی جوتیار لە گوندی «هەجمنە» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. باوکی «عەلی» و دایکی «لاولاو» خاتوونە. لە بەر نەبوونی و هەژاری تا پۆلی سێی سەرەتایی لە قوتابخانە خوێندوویەتی. دواتر ڕوو ئەکات خوێندنی ئایینی و بە هۆی کێشەی ئابووری بنەمەڵەکەیەوە ئەویش ناو بە ناو بووە. تا ئەوەی ساڵی ١٩٨٤ شێلگیرانە لە خزمەت مامۆستایان مەلا خالد ڕەحیمی(سنە)، مەلا کەریم(سوورە ئەزە)، مەلا حەیدەر مستەفەوی(سنە) و مامۆستا بەهادین(ئارەنان) درێژەی بە خوێندن داوە و ساڵی ١٩٨٨ ئیجازەی مامۆستایەتی وەرگرتووە. ئەم مامۆستا نووسەرە هەستی خۆی وەک شێعر دەر بڕیوە و کتێبی «تەوحید و ئیمان»ی بە شێوەی هەڵبەست چاپ و بڵاوکردۆتەوە. زۆر زوو ئەجەل دەفتەری ژینی ئەدڕێ و ساڵی ١٩٩٨ بە هۆی پێکدادانی ئوتومبێل ماڵئاوایی لە ژیان ئەکات. ئەم نووسەرە دوو کتێبی تری بە ناوەکانی «مێژووی ئیسلام» و «انیس المومنین» (وەرگێڕان لە عەرەبییەوە) ئامادەی چاپ کردووە کە هێشتا بڵاو نەکراونەتەوە[1].

**عومەر ئەفسەری**

ئەم شاعیرە کوڕی ڕەحمانە و یەکەم ڕۆژی وەرزی پاییزی ساڵی ١٩٦٨ی زایینی لە گوندی «نێ» لە بنەماڵەیەکی دەسکورت و هەژار چاوی بە ژیان هەڵێناوە.

خوێندنی سەرەتایی لە زێدەکەی خۆی دەست پێئەکات و قۆناغەکانی تری خوێندن لە گەڵ ئاوارەیی و ئاڵۆزی شەڕی

١. ئەم زانیارییە کاک «ئەسلەم محەممەدی» کوڕی ئەم مامۆستا دەستی خستم کە جێگای ڕێز و پێزانینە.

نێوان ئێران و ئێراق و دەربەدەری خەڵکی ناوچەی مەریوان تا وەرگرتنی دیپلۆم درێژە پێ ئەدات. دواى وەرگرتنی دیپلۆم بۆ درێژەدان بە خوێندن لە ناوەندی بارهێنانی مامۆستایانی شاری سنە وەرئەگیرێت و دواى دوو ساڵ دەرس خوێندن لە ساڵی ١٩٩٣دا بەرگی مامۆستایی لە بەرئەکات و لە قوتابخانەکانی شار و دێی ناوچەی مەریواندا سەرقاڵی مامۆستایەتییە.

ساڵی ١٩٩٠ ژیانی هاوبەشی پێك دێنێت. دواى دامەزراندنی ئەنجومەنی ئەدەبیی مەریوان وەك تەنیا هەوارگەی زانست و ئەدەبی تازەپێگرتووی مەریوان، ڕووی تێئەکات و ئەبێ بە هاندەری سەرەکی بۆ ئەوەی لە گەڵ پێنووس دەس لەملان بێت. بە وتەی خۆی ئەم نووسینانەی تەنیا دەربڕی هەستی خۆیەتی کە لە خێزان و کۆمەڵەوە وەری گرتووە.

ئەم شاعیرە لە گەڵ زۆرێك لە گۆڤار و حەوتەنامە ئەدەبییە کوردییەکاندا وەك: سروە، تیشك، زرێبار و میراجی و ... بە نووسینی شێعر هاوکاری ئەکات.

کاك عومەر ئێستا خاوەنی سێ نامیلکە شێعرە بە ناوەکانی: کسپە، قاشنە[1] و قاسپە کە هێشتا هەلی بۆ نەڕەخساوە لە چاپیان بدات. ئەم شاعیرە هەنووکە دانیشتووی مەریوانە.

**«باوە»**

باوەگیان ژینم بە قوربانی تۆ
بوونم بە فیدای بوون و مانی تۆ
ئەی بۆنی بوونت، ئارامی گیانم
ئەی هێزی دڵ و ورەی ژیانم
ئارەقی گەرمی لەشی سواوت
ئاخی دەروونی بەدەرد پواوت[2]
زیرەی سەر پەنجەی زبر و ژاکاوت
هەنسکی توندی لە دڵ ناکاوت
باوەگیان عومری پڕ لە ناسۆرت
شەوی بێ شادی و ڕۆژی ناجۆرت
هەوڵی پیاوانە و ژیانی مەردیت
دەستی قڵیشاو ئاڵای سەربەرزیت
پەروەردەت کردم بگەم بە پایە
ببم بە درەخت بۆت بم بە سایە
مایەی سەربەرزی و سەر فیرازی من
پاڵەوانەکەی هۆی شانازی من

---

١. قاشنە: جۆرێ ماسییە کە پووڵەکەی زەردی ڕەقی هەیە.

٢. پواو: پرتووکاو.

## موزەفەر یۆسفی

ساڵی ۱۹۶۸ی زایینی لە گوندی «باخان»ی مەریوان لە بنەماڵەیەکی هەژار لە دایک بووە. گۆڕەپانی فێربوونی تا وەرگرتنی دیپلۆمی(علوم تجربی) لە قوتابخانەکانی شاری مەریواندا بووە. بە بۆنەی شەڕی ئێران و ئێراقەوە لە ماوەی دەرس خوێندنیدا زۆر ئاوارەیی و ئەم لاو ئەولای دیوە و ناچاریش بووە زۆر جار لە ژێر دەوار و بن دارەکاندا ڕاوی وشە و وانە بکات.

لە دوای وەرگرتنی بەکالۆریۆس لە بواری فیزیکدا داری بەر ئەگرێت وهەژدە ساڵی ڕەبەق منداڵانی شار و گوند لە سێبەری زانستیدا وانەی ژیری و ئازایەتی فێر ئەبن.

هۆی نزیکی و ئاوێتە بوونی لە گەڵ زمانی زگماکیدا دەگەڕێتەوە بۆ هەستی نەتەوەخوازی و سۆز و خۆشەویستی بەرامبەر بە گەلەکەی. بە ئاشنا بوون لە گەڵ شاعیران و نووسەرانی گەورەی کورد و گۆرانی بێژە ڕەسەنەکان، هەستی هونەری ئەپشکوێت و خولیای کەلەپوور و ئەدەبی نەتەوەکەی ئەبێت. لە ساڵی ۱۹۹۵ەوە دێتە ناو دنیای شێعر و ئەدەبەوە و بە نووسینی وتار و شێعری کوردی و وەرگێڕانی چەند دەقی نوسرەتی ڕەحمانی و شاملوو لە گەڵ گۆڤارەکانی سیروان، زرێبار، سروە، ئاسۆ، ڕۆژهەڵات، ڕۆژەڤ و دیدگاەدا هاوکاری کردووە.

هەر وەها ئەم نووسەرە لە بواری توێژینەوەی دەقەکلاسیک و نوێیەکانی ئەدەبی کوردیدا کاری کردووە. بۆ ماوەی چەند ساڵێك دەستەی بەڕێوەبەری ئەنجومەنی فەرهەنگی ـ ئەدەبی مەریوان بووە. کۆی بەرهەمەکانی ئەم شاعیر و نووسەرەمان لە سێ بەرگدا کۆکراوەتەوە. بەڵام بە داخەوە تا ئێستا بواری بڵاو بوونەوەیان نەڕەخساوە. موزەفەر یۆسفی ڕێکەوتی ۲۴ی مارسی ۲۰۰۹ لە تەمەنی چل ساڵیدا دڵە گەورەکەی لە لێدان کەوت و ماڵاوایی لە دنیای ئەدەب کرد.

ئەڕۆیم، هەناسەی کەسکی باران... هەتا سۆزی وەتەن
بێ سنوور ئەڕژێ فرمێسکی ساردی پاییز ــ لە کچێنیی باخێکا
بسك بە بسکە هەناسەی وەرزێ لەمندا ــ چ زەرد
هەرەسی هەسارە ... لە تۆدا ــ چ شین

ئەی پۆلە پەپوولەی پاییزی
وەرینتان بە دەشتی داخا، شاباشی کام ڕەنگە؟
لە هەورێکا ونمکە هەناسەی کەسکی باران بەرەو
خووسات[١] بمبات
هۆ هاودەمی هەمیشەیی!...
هەناسەی باڕێزی کام وەرزی بێئەوینت پێحەپسە؟
من چەشنی تۆ لە مێوەی پێشێلا.. هەناسەم هەپروونە[٢]!
هەپروون ..
بێ تۆیی، ئەم وەرزە، ئێوارەی دەمکەلی تەنیایی لە
گەرووم ئەچێنێ
ئەچێنم ئەوینی سەماییێک
تا...دڵی ئەرخەوان لە خۆدا عاشقییم چێبکا
ئەڕوێ پەنجەی کەسکی هەناسەم... بەدووری وەشتی مەنفادا
من کەنارێ لە تاوەر دەهەژێم بە ڕووی ڕووباری زامێکا ــ تا
زەریا...
کە زامێ ــ شەماڵی شەنینی سەرداران
دەنووسێ بەیادی هەناسەی هەپروونی باخێکا
هۆ ئازیزا... بەرەی هاودەمیت تا سەرشان کام میوەم لە باخا ئەڕوێنی؟
با هەناسەی کەسکت داگەڕێ بە دەشتی قاقڕما...
با هەڵکات هەسێرەی نیگامان تا ئەو پەڕ
هەوری سەر بەشینی ئاڵای هاودڵی
تا... باران بە عەشقی شینەوە بنووسێت هەیمەنەی.

---

١. خووسان: تەڕ بوون لە ناو ئاودا.
٢. هەپروون: لەت لەت.

**مەحموود مەحموودی**

ساڵی ١٩٦٨ی زایینی لە شاری مەریوان لە بنەماڵەیەکی مام ناوەندی(باوکی کارمەندی بیمارستان و دایکی کابانی ماڵ) لە دایک بووە. یەکەمین کتێبێک کە خوێندوویەتەوە و بەرەو لای نووسین و خوێندنەوە هانی داوە «ماهی کوچولو»ی سەمەد بێهرەنگی بووە، هەر لە قۆناغی سەرەتایی و لە پۆلی چوارەمەوە کتێب گەلێکی بچووکی حیکایەت و بەسەرهات بە هان دانی مامۆستاکەی ئەنووسێت کە لە ناو هاوپۆلەکانیدا دەست بە دەست ئەگەڕێن.

لە بەر شەڕی ئێران و ئێراق قۆناغی ناوەندی و دوا ناوەندیش لە ژیانێکی زۆر دژوار و ناخۆشدا تێپەڕ ئەکات و ناتوانێ ئەو جۆرەی کە پێویست بووە لە توانایی خۆی کەڵك وەربگرێت. ساڵی ١٩٨٢ خوێندنەوەی کتێب گەلی ئایینی بەرەو لای زمانی عەرەبی ڕاکێشی ئەکات و فێری ئەو زمانە ئەبێت.

ساڵی ١٩٨٧ دوای تەواو کردنی قۆناغی دواناوەندی لە تاقیکاری زانستگادا لە بەشی تەکنیسیەنی ژووری نەشتەرگەری، لە کۆلێژی زانستە پزشکییەکانی زانکۆی شیراز وەرئەگیرێت. دوای تەواو کردنی سەربازی لە وەزارتی بێهداشت و دەرماندا دائەمەزرێت و زۆربەی ساڵەکان وەك پەرستاری هەڵکەوتوو دەسنیشان ئەکرێت.

**بەرهەمەکانی نووسەر:**

١- چاپ و بڵاو کردنەوەی «دیوانی خەم فرۆش» لە هۆنراوەکانی محەممەد عەلی ڕەحیم پوور.

٢- بازگشت بە اسلام، لە عەرەبیەوە بۆ سەر زمانی فارسی.

٣- نشانە های راە، لە عەرەبیەوە بۆ سەر زمانی فارسی.

٤- راهی بە سوی دلها، لە عەرەبیەوە بۆ سەر زمانی فارسی.

٥- شرح اربعین نووی، لە عەرەبیەوە بۆ سەر زمانی فارسی.

٦- «دیوانی شەپۆل» هۆنراوەی شێخ ئەحمەدی مەردۆخی ئامادەی چاپ.

نووسین و بڵاو کردنەوی چەندین وتاری ئەدەبی و ئایینی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکان وەك سروە و جەماوەر و ڕۆژهەڵاتدا.

## سوبحان ئەمینی

سوبحان ئەمینی کوڕی جافر و ئامینەیە. ساڵی ١٩٦٩ی زایینی لە گوندی «هانەگەرمەڵە» سەر بە هەورامانی لهۆن چاوی بە دنیا هەڵێناوە. با ئەم نووسەرە لە زمان خۆیەوە باشتر بناسین: «زۆر خولیای ئەوە بووم کە ڕۆژی لە دایک بوونی خۆم بزانم، بەڵام هەرکات پرسیارم ئەکرد، دەیانگوت ساڵی سوورێژەکە شەش مانگانە بووی! یان ئەو شەوە لە دایک بووی کە مەلا حەبیب و براکەی لە بیارە بە دەستی عەبدلوەهاب ئۆترووشی تیرباران کران![1]. دوای سی و پێنج ساڵ لە زاری کوڕەکەی مەلا حەبیبەوە کە تا ئەو کاتە نەمبینی بوو، بۆم دەرکەوت کە شەوی لە دایک بوونم ٢٨ ی خەرمانانی ساڵی ١٣٤٨ی کۆچی هەتاوی بووە!. یەکەم بیرەوەریشم ئەوە بوو کە دەنگی تەیارە و ناپاڵمی ڕژێمی بەعس گوندەکەمانی دەلەرزاند.

تا پۆلی چوارەمی سەرەتایی لە زێدەکەم خوێندو و دوای سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێران و دەست پێکردنی شەڕی ئێران و ئێراق، جۆزردانی ساڵی ٦٠ ی کۆچی هەتاوی زێد و نیشتمانی جوانمان بە جێ هێشت و ئاوارەی شاری مەریوان بووین. پۆلی پێنجەمی سەرەتایی و یەکەمی ناوەندیم لە شاری مەریوان تەواو کرد. پاشان لە خەرمانانی ساڵی ٦٢ بە هۆی بۆمبارانی شاری مەریوانەوە دیسان ئاوارە بووین و هەر پۆلێکم لە شوێنێک خوێند تا ئەوەی لە بەهاری ١٣٦٨ خوێندنی دواناوەندیشم تەواو کرد و بۆ پەروەردەی مامۆستایان (تربیت معلم ) لە سنە وەرگیرام و هاوینی ١٣٧٠ بووم بە مامۆستا. لە گوندەکان و لە شاری مەریوان خەریکی مامۆستایەتیم.

سەرەتای نووسینم لە ساڵی ١٣٨٠دا بە چەند وتار و بابەت کە هێندێکیان لە حەوتەنامەی «سیروان»ی ئەو کات بڵاو بوونەوە دەست پێکرد. ئەوە بوو بە هاندەرێک

---

١. عەبدولوەهاب یەکێک لەو بەعسیانە بووە کە بە ناو پێشمەرگەیەکی سەرکردە، لە ڕیزەکانی شۆڕشی بارزانیدا خۆی داڵدە ئەدات. لە ناوچەی هەورامان گەلێک کەڵە پیاوی کورد ئەکوژێت. بۆ نموونە لە شارۆچکەی بیارە دوو برای بێ تاوانی بە ناوگەلی مەلا حەبیب و ئەحمەد کە دواتر بێ تاوانیان بۆ هەموولایەک ئاشکرا ئەبێ و هەروەها ئەحا ڕەش ناوێک و کەمالی کوڕی کە خۆی سەرکردەیەکی لێهاتوو ببوو تیرباران ئەکات. عەبدولوەهاب دوای ئەم خەیانەتانە پشت لە شۆڕش ئەکات و ئەچێتەوە نێو پیاوەکانی بەعسەوە.

کە لە سەر نووسین بەردەوام بم. ئەو تەوەر و بەرهەمانە کە تا ئێستا تەواوم کردوون، بەڵام چاپ نەکروان، ئەمانەی خوارەوەن:

١ــ خەرمانی بێ بن: بریتیە لە ٣٥٠٠ پەند و قسەی نەستەقی هەورامی کە وەرگێڕانێکی سۆرانی و فارسی لە سەر کراوە و پاشان بە هەورامی شی کراونەتەوە.

٢ ـ قەڵاو زڵم و زۆری ئاخرش وڕۆ: (ڕۆمان).

٣ ـ زارا: وەرگێڕانی چیرۆکی «زارا عشق چوپان »، نووسینی محەممەدی قازی.

٤ــ کێ پەنێرە کێش ولاو نانی: وەرگێڕانی چیرۆکی «چە کسی پنیر من را برداشت؟» نووسینی دوکتۆر ئێسپێنسر جانسۆنی ئەمریکییە.

٥ـ سیاوڵە ماساوی: وەرگێڕانی چێرۆکی «ماهی سیاە کوچولو» نووسینی سەمەد بێهرەنگی.

٦ــ کۆ کردنەوەی ٧٠٠ وشەی دوانەی هەورامی و بووژانەوەیان لە قەوارەی دیالۆگدا.

٧ـ هانەگەرمەڵە باڵا جامێ پەی دیەی هەورامانی: باس لە جۆغرافیا، مێژوو، داب و نەریت، کەلتوور، مرۆڤە گەورەکان، قسەی پیاوە نەستەق وێژەکان و ... هانەگەرمەڵە دەکات.

٨ ـ بە سەرهاتی خۆم وەکوو لاوێکی چەوساوەی ئەم گەلە.

٩ ـ هاوکاری لە گەڵ ئەنجومەنی بێسارانی و ڕۆجیار.

## عابد عەلایی

لە گیان کەنشتی[1] گەرما و وشاکانی و چاوەڕوانی سروشت بۆ تەپ و نمی باران و سپای خەزان و فێنکایی ساڵی ١٩٦٩ی زایینی لە بنەماڵەیەکی مام ناوەندی ئایینی دا چاوی بە ڕووی خێزانێکی چوار کەسیدا هەڵێناوە. بۆ ئەوەی ئەمەک ناسی پەروەردگاری خۆی بێ ناویان نا عابد. بە گوڕ و تینی خۆشەویستی باوک و لە باوەشی گەرم و پڕ ئەوینی دایکی کەوتە گەشە و دارە دارە.

---

١. گیان کەنشت: سەرە مەرگ، کاتی گیان بە دەستەوەدان.

بەڵام دەستی قەدەر زۆر زوو لە گوڕ و تینی چڕاند و ناسۆری بێ باوکی دەفتەری هیواکانی دڕاند. لە پاش وەرزێ، هەر دوو باڵی گەشە و نەشەی هەڵکێشران و بە بێ باڵ گەڕایەوە پەنای باوەگەورە و مامەکانی. ئەوانیش بە پێی توانا پێیان گەیاند و باریان هێنا. قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی تا دوا ناوەندی هەر لە مەریوان تێپەڕ کرد و بۆ خوێندنی وانەی مامۆستایەتی لە سنە گیرسایەوە و بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە بەشی بیرکاریدا[1] هەر لەوێ وەرگرت. ئێستاش ئەوەو نەوەکانی ئەم شارە و پێگەیاندنیان بۆ بیر کردنەوە لە گرژی و ئالۆزییەکانی ژیان و شیتەڵ و تەتەڵە کردنی هاوکێشەکانی جیهان لە شارێی بیرکارییەوە.

لە ساڵی ۱۹۹۰ هاوڕێ لە گەڵ کۆمەڵێک لە دۆستان بەردی بناغەی ئەنجوومەنی ئەدەبی مەریوانیان دانا و بۆ ماوەی چەند ساڵ لە خزمەت ئەرکەکانی ئەنجوومەندا بوو. لە شانزە تا حەڤدە ساڵیدا دەستی فێری پێنووس بوو. لە تەنگەژەی شەڕ و ئاوارەیی و پرسیارە بێ وڵامەکانی ژیان، شێعر بوو بە هاوڕێی و ئەیتوانی هزر و بیری گەنجی و لاوی خۆی پێ بحاوێنێتەوە.

تاریک و ڕوونی مامۆستا هێمن یەکەمین مامۆستا و ڕێ نیشاندەری شێعرەکانی بوو. شاعیرانیتری کوردیش هەر یەک بەش بە حاڵی خۆیان شێعرەکانی شاعیر لاویان خستە سەر پێ. زۆربەی نوسراوەکانی شێعرن. بەڵام بە داخەوە هیچ کتێبێکی شێعری چاپ نەکراوە. چەند چیرۆکە شێعری کورت و وتاری ئەدەبی لە هەگبەی نوسراوەکانیدا خۆیان لە پەنای شێعرەکانیدا حەشار داوە کە بڕێکیان لە گۆڤارە کوردییەکاندا وەک سیروان، سروە، زرێبار، تیشک، میراجی، باران و کارواندا چاپ و بڵاو کراونەتەوە.

**بەرهەمەکانی نووسەر:**

۱ـ فرهنگ اصطلاحات ریاضی فارسی ـ کردی.

۲ـ بازگە، کۆمەڵە شێعر.

۳ـ «ئەوین، ماسی و دەریا»، چیرۆکە شێعر.

۴ـ «گیان لە بەری ئێسک سووک، دۆستی منداڵی بچووک»، شێعر بۆ منداڵان.

---

[1] بیرکاری: ریاضی.

٥ـ خەڵاتی ڕێبەندان، چیرۆک.
٦ـ آخرین دادگاه کمونیست، شانۆ، ساڵی ١٩٨٩ پیشاندراوە.
٧ـ میرات، شانۆ.
جێگای ئاماژەیە کە ئەم بەڕێزە خەریکی وەرگێڕانی دیوانی مامۆستا قانع بۆ سەر زمانی فارسییە. ئێستا ناو براو لە قوتابخانەکانی شاری مەریوان، ئەرکی مامۆستایەتی لە ئەستۆیە.

## کولسووم عوسمانپوور

ساڵی ١٩٦٩ی زایینی لە زستانێکی پڕ بەفری بناری کوێستانی هەورامان لە گوندی «ڕەزاو» لە دایک بووە. باوکی خوسرەو و دایکی ئایشێ خاتوونە. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی لە مەریوان تەواو کردووە. بۆ درێژەدان بە خوێندن چۆتە سنە و تا پلەی ماستەری زمان و ئەدەبی فارسی ڕۆیشتووە.

بۆ ماوەی دە ساڵ نووسەر و وێژەری بەرنامەکانی کوردی ڕادوێ سنە بووە. ماوەی چەند ساڵێک ئەندامی دەستەی نووسەرانی حەوتەنامە کوردییەکانی سنە بووە. زۆرتر لە بیست وتار و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا چاپ کردووە.

دوو کۆمەڵە شێعری بە ناوەکانی : ١ـ گرێ. ٢ـ هەتۆڵ مەتۆڵ شەمامە. (تایبەت بۆ منداڵان) بڵاو کردۆتەوە.

کولسووم خانم لێکۆڵینەوەیەکی لە ژێرسەر دێڕی جوانکارییەکانی دیوانی مەولەوی کورد (زیباشناسی دیوان مولوی کرد) ئەنجام داوە کە چاپ وبڵابوەتەوە.

## موسلێح ئەحمەدی

لە زمانی خۆیەوە: «ناوی تەواوم موسلیح ئەحمەدی نەقشبەندی»یە، باوکم لە بنەماڵەی نەقشبەندی و دایکم لە شێخەکانی سەلامییە. لە چلەکانی کۆچییەوە هەموو بنەماڵەکەمان لە مەریوان نیشتەجێین و ساڵی ١٩٦٩ی زایینی

هاتوومە دنیاوە و خوێندنی ئامادەیی و سەرەتایی تا دوا ناوەندیم هەر لە مەریوان تەواو کردووە. دوای وەرگیرانم لە زانکۆی پزیشکی کوردستان لە سنە، ئێستاکە شانزدە ساڵە فەرمانبەری ناوەندنی بێهداشتی مەریوانم.

شێعر بەشێک لە شووناسی قووڵی و دووری بنەماڵەی خۆم و هەموو کوردێکە. لە کەشکۆڵی ئەم خانەدانەدا جگە لە ڕەسەنایەتی و ڕێگای خزمەت بە خاکە پیرۆز و پڕتیشکەمان، هەندێ بەیت و دیوانی حەز و خۆشەویستی پێشکەش کراون. ئەو نوورە بەریە و لە قەڵەمی ئەزەلیشدا ئەمێنێتەوە. لە وانەیە زۆر بە زەحمەت بەڵام بە تەئکید کسپەی زۆری تریان بەڕێوەیە، بۆ هاتنە ناو ڕەدیفەکانی شاکاری ئەدەبی کوردی و بە ڕەونەقتر کردنی داکێومێنتی ئازار و ئەنفال و جینۆساید. حاشا لە هەموو کۆتاییەکانی ئیمپراتۆرەکانی تۆفان، سەردارەکانی کوشتار و... لە چەسپاندنی ئازادیدا بەشدار ئەبن.

من نەکەوتوومەتە ناو زەحمەتی ئەدەبییەوە بەڵکوو وا بزانم هەر لە گەڵێدا و لەو کەش و ئەتموسفرەدا ژیاوم. درکاندنم لە ڕۆژەکانی پیرۆزی یەکەم فێربوون بە پیت و بزوێنەکانی نووسینی کوردییەوە لە سەردەستی مامۆستایەکی بە توانای ناوماڵمانەوە دەستی پێکرد.

سەرەتا دەستم کرد بە کۆکردنەوەی هەندێ ئەفسانە و چیرۆکی گوێ زەلەکانی زرێبار. دواتر و دوای ئاشنا بوون بە ئەدەبی قاچاخ و شێعری هاوچەرخ، دوای چوونە ناو دنیای ڕەنگ و نیگارکێشان، هەر پالێت[1] بەدەست و ڕەنگاوی هاتمەوە بۆ لای شێعری دایک. یەکەم دەسپێکی هەشتاکانەوە و هەر لە مەریوان لە گەڵ چەن هەڤاڵێک کەوتینە هەوڵ بۆ ڕێکخستنی ماڵێکی ئەدەبی کە لە ئاکامدا و دوای ساڵێک هاتووچۆ، ناوەندنی ئەدەبی ـ فەرهەنگی مەریوانی لێکەوتەوە.

دوای ڕێکخستنی ئەو ناوەندە ماوەیەکی دوور ئەندام بووم و لە هەندێ بۆنە و ئاهەنگ و کۆڕ و کۆنگرەی گەورەی ئەدەبی و ڕۆشنبیریدا بەشدار بووم. ماوەیەک نیشتەجێ بوونم لە سنە بوو بە هۆی بەشداریی کردنی جاربەجارم لە دانیشتنەکانی ئەنجومەنی ئەدەبی ئەم شارە و ئاشنا بوونم لە گەڵ چەند ئەدیبێکی بە توانای ئەوێ. لە بەڕێوەچوونی دووساڵانەی کۆنگرەی جیهانی «کوردستان ناسی» و هەروەها

---

١. پالێت: تەختەی وەک (S) کە وێنەکێشان بۆ دانانی ڕەنگی ڕۆن و تێکەڵ کردنی کەڵکی لێ وەرنەگرن.

کۆنگرەی جیهانی «فرزانگان کرد» وەکوو دەستەی بەڕێوەبەرایەتی بەشداریم کردووە. هەروەها لە چەندین کۆڕ و کۆبوونەوەی خوێندکاری لە زانکۆکانی ئێران ـ بە تایبەتی لە بۆنەکانی هەڵەبجەدا ـ شێعرم پێشکەش کردووە.

لەم ساڵانەی دواییدا لە بەر چەند هۆ، «ئەنفال»م وەک پرۆژەیەک بۆ هەوێنی کاری ئەدەبی هەڵبژاردووە و توانیومە زۆر بەڵگە و دیکۆمێنت سەبارەت بەم ژینۆسایدە کۆ بکەمەوە.»

**بەرهەمەکانی نووسەر:**

١ـ ڕێژان (ڕۆمانی درێژ). ٢ـ هەڵەبجەکان(دەفتەری سەرجەم ئەو دەق و شێعرانەی بەو بۆنەوە خوێندراونەتەوە.) ٣ـ سالۆمە (وەرگێڕانی شێعرێ لە ئسکاروایڵد). ٤ـ کاروان (دەقی شێعری بۆ ڕاپەڕین و کۆڕەوی١٩٩١). ٥ـ خۆڵ، زام، ئاواز (دەقی شێعری). ٦ـ پاییز و غەزەڵ (نۆڤێلە شێعر). ٧ـ تالان ١ (ڕۆمانە شێعر)، پرۆژەی ئەنفال(٢٠٠٦ـ٢٠٠٧). ٨ـ تالان ٢ (ڕۆمانە شێعر)، پرۆژەی ئەنفال(٢٠٠٨ـ ٢٠٠٩).

**سەید دارا حسێنی**

ساڵی ١٩٧٠ ی زایینی لە گوندی «دەرەتفێ» لە بنەماڵەی شاعیری گەورە و نیشتمان پەروەر مامۆستا قانع چاوی بەژیان هەڵێناوە.

قۆناغی سەرەتایی لە قوتابخانەی گوندی دەرەتفێ تەواو ئەکات. بە بۆنەی هاوکات بوون لە گەڵ شەڕی ماڵ وێرانکەری ئێراق و ئێرانەوە ناچار بۆ قۆناغی ناوەندی و دوا ناوەندی ڕودەکاتە شارەکانی مەریوان و سەوڵاوا و گوندەکانی دەورووبەری مەریوان. لە دوای وەرگرتنی دیپلۆم(١٩٩٠) لە قوتابخانەی ئیمام غەزاڵی(ر.ح.) مەریوان لە تاقیکردنەوەی سەراسەری زانکۆکاندا بەشداری ئەکات و لە کۆلیژی فێرکاریی سەرەتایی (آموزش ابتدایی) ناوەندی بارهێنانی مامۆستایانی سنە وەرئەگیرێت. ساڵی ١٩٩٢ ئەبێ بە مامۆستا و بۆ ماوەی سێ ساڵ لە قوتابخانەی ئوردوگای پەنابەرانی کوردی ئێراق کە پاش ماوەی کیمیابارانی هەڵبجە بوون، لە دزڵی و بارام ئاوا وانە ئەڵێتەوە. خولیای فێر بوون و زانست هانی ئەدات، لە ساڵی ١٩٩٤ دا دیسان لە تاقیکردنەوەی سەراسەری زانکۆکاندا بەشداری بکات؛ پلەی

یەکەم وەدەست دێنێت و کۆلێژی وەرزش هەڵدەبژێرێت. زۆر سەرکەوتووانە لە سێ ساڵدا وەک قوتابی پلەی یەکەم ئەو قۆناغەش تەواو ئەکات و ئەبێ بە مامۆستای وەرزش لە قوتابخانەکانی شاری مەریواندا.

تینویەتی کانیاوی فێر بوون و زانست وازی لێ نایەنێت و ساڵی ٢٠٠٠ بە پلەی سێهەمەوە لە زانکۆی بارهێنانی مامۆستایانی تاران لە بەشی فیزیولۆژی وەرزش وەرئەگیرێت و لەم قۆناغەش وەک خوێندکاری یەکەم دەرئەچێت.

لە بواری نووسین و لێکۆڵینەوەی وەرزشیدا یەکێ لە چالاکانی مەریوانە. چەندین خولی فێرکاری بۆ مامۆستایان و قوتابیان و وەرزشوانانی شاری مەریوان لە قوتابخانە و زانکۆی پەیامی نووری مەریواندا بەڕێوە بردووە. خاوەنی بڕوانامەی مامۆستایەتی «پزیشکی وەرزشی» لە فیدراسیۆنی پزشکیی ئێرانە. ئێستا دانیشتووی مەریوان و مامۆستای قوتابخانەکانی ئەم شارەیە.

**کارنامەی فەرهەنگی ـ وەرزشی ئەم نووسەرە بریتییە لە:**

١ـ بڵاو کردنەوەی وتار لە گۆڤارەکانی ناو خۆ و دەرەوەی وڵاتدا وەک: وەرزنامەی اولمپیک و ژورناڵی نێونەتەوەی World Journal of Sport Sciences

٢ـ نووسینی نامیلکەیەکی دەرسی لە ژێر ناوی «بێهداشت و وەرزش» کە لە زانکۆکاندا کەڵکی لێ وەرئەگیرێت.

٣ـ نووسینی نامیلکەیەکی دەرسی لە ژێر ناوی (اطلس کامل اسکلت بدن انسان تمام رنگی ) کە لە زانکۆکاندا کەڵکی لێ وەرئەگیرێت.

٤ـ ئامادە کردنی CD کەرەستەی کاری مامۆستای وەرزش و پەسەند کردنی لە لایەن بەشی لێکۆڵینەوەی سازمانی پەروەردە و بارهێنانەوە.

٥ـ بەشداری کردن لە کۆبوونەوەی نێونەتەوەیی «زانستی وەرزشی».

## ڕەئووف ڕەهنموون

ساڵی ١٩٧٠ی زایینی لە گوندی «ساداوا»ی سەر بە ناوچەی مەریوان لە بنەماڵەیەکی ئایینی و زانست پەروەر چاوی بەم دنیا بەرینەدا هەڵێناوە.

تەمەنی لە ساڵێک کەمتر بووە کە باوکی لە دەست ڕژێمی

پاشایەتی هەڵاتووە و بۆ مەلایەتی ڕووی لە ناوچەی شارەزوور کردووە و پاش چەند ساڵ لە شاری پێنجوێن گیرساوەتەوە. قۆناغی سەرەتایی تا پۆلی چوارەم لە پێنجوێن ئەخوێنێت، پاشان بە بۆنەی شەڕی ئێراق و ئێرانەوە ڕوو لە شاری سەیدسادق ئەکەن و خوێندنی سەرەتایی لەوێ تەواو ئەکات و پاشتریش لە شاری سلێمانی ساڵی تر ئەخوێنێت.

ساڵی ١٩٨٦ لە دەست ڕژێمی سەدام هەڵدێن. ڕوو لە کوردستانی ئەم دیو ئەکەنەوە و لە شاری سنە ئەگیرسێنەوە. پۆلی دووی دەبیرستان لە سنە ئەخوێنێت و پاش کۆتایی هاتنی شەڕی هەشت ساڵە، لە مەریوان نیشتەجێ ئەبن و خوێندنی دواناوەندی لە مەریوان تەواو ئەکات.

هەر لە قۆناخی ناوەندییەوە خوێندنی زانستە ئایینیەکان و زمان و وێژەی عەرەبی و فارسی لە خزمەتی باوکیدا دەست پێ کردووە. هەر بۆیە پاش وەرگرتنی بڕوانامەی دیپلۆمیش لە خزمەتی چەند زانای ئایینیدا درێژەی بەو خوێندنە داوە.

لە ساڵی ١٩٩٤ لە ئەزموونی دیاریکردنی ئاستی زانستی زانایانی ئەهلی سوننەتدا، کە لە لایەن کۆلێژی زانستە ئایینیەکانی زانکۆی تاران (دانشکده الهیات و معارف اسلامی دانشگاه تهران)ەوە بەڕێوە چووە، بەشداری ئەکات و لە «ئاستی دووەم»دا ــ کە هاوتای بڕوانامەی بەکالۆریۆسە ـ دەرچووە. پاش دوو ساڵ سەربازی، ساڵی ١٩٩٧ لە سنە بووەتە مامۆستای قوتابخانە و پاشان لە ساڵی ٢٠٠٢ دا بڕوانامەی «ئاستی سێ» (هاوتای بڕوانامەی ماستەرە) لە هەمان کۆلیژ وەرئەگرێت. ساڵی ٢٠٠٥ لە بەشی «فیقهی شافیعی» هەمان کۆلێژدا بۆ خوێندنی دوکتۆرا وەرگیراوە کە هێشتا خوێندنەکەی درێژەی هەیە.

هەر لە منداڵییەوە لە ناو کەشکۆڵ و دەسنووس و دیوانی شێعر و گۆڤارە ئەدەبی و ڕۆشنبیرییەکاندا ژیاوە. پێش تەواو کردنی قۆناخی ناوەندی، دیوانی زۆربەی شاعیرانی وڵاتەکەی خوێندۆتەوە. شاعیر بوونی باوکی و نەتەوەخوازی مامۆستایانی قوتابخانە و خۆپیشاندانە بەناوبانگەکانی جەماوەری شاری پێنجوێن و سەیدسادق و سلێمانی لە لایەك و ستەمی بێ‌سنووری ڕژێمی سەدام، بەس بوون بۆ ئەوەی خۆشەویستی زمان و خاك، ئاگر بەربداتە هەناوی. جێگای ئاماژەیە کە ئەم بەڕێزە کوڕی مامۆستا محەممەد یۆسفی ڕەهنموونە.

پاش گەڕانەوەشیان بۆ ئەمدیو، هەمیشە خوێنەرێکی بەئەمەک و دەمارگیری گۆڤارە کوردییەکان بووە.

**کارنامەی فەرهەنگی ئەم نووسەرە:**

١ـ دەیان نوسراو ـ کە بەشی هەرە زۆریان وەرگێڕان بوون ـ لە گۆڤار و حەوتەنامەگەلی ڕوانگە، ڕۆژهەڵات، ئاسۆ، ماف و...دا بڵاو بوونەتەوە.

٢ـ سەرنووسەری بەشی کوردی گۆڤاری ماف بووە، کە تەنیا دوو ژمارەی لێ دەرچوو.

٣ـ پیاچوونەوە و ئامادەکردنی کتێبی «زندگی‌نامەی شیخ معروف نودهی برزنجی»، نووسینی مامۆستا شێخ موحەممەدی خاڵ و وەرگێڕانی خوالێخۆشبوو ئوستاد ئەحمەدی حەواری‌نەسەب.

٤ـ پێداچوونەوەی «وەرگێڕاوی قورئانی پیرۆز» کە نووسراوی مامۆستای ئیبراهیمی مەردۆخییە و هێشتا لە چاپ نەدراوە.

٥ـ لێکۆڵینەوە و ئامادەکردنی «فەرهەنگی مەردۆخ»، نووسینی زانای بلیمەت ئایەتوڵڵا شێخ محەممەد مەردۆخی کوردستانی.

هەروەها چەند کتێب و نامیلکەشی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، کە هێشتا هەلی بڵاوکردنەوەیانی بۆ نەڕەخساوە. کاک ڕەئووف هەنووکە دانیشتووی - سنەیە.

**وەفا قادری**

وەفا قادری، کوڕی حاجی عوسمان و حەمیدە خاتوونە. ساڵی ١٩٧٠ لە گوندی جوان و دڵڕفێنی «میانە» چاوی بە ژیان هەڵێناوە و لە تەمەنی شەش ساڵیدا بنەماڵەکەیان واز لە ژیانی گوندنشینی دێنن و ڕوو لە شاری مەریوان ئەکەن. سەرەتای ئاشنا بوونی پەنجەکانی لە گەڵ پیتەکان و پێنووس ئەگەڕێتەوە بۆ قوتابخانەی «پەهلەوی» ئەو سەردەمەی شاری مەریوان. تا قۆناغی ناوەندی درێژە بە خوێندن ئەدات. پاش تەواو کردنی سەربازی، ژیانی ئاسایی خۆی لە شاری مەریوان دەست پێئەکات و ساڵی١٩٩٣ ژیانی هاوبەشی پێک دێنێت. لە سەر حەز و خواستی خۆی ڕوو لە دنیای کامێرا و کاری فەرهەنگی ئەکات و دوای بەشداری لە خولی فێربوونی فیلم سازی و وەرگرتنی بڕوانامە لەو بوارەدا، چالاکی

فەرهەنگی ئەنوێنێت.

**کارنامەی فەرهەنگی وەفا قادری:**

١ـ فیلمی دیکۆمێنتاری «قەڵای مەریوان» بە هاو کاری ئەنوەر ڕەوشەن.

٢ـ فیلمی دیکۆمێنتاری «کوڕەی میانە هەواری هەڵۆ بەرزەفڕەکان» بە هاو کاری ئەنوەر ڕەوشەن وچەند کەسێکی تر.

٣ـ فیلمی دیکۆمێنتاری «زرێبار شوناسی دێرینی ئەم هەرێمە» بە هاو کاری ئەنوەر ڕەوشەن.

٤ـ فیلمی دیکۆمێنتاری «ژیانەوە» بە هاو کاری ئەنوەر ڕەوشەن و خاوەنی ئەم پێنووسە.

٥ـ فیلمی «هاوارە بەرە» لە سەر ژیانی قالەمەڕە و شمشاڵ بە هاو کاری ئەنوەر ڕەوشەن و خاوەنی ئەم پێنووسە.

٦ـ تۆمار کردنی زۆربەی کۆڕ و کۆبوونەوە فەرهەنگیەکانی مەریوان بە کامێرای فیلم هەڵگر.

**بێهزاد کوردستانی**[1]

لە ڕاستیدا ئەم شاعیرە بیری نایەت کەی هاتووەتە دنیاوە، بەڵام ئەو شتەی کە گەورەترانی پێیان وتووە «ڕۆژی ٧ ی ئووتی ١٩٧٠ لە شاری مەریوان لە دایک بووە.» باوەڕی کردووە و هەرخۆشیان ناویان ناوە، پێیان وتووە ئەمە سەرەتای ژیانتە. لە واقێعدا خۆی وا ناڕوانێتە ژیان. ڕاستە کە یەکەم جار نووسی « ژیان » کە تەنیا چوار پیتی پەتی بەکار هێنا. بەڵام کە دێتە ناوەرۆکی مانا کردنەوەیەکی ژیانەوە، تێدەگات ژیان بەژانی دیترەوە واتە بەژانی دایکەوە دەست پێ دەکات و بەژانێکی بەردەوامەوە درێژە ئەدرێت. هەر لە سەرەتای ئەم نەخۆشینە کوشەندەوە بوو کە زانی ناوی باوکی یونسە و یەک خوشک و سێ برای پێش خۆی هاتوونەتە ناو نەخۆشینەکە هەر بۆیە زۆر بەخۆی پێکەنی و کەمێکیش بەزەیی بەوانا هاتووە.

لەساڵانی ١و٢و٣و٤و٥و٦ی تەمەنی هیچیان بۆ نەگێڕاوەتەوە، خۆشی هیچی لە بیر نایەت! کەتەمەنی دەگاتە حەوت ساڵان بە پەلەپەلێکی باوڕ نەکراو و خۆش

---

١. ئەم شێوە نووسینە بە پێنووسی خودی شاعیر و لە سەر خواستی خۆی نووسراوە.

بینانەیەکی خۆش باوەڕانە بردوویانە بۆ مەکتەبی سەرەتایی لەشاری مەریوان، ناو نووسییان کردووە تا ئەم کوڕە نەزۆر خۆشەویستەیان نەبێت بە شاعیر و سەرکەوتوو بێت! ئاخر گەورەتران دوکتورییان پێ خۆشتر بووە، بگرە زۆر خۆشتریش بووبێ. پێنج ساڵی تەمەنی لە مەکتەب بۆ ماڵەوە و لە ماڵەوە بۆ مەکتەب بە بیانووی دەرس خوێندنەوە تێپەڕ ئەکات و ئەم جارە گەورەترانیش لەبیریان نایەت کە زۆرتر لە سنە ژیاوە یان لە مەریوان. لە سنە خوێندنی دواناوەندی تەواو ئەکات.

لە ساڵانی ٨٨ و٨٩ و ٩٠باوەڕی کرد کە ئەتوانێ شێعر بنووسێ. ساڵانی ٩٢ و ٩٣ ڕۆیشتووەتە سەربازی و لە ئاواییەکانی «دەژن» سەر بە شاری کامیاران و «بەڵکەڕ» سەر بە مەریوان لە باتی سەربازی مامۆستایی کردووە. پاش سەربازی لە زانکۆی پزیشکی سنە «پاك و خاوێنی ژینگە»(بهداشت محیط) ئەخوێنێت کە تا ئێستاش بەو دوو ساڵ و چەند مانگەی ژیانی پێدەکەنێ.

لە ساڵی ٢٠٠١ دیوانی شێعری «غارەتی شەمامە»ی لەچاپ داوە، بەدرێژایی ئەم چەن ساڵانەی نووسینی بەردەوام شێعرەکانی لەگۆڤارە کوردییەکان‌دا لەوانە: سروە، ئاوێنە، سیروان، ئاویەر، ئاشتی، رامان، چاودێر و ...بڵاو کردووەتەوە.

دوو کۆمەڵە شێعر بەناوەکانی«هەڤدەونیو» و «پێچەوانە ڕەنگێکە لە گشتان دێ» ئامادەی چاپە. لە کونجی شێعرەکانیدا بە تەنیایی ئەژی و ژیانی هاوبەشی پێك نەهێناوە.

### محەممەد مستەفازادە

محەممەد مستەفازادە، کوڕی «محەممەد ڕەشید» و «کووفییە» خاتوونە. ساڵی ١٩٧٠ی زایینی لە شارۆچکەی «نۆدشە» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. قۆناغی سەرەتایی لە نۆدشە خوێندووە. دواتر هەواری ژیان ئەگوێزنەوە مەریوان و قۆناغی ناوەندی و دواناوەندی لەم شارە تەواو ئەکات. ساڵی ١٩٩١ لە زانکۆی «بەهەشتی تاران» لە ڕشتەی پەرستاری وەرگیراوە و لە ساڵی ١٩٩٥ەوە لە نەخۆشخانەکانی مەریوان خزمەت ئەکات. هاوکات وەك نووسەرێك خەریکی نووسین بووە و توانیوییەتی پەرتووکێك لە ژێر ناوی «زوانی هۆرامی و دنیای مۆدێرن» پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی بکات و پەرتووکێجتری لە ژێر ناوی «نامە

نویستەی بە زوانی هەورامی» لە ژێر چاپدایە.

ئەم نووسەرە ئەڵێت: «لە ڕۆژێکەوە هەستم بە ناسینی خۆم کردووە، خولیای کتێب و تینووی تێگەیشتن بووم و هەر لەو ڕۆژەوە ئەم پرسیارانەی خوارەوە وەک سەرەکی ترین پرسیار لە ناخ و مێشکمدا خۆیان نواندووە؛ ئامانج لە ژیان چییە؟ ئەرک چییە؟خزمەت چییە؟ ڕۆڵی زمان چییە؟ تا ئەو ڕۆژەی کە لەگەڵ ناخ وهەستم دا مامەڵەی ڕووڕاستم نەکرد، ئەو پرسیارانەم بۆ ڕوون نەبوویەوە. بەردەوام پەردەکان و چاویلکەکانم لائەبرد، کاتێک گەیشتمە دوا پەردە و دەستم برد بۆ پێنووس، خودی ڕاستەقینەم پێی ووتم: «بنویسە بە زوانی هۆرامی، بوانەوە بە زوانی هۆرامی، کە ئاڵا و قەڵەمی نەبڕیەینە باڵاو هیچ میللەتێویەرە.»[1]

## ئازاد ڕۆستەمی

لە دایک بووی ٢٣ی سپتەمبەری ١٩٧١ی زایینی مەریوانە. باوکی سەعید و دایکی نەهیە خاتوونە. لە سەرەتای خوێندنەوە تا کۆتایی قۆناغی دواناوەندی هەر لە مەریوان بووە. بۆ درێژەدان بە خوێندن چووەتە شاری سنە و لە زانکۆی کوردستان کۆلێژی «پاک و خاوێنی ژینگە»(بهداشت محیط)ی تەواو کردووە.

کاری نووسینی لە کۆتایی حەفتاکانەوە سەرەتا بە شیعر و پاشان شانۆنامە و کورتە چیرۆک و نۆڤلێت دەست پێکردووە. هاوکاری حەوتەنامەی ئاویەر و ئەندامی شۆرای نووسەرانی گۆڤاری زرێبار بووە.

لە چالاکانی دوو ئەنجومەنی فەرهەنگی ـ ئەدەبی مەریوان و مەولەوی سنە بووە و ئەنجومەنەکانی ئەندێشە و «شانۆی ڕۆژ»ی مەریوان بە هەوڵی ئەو دامەزراون. ساڵی ١٩٩٧ لەگەڵ کۆمەڵێک نووسەری ناسراوی کوردستان پرۆژەی ئەدەبی هونەری «داکار»یان ڕاگەیاندووە. ساڵی ٢٠٠٣ بە هاوکاری نووسەرانی ڕۆژهەڵات «کانوونی

١. واتە: بنووسە بە زمانی هەورامی، بخوێنەوە بە زمانی هەورامی، ئاڵا و پێنووس بە باڵای هیچ نەتەوەیەکدا نەبڕاوە.

نووسەرانی کوردستانی ئێران» یان پێکهێناوە. کۆمەڵێک بابەتی ئەدەبی و هونەری لە گۆڤارەکانی ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستان بڵاو کردۆتەوە. گۆڕینی کۆمەڵێک لە شێعرەکانی شاملوو بە کوردی و «وەرزی سەهۆڵبەندان»ی ڕەفیق سابیر بە فارسی، لە چالاکییەکانی ناوبراو لە بواری وەرگێڕاندان. لە بەرهەمە شانۆییەکانی ئازاد ڕۆستەمی ئەتوانین ئاماژە بکەین بە: دوانزە سوارە، ئێستاش مرۆڤ، دڵەڕاوکێکانی نووح، شەوەکانی ماڵی ڕێواس و دوورگەی شەو. هەر وەها نووسینی نزیک بە دە کۆمەڵە شێعر و چیرۆک بەرهەمی قەڵەمی ئەم نووسەرەن کە تا ئێستا بواری چاپی هەموویان نەڕەخساوە. ئازاد ڕۆستەمی لە ساڵی ٢٠٠٤ەوە دانیشتووی وڵاتی نۆروێژە و خوێندکاری ماستەری «کولتوور و کۆمەڵگا»ی زانکۆی ئۆسلۆیە.

**بەرهەمە چاپکراوەکان:**

١ـ کالیسکەیەک لە باران، ساڵی ١٩٩٣ چاپ کراوە (کۆمەڵە شێعر).

٢ـ لە خەونێکی ئەبەدیدا(کۆمەڵە چیرۆک).

## عەزیز ناسری

لە ساڵی ١٩٧٩ەوە وەک مامۆستای دواناوەندی لە قوتابخانەکانی مەریوان، وانەی زمان و ئەدەبی فارسی ئەڵێتەوە. ئەندامی ئەنجومەنی ئەدەبی مەریوان و کانوونی ڤەژینە. لە گەڵ حەوتەنامە و گۆڤارەکاندا بە نووسینی وتار هاوکاری هەیە و لە زۆر کۆڕ و کۆبوونەوەکانی پێوەندیدار بە فەرهەنگ و ئەدەبەوە بەشداری کردووە. ماوەیەک ئەندامی دەستەی نووسەرانی

گوڤاری زرێبار بووە و قۆناغەکانی خوێندنی تا پلەی ماستەر (لە زمان و ئەدەبی فارسیدا) بڕیوە.

لە زمانی خۆیەوە باشتری بناسین: ئەمن لە شاری بۆکان لە دایک بووم. سەر لە نیوەڕۆی نۆزدەی سێپتەمبەر ساڵی ١٩٧٠زایینی. بەڵام هێشتا بە تەواوی ناوکیان هەڵنەبڕیبووم، بەرەو حەمامیان لە بۆکانیان هەڵبڕیم. ئەویش پاش مانگێک کە نە لاقم عەرزی بۆکانی گرت و نە لە ئاوی «حەوزە گەورە»شم خواردەوە! دووساڵ دواتر بۆ هەمیشە ماڵ و کۆچمان لە مەهاباد خست.

که چاوێکم به دەوری خۆمدا گێڕا، دیوانه شێعری زۆربەی شاعیرانی کورد سەرنجی ڕاکێشام. «مەلا حەسەن»ی بابم کوڕە مەلایەکی دەست و پێ سپیلکە بوو، بە پێچەوانەی سەردەمی منداڵی و مێرمنداڵی و سەرەتای لاوێتی، کە هەم بە نازداری گەورە ببوو، هەمیش نەبوونی نەدیتبوو، پاش ماڵئاوایی بابەگەورەم لە دنیا، لە بەر دەست بڵاوی هەر ئەوەندە بوو دەست کورت نەبوو. بەڵام دەست و باڵی وێک هاتبوونەوە و تەنیا سەری ماڵ و منداڵی ڕاگرتبوو. لە لای باوکی قورئان و سەرف و نەحو و گوڵستان و بووستانی خوێندبوو. شێعریشی دەنووسی. غەزەلێکی بۆ «هاجەر»ە خاتوونی دایکم نووسیبوو، ئەگەر تووڕە نەبوایە ـ وەك واجبی شەرعی شە و ڕۆژ پێنج فەڕزە تووڕەیی لە سەر بوو ـ جارجار لە بەر خۆیەوە دەیخوێندەوە: «ناپرسی لە ئەحواڵی بریندارێ خەدەنگت/ شێواو و پەرێشان و سەراسیمەم و شەیدات». لە گەڵ ئەوەشدا کتێبخانەیەکی بوو. وەك بڵێی چۆن ناوکی بە ئایەت و حەدیس بڕا بوو، لە پەنا قورئان و تەفسیر و مێژووی ئیسلام و شێعری کەڵە شاعیرانی فارس ـ جگە لە فیردەوسی ئەویش لە بەر ئەوەی دەیگوت: «شانامە هەمووی درۆیە»(!) ـ لە نالی و مەحوی و مەولەوییەوە بگرە تا قانع و هێمن و هەژار، دیوانە شێعری شاعیرانی کوردیشی بوون. هەوڵی بابم لە ناساندنی ناودارانی کورد بە من، لەو سەردەمەڕا شوێنەوار و کاریگەری خۆی بە چەشنێك لە سەر ژیانی من دانا، کە هەر لە سەرەتاوە زۆر ئاسۆی بە سەردا کردمەوە. لە خەیاڵی بچووکی منداڵی خۆمدا بۆم دەرکەوت کە ڕاستەقینە زۆر دوورە لەوەی نەیاران هەوڵ ئەدەن بۆمانی بنووسن و بەختەوەرانە کوردیش بنیادەمە! لە یادمە لە ڕۆژێکی جومعەی بەهاری ساڵی ١٩٧٩دا، واتە کاتێکی کە من تەنیا نۆ ساڵم تەمەن بوو، لە سەر تەگبیری بابم و لە مزگەوتی سووری مەهاباد، پاش نوێژی جومعە(!) لە سەر بڵنگۆی مزگەوت شێعرەکەی «هەرکوردم»ی مامۆستا هێمنم خوێندەوە...

جا باشە من بۆ هەر دەبێ شێعری شاعیرانی تر بخوێنمەوە؟! ئەی خۆم چی؟ چەند ساڵ دواتر خۆشم دەستم پێکرد! نەمدەوێرا شێعرەکانم پیشان باوکم بدەم. لە سەفەرێکی بۆکاندا دەفتەرە سوورم نایەژێر باخەڵ ـ دەفتەرە بەرگ سوورەکەی هێمنی موکریانیم وەبیر دێنێتەوە، بەڵام ئەوکات نەم دەزانی شێعرەکانیشی هەر بە دەردی ئەوەدەچن! ـ شێعرەکانم بۆ مامم خوێندەوە. خۆم لام وابوو خەریکم شاکاری

ئەدەبی پێشکەش دەکەم، بۆیە مامم ئاوەها بە چێژ و حەوسەڵەوە گوێی بۆ ڕاداشتووم. تمەز لە دڵدا خەریکە گریانی دێت بۆ وێژەی کوردی کە من خۆم بە خاوەن و حەقداری دەزانم. دەفتەرەکەم بۆ خەتم کرد، لێی وەرگرتم. هەروا کە خەریک بوو لاپەڕەی هەڵئەداوە، گوتی: «عەزیزگیان! خۆ شێعر ئەوە نییە تۆ لاپەڕە ڕەش بکەیەوە و هێندەی قامکێک بەین بخەیە ناوەڕاستی دێڕەکانی ...

جا بە پێی ئەم ڕێنوێنییە ئەمن ئێستا تەنیا لای ڕاستی لاپەڕەکان دەنووسم و لای چەپ بە تەواوی سپی دێڵمەوە! کەچی مامم ئەمەشی هەرپێ شێعر نییە. دەڵێم مامەگیان چۆنە هەمووی هەر بە سپێتی بێڵمەوە!...

هەوەڵین بەرهەمم ساڵی ١٩٩٢ لە گۆڤاری سروەدا بڵاو بۆوە. ئەوکات من خوێندکاری ساڵی دووهەمی کۆلیژی زمان و ئەدەبی فارسی بووم...

**بەرهەمە چاپ کراوەکان:**

١ـ مویەی جدایی(وەرگێڕانی گوڵبژێرێک لە شێعرەکانی مامۆستا هێمن).
٢ـ دربند پروانە(وەرگێڕانی «دەربەندی پەپوولە»ی شێرکۆ بێکەس).
٣ـ آینەهای کوچک(وەرگێڕانی«ئاوێنە بچکۆلەکان»ی شێرکۆ بێکەس).
٤ـ دربار (وەرگێڕانی ڕۆمانی «دەربار»ی خوسرەو جاف).

**بەرهەمی ئامادەی چاپ:**

١ـ باڵای داگیرساوی دەنگ(کۆمەڵە شێعر).
٢ـ پووکانەوەی تاوێرەکان(کۆمەڵە شێعر).
٣ـ لاوک حلبچە(وەرگێڕانی «لاوکی هەڵەبجە»ی ڕەفیق سابیر).

**شەهین محەممەدی**

٢٢ی دیسەمبەری ساڵی ١٩٧١ ی زایینی لە مەریوان لە بنەماڵەیەکی مام ناوەندی چاوی بەژیان هەڵێناوە.

سەرەتای خوێندنی تا وەرگرتنی دیپلۆم لە ساڵی ١٩٩٠ دا، هاوکات بووە لە گەڵ کۆچاوکۆچ و ئاوارەیی بە هۆی شەڕی نێوان ئێراق وئێران. بە وتەی خۆی: « لەمە دڵتەزێنتر خوێندن لە

ناو [بازنەی] بیر و باوەڕی پیاو سالارانەو دواکەوتوودا بوو کە لەودا کچ ئیزنی خوێندنی پێنەئەدرا.»

بۆدرێژەدان بەخوێندن ساڵی ١٩٩٠ لە ناوەندی بارهێنانی مامۆستایانی سنە(مرکزتربیت معلم)وەرئەگیرێت و دوای دوو ساڵ خوێندن وەك مامۆستای زمان و ئەدەبی فارسی لە قوتابخانەکانی مەریواندا وانە ئەڵێتەوە.

خولیای فێر بوون هانیئەدات کە دیسان شاڕێی خوێندن بگرێتە بەرو لە کانیاوی زانست زۆرتر بەهرەمەند ببێت. هەر بۆیە ساڵی ١٩٩٨ لە زانکۆی کرماشان، بەکالۆریۆسی ئەدەبی فارسی و ساڵی ٢٠٠٩ یش لە «زانکۆی ئازادی» مەریوان «فوق دیپلۆم»ی زمان ئینگلیزی تەواو ئەکات. ساڵی ١٩٩٥ ژیانی هاوبەشی پێك هێناوە.

ئەم نووسەرە لە دامەزرێنەرانی «ئەنجوومەنی ژنان»ی مەریوانە. کتێبێکی لە ژێر ناوی «دریچەای بە دیار فریاد» (دەلاقەیەك بەرە و وڵاتی هاوار) ئامادەی چاپ و بڵاو بوونەوەیە.

### سەمیرە نەقشبەندی

ساڵی ١٩٧١ی زایینی لە شاری هەڵەبجە لە بنەماڵەیەکی مامناوەندی کە لە سیانزە ماڵەی هەلەبجەن[1]، چاوی بەم دنیا هەڵیناوە. باوکی حەمە تۆفێق و دایکی شەرافەت حەمەئەمینە. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی هەر لە هەڵەبجە تەواو کردووە.

ساڵی ١٩٨٨ لە کاتی بۆردوومانی شاری هەڵەبجەدا بۆ ڕزگار بوون لە دەست دێوەزمەی دیکتاتۆری بەرە و ئێران هەڵدێن. دوای ساڵێك مانەوە لە ئێران بەرەو ئێراق ئەگەڕێنەوە.

ساڵی١٩٩١ لە بەشی بوونەوەرناسی زانکۆی سەلاحەدینی هەولێر وەرئەگیرێت. لە کاتی ڕاپەڕینە گشتییەکەی کوردستان، دووبارە ئاوارەی کوردستانی ئەم دیو ئەبێت و

---

١. مەبەست لە سیانزە ماڵەی هەڵەبجە، ئەو سیانزە ماڵە جولەکەن کە بنەڕەتی شاری هەڵەبجەیان داناوە.(ن)

ژیانی هاوبەشی لە مەریوان پێکەوە دەنێت و بۆ هەمیشە لەم شارە ئەگیرسێتەوە.

دوای ماوەیەک دوور بوون لە نووسین و خوێندنەوەی کوردی بە هاندانی مێردەکەی، یەکەم کاری فەرهەنگی خۆی کتێبی «بیرەوەرییەکانی شازادە خاتوونێک» لە فارسییەوە وەرئەگێڕێتە سەر زمانی کوردی و پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی ئەکات.

## مستەفا عەبدی

مستەفا عەبدی کوڕی محەممەد عەلی لە ٢٣ی فەبرییەی ساڵی ١٩٧١ی زایینی لە گوندی بێساران و لە بنەماڵەیەکی هەژار و نەخوێندەوار چاوی بە ژیان هەڵێناوە. بەڵام دەستی قەدەر زۆر زوو لە گوڕ و تینی چڕاند. ناسۆری بێ باوکی دەفتەری هیواکانی دڕاند و لە بەر هەتیوی و هەژاری نەیتوانیوە درێژە بە خوێندن بدات. هەر لە قۆناغی سەرەتاییدا ماڵئاوایی لە قوتابخانە و هاوپۆلەکانی ئەکات. ئەم نووسەرە خاوەنی زۆر بەهرەی جوانە لە بواری بیرکاری و هونەریدا. ئەو توانایییەی کە زۆر سەرنج ڕاکێش و جێگای تێرامانە، ئەوەیە کە زۆر بە ئاسانی توانای دۆزینەوەی سەرەتا و ئاخری مانگەکانی لە ڕابردوو و داهاتوودا هەیە. ڕۆژمێرێکی دەمیلیارد ساڵەشی خستووەتە بەردەستی خوێنەران! بەڵام سەد مەخابن وەک زۆربەی زانایان و پیاوانی گەورەی کورد بێ‌ماڵ و منداڵ و ئاوارە هەر شەو و ڕۆژێک میوانی خێرخوازێکە. زۆر هەوڵم دا لە زمانی خۆیەوە ژیانامەکەی بخەمە بەردەستی خوێنەران بەڵام بە هۆی نەخۆشی دەروونی هاوڕێیی نەکردین.

## د. ئومید وەرزەندە

ساڵی ١٩٧١ی زایینی لە مەریوان لە دایک بووە. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی خۆی لە مەریوان تەواو دەکات و پاشان نیشتەجێی سنە دەبێت. ساڵی ١٩٩٤ لە زانکۆی هەمەدان بەکالۆریۆسی وەرگێڕانی زمانی ئینگلیزی وەردەگرێت. هەر لە هەمان ساڵەوە دەست دەکات بە بەشداری کردن لە کۆڕ و

کۆمەڵە ئەدەبییەکاندا. بۆ ماوەی چوار ساڵ دەبێتە ئەندامی دەستەی نووسەرانی حەوتەنامەی ئاویەر لە سنە. هاوکات لەگەڵ ئەوە بۆ پێنج خول لە فستیڤاڵی شانۆی کوردی مەریوان دەبێتە سەر نووسەری بۆڵتەنی ڕۆژانەی ئەو فستیڤاڵە. ساڵی ١٩٩٩ هاوکاری خۆی لەگەڵ ئەنستیتۆی کورد لە تاران دەست پێدەکات و دەبێتە ئەندامی کۆڕی زانستی زمانی کوردی. هەر لەم ساڵەدا یەکەمین کتێبی خۆی «شاید جیبهایم پر شود از برف» لە چاپ ئەدات کە وەرگێڕانی هەڵبژاردەی شێعری شاعیری تاراوگە نشینی کورد «بە ڕۆژ ئاکرەیی»یە بۆ سەر زمانی فارسی.

ساڵی ٢٠٠١ بە هاوکاریی بەختیار سەجادی پرۆژەی شێعری ئینگلیزی لە دوو بەرگدا لە چاپ دەدات کە وەرگێڕانی شێعری سەدەی بیستەمی بەریتانیا و ئەمریکایە بە زمانی کوردی.

تاکوو ئێستا لە زۆربەی ڕۆژنامە و هەفتەنامە کوردییەکاندا وەکوو: زرێبار، سیروان، ڕۆژ هەڵات، ڕامان، گەلاویژ، سەردەم، کوردستانی نوێ، برایەتی، زمانەوان، کاروان و... بەرهەمەکانی بڵاو بوونەتەوە. ساڵی ٢٠٠٣ دەڕوات بۆ وڵاتی هیندوستان و خوێندنی خۆی لە «زانکۆی پوونا» تا پلەی دوکتۆرا لە بەشی ئەدەبیاتی ئینگلیزی تەواو دەکات. لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا لە چەندین کۆنفرانسی نێونەتەوەییدا بە وتار بەشداری دەکات و لە چەند ڕۆژنامەی ئینگلیزی زمان وەکوو: «Times of India و Maharashtra Herald» بەرهەمەکانی خۆی بڵاو دەکاتەوە. ساڵی ٢٠٠٥ لە دوو ئەنتۆلۆجیای شێعردا بە زمانی ئینگلیزی شێعری شاعیرانی کورد بڵاو دەکاتەوە. دوکتور ئومێد وەرزەندە ئێستاکە مامۆستای زانکۆی ئازادی سنەیە.

## سدیق مەحموودی

کوڕی محەممەد و ئامین، یەکەم مانگی وەرزی بەهاری ساڵی ١٩٧٢ ی زایینی لە بنەماڵەیەکی مام ناوەندی لە شارەدێی «سەوڵاوا» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. سێهەمین منداڵی بنەماڵەکەیەتی. قۆناغی سەرتایی و ناوەندی هەر لە زێدەکەی خۆی و دواناوەندیشی لە مەریوان خوێندووە. هەر لەو ساڵەدا بە سەرکەوتن لە تاقیکاری لە ناوەندی بارهێنانی مامۆستایان وەرئەگیرێت، بەڵام بە

هۆیەکی نادیارەوە پێشی لێ ئەگرن. لە دوای دوو ساڵ سەربازی لە سوومار خولیای دەرس و زانست هانی ئەدات. دیسان لە ساڵی ١٩٩٦ لە تاقیکاریدا بەشداری ئەکاتەوە و لە بەشی زانستە ئیسلامییەکانی زانکۆی تاران وەرئەگیرێت. بەپلەی بەکالۆریۆسەوە لە دوای بەشداری کردن لە ئیمتیحانی هەڵبژاردنی مامۆستایان، کە لە لایەن وەزارەتی پەروەردەوە بەڕێوە ئەچێت، ئەبێتە مامۆستای دواناوەندی.

دوای هەوڵێك بۆ درێژەدان بە خوێندن لە بەشی کارناسی باڵا (ماستەر) بڕێك باس کە پێویستی بە باس و لێکۆڵینەوە بووە سەرنجی ڕائەکێشن. هەر ئەوە ئەبێ بە هەوێنێك بۆ ئەوەی بنووسێ.

دوای دوو ساڵ یەکەم بەرهەمی خۆی وەك پەرتووك لە ژێر ناوی «جامعه، قوانین بشری یا قوانین الهی» پێشکەش بە هۆگرانی ئەکات. ئەم نووسەرە کتێبێکی تری لە ژێر ناوی «چگونگی پیدایش جهان و پایان آن از دیدگاه علم و قرآن» ئامادەی چاپە. ناو براو ئێستا دانیشتووی مەریوانە.

## سەعید ئەکبەری

ئەم نووسەرە کوڕی سۆفی مستەفایە و ساڵی ١٩٧٢ی زایینی لە گوندی «کەماڵا» لە دایك بووە. سەرەتای خوێندنی لە تەمەنی پێنج شەش ساڵیدا بە قورئانی پیرۆزەوە دەست پێئەکات و بە کتێبە ئایینیەکانەوە لە خزمەتی حاجی محەممەدی باپیری و مامۆستا مەلا سەعیدی کەرەمی درێژەی پێئەدات.

تا پۆلی چوارەم لە قوتابخانە ئەخوێنێت و ساڵی ١٩٨٥ بۆ خوێندن لە بواری ئایینیدا، واز لە قوتابخانە دێنێت. ساڵی ١٩٩٢ لە سەر ئیزنی خوالێخۆشبوو مامۆستا عەبدوڵڵا مەردۆخی و مامۆستا حەسەن ئۆخرەتی و مامۆستا سەید عەلی حسێنی، ئیجازەنامەی مامۆستایەتی پێ ئەبخشرێت. ساڵی دواتر ئەبێ بە مامۆستای مزگەوتی دەرەوشکە لە ناوچەی کەلاتەرزان و هەر لەوێ ژیانی هاوبەشی پێك دێنێت.

ئەم نووسەرە بۆ مامۆستایەتی، گوندەکانی پلوورە و پەیچوون و ناوچەی لەیلاخ و

سەوڵاوا گەڕاوە. بۆ بژێوی ژیانی، کارگەلی وەک نووسینی تابلۆ و ڕەنگکاری ماڵان و خەت نووسین و ... کردووە.

**بەرهەمەکانی نووسەر:**

١ـ حاشیە ملا عەبدوڵڵا مەشهور بە (عەبدوڵڵا یەزدی)، لە زانستی مەنتیق دا.

٢ـ هدایە، لە زانستی «نەحو»دا.

## جەمال ئیمانی

لە ٢٣ی ئووتی ساڵی ١٩٧٢ ی زایینی لە گوندی «بەرقڕو» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. قۆناغی سەرەتایی لە شاری مەریوان تەواو کردووە. بە بۆنەی شەڕی ئێراق و ئێران و ئاوارە بوونی خەڵکی شاری مەریوان، قۆناغی ناوەندی و دوا ناوەندی لە مەریوان و سەوڵاوا تێپەڕکردووە. هەر لە تەمەنی منداڵییەوە خولیای چیرۆک و شانۆ ئەبێت و بە وتەی خۆی: «لەو تەمەنەدا لە بەر نەبوونی و هەژاری دوو جار و هەر جارە شانۆنامەیەکی دزیوە».

مامۆستایەکی ئەمەکناس بە نێوی «کاک ئەحمەد ڕەوشەن» ئەو توانا و بەهرەیەی تێدا ئەبینێت و ئەبێ بە هاندەری سەرەکی و دەستی دەگرێت. لە ساڵی ١٩٨٣وە پێی ناوەتە دنیای شانۆوە. ساڵی ١٩٨٨ یەکەم شانۆی خۆی بە نێوی «قویترین‌ها»(بەهێزترینەکان) نووسیوە و وەک دەرهێنەر و ئەکتریش ڕۆڵی تێدا بینیوە.

بە نووسینی وتار و شێعر و چیرۆک لە گەڵ حەوتوونامەکانی ئاویەر، سیروان، تیشک و نقاردا هاوکاری کردووە. لە زیاتر لە دە شانۆدا دەوری گێڕاوە و هەر بەم ڕادەیەش دەرهێنەر بووە.

**کاری هونەری و بەرهەمی نووسەر:**

١ـ چوارچێوەی بێ تۆیی(کۆمەڵە چیرۆک، ئامادەی چاپ). ٢ـ پەپوولە( شێعر بۆ منداڵان). ٣ـ بە هێزترینەکان( شانۆنامە، فارسی).٤ـ سێ کەسی ( شانۆنامە، فارسی).

٥ـ کوودەتای بێ ئاکام( شانۆنامە، فارسی). ٦ـ وەرە باران( شانۆنامە بۆ منداڵان، فارسی). ٧ـ بەشداری لە فستیڤاڵی سەرانسەری لاوانی وڵات وەک چیرۆک نووس.

٦ــ دەستەی هەڵسەنگێنەری ئەنجوومەنی شانۆ لە چەند خولدا.٩ــ ئەندامی ئەنجومەنی ئەدەبی مەریوان.١٠ــ میوانی(وەرگێڕان بۆ کوردی، شانۆنامەیەک لە نووسینی بارام بەیزایی).

## فاتح بادپەروا

ساڵی ١٩٧٢ ی زایینی لە مەریوان و لە بنەماڵەیەکی مام ناوەندی لە دایک بووە. سەردەمی خوێندنی هاوکات ئەبێ لە گەڵ شەڕی ناوخۆ و شەڕی ئێران و ئێراق و ئاوارەیی و نەهامەتی و کۆچاوکۆچیی شارە و شار و گوند بە گوند. بەڵام لە گەڵ ئەم دەربەدەرییەدا کاری ڕۆشنبیری و چالاکیی هونەری و فەرهەنگی درێژە پێ داوە.

پۆلی چواری سەرەتایی لە گەڵ شانۆ ئاشنا بووە. ساڵی ١٩٨٢ بۆ یەکەم جار وەک ئەکتەر لە شانۆی «داهۆڵ»دا بەشداری ئەکات.

لە ناوەڕاستی دەیەی نەوەدا وەک کارمەند (بە پێی گرێبەست) ئەچێتە دائیرەی «فەرهەنگ و ئیرشادی ئیسلامی». لە دامەزراندی ئەنجومەنی شانۆی مەریواندا دەورێکی بەرچاوی ئەبێت و هاوکات لە گەڵ چەند شانۆکاری تری مەریوانیدا «گروپی شانۆی باران» وەڕێ ئەخەن. پاش دە ساڵ دەست لە کارمەندییەکەی ئەکێشێتەوە و لە دەرەوەی ئەم دائیرەیە درێژە بە کاری هونەری ئەدات.

یەکێک لە گەورەترین دەسکەوتەکانی شانۆکارانی مەریوان و کوردستانی ئێران «فستیڤاڵی ساڵانەی شانۆی سەرشەقامی مەریوان»ە کە ئێستا خەریکە بەرە و ئاستی نێونەتەوەیی ئەڕوات. بەشی زۆری ئەم دەسکەوتە مەعنەوییە بەرهەمی هەوڵ و ماندوویی فاتح بادپەروایە. بەرپرسی ئەنجوومەنی شانۆی مەریوان بۆ ماوەی نزیک بە دە ساڵ، دوو ساڵ جێگری بەرپرسی ئەنجوومەنی شانۆی کوردستان، داوەری چەندین فستیڤاڵی شانۆیی و وەرگرتنی چەندەها خەڵات بە بۆنەی سەرکەوتنەکانی لە کاری شانۆدا و لە نێوانیاندا دوو خەڵاتی تایبەتیی «مێهرەجانی نێو دەوڵەتی فەجر» لە تاران، هەموو دەرخەری پێگەی ئەم هونەرمەندە شانۆکارەن.

فاتح بادپەروا لە ماوەی ژیانی هونەری خۆیدا، نزیکەی سی شانۆی وەک

دەرهێنەر پێشکەش کردووە، لە زیاتر لە پانزە شانۆدا وەک ئەکتەر دەوری گێڕاوە. ئەم هونەرمەندە شانۆکارە ئەندامی ئەنجوومەنی ئەدەبی مەریوانە و لە ڕیزەی چالاکییەکانی ناو براو لەم ئەنجوومەنەدا دەتوانین ئاماژە بەم چەند درگەیە بکەین: سەرۆکی دەستەی بەڕێوەبەرایەتی کۆنگرەی مامۆستا ناری، ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەرایەتی کۆنگرەی مامۆستا بێسارانی و سەرۆکی دەستەی بەڕێوەبەرایەتی کۆنگرەی مامۆستا قانع.

**بەرهەمەکانی هونەرمەند لە بواری نووسیندا :**

١ـ خوا ڕۆژی ئەدات نەک خەلیفە،(شانۆنامە بە فارسی، ١٩٨٦ ). ٢ـ یەخسیری چارە نووس، (شانۆنامە بە فارسی،١٩٨٧). ٣ـ فڕین، (شانۆنامە بە فارسی، ١٩٨٨). ٤ـ خولە پیزە،(شانۆنامە بە کوردی، ١٩٩٩). ٥ـ چەند کورتە چیرۆکێک(ئامادەی چاپ).

فاتح ئێستا دانیشتووی شاری مەریوانە و هۆی سەرکەوتنیشی بە پشتگیری و دڵگەرمی بنەماڵەکەی و سەمیرا خاتوونی خێزانی دەزانێ.

**قادر ئەحمەدی**

ڕۆژی بیست و یەکی ئاوریلی ساڵی ١٩٧٢ی زایینی لە گوندی «چاوگ» لە بنەماڵەیەکی مام ناوەندی لە دایک بووە. وەک هەموو منداڵێکی تر پاش تێپەڕ بوونی شەش ساڵ لە تەمەنی، وەبەر خوێندن نراوە. تا پۆلی دووهەمی دوا ناوەندی توانیویە دەرس بخوێنێ. لە تەمەنی پانزە ساڵییەوە لە گەڵ زمان و ئەدەبیاتی کوردی ئاشنا بووە، ئەویش بە هۆی خوێندنەوەی گۆڤاری سروە کە لەو کاتەدا تەنیا بڵاڤۆکی کوردی بووە. بەردەوام هەوڵی خۆپێگەیاندن لە بواری شێعردا ئەدات کە دوای ماوەیەک وازی لێ دێنێت و ڕوو لە مێژوو ئەکات.

پاییزی ساڵی ١٩٩٩ ژیانی هاوبەشی دەست پێئەکات. یەکەم نووسراوەی قادرئەحمەدی وتارێک بووە لە سەر مێژووی ڕۆژنامەنووسی کوردی کە لە حەوتەنامەی ئاویەردا بڵاو ئەبێتەوە.

وەک کتێب، یەکەم بڵاو کراوەی کتێبی «کورد و مێژوو» بووە و ساڵی ٢٠٠٥ چاپ و بڵاو بۆتەوە. هەر وەها کتێبێکی تری لە ژێر ناوی «ژن لە ڕۆژهەڵاتی کۆندا»

ئامادەی چاپە.

وتارەکانی لەم ڕۆژنامە و گۆڤارانەدا بڵاو کراونەتەوە : ئاویەر، سیروان، ئاوێنە، کشت و کاڵ و...

## کامیل سەفەریان

لە بیستویەکی ئاوریلیساڵی ١٩٧٢ی زایینی لە گوندی «نژمار» سەر بە شاری مەریوان لە بنەماڵەیەکی دەست کورت و هەژار و نەخوێندەوار چاوی بەژیان هەڵێناوە. باوکی محەممەد دایکی شەمسە خاتوونە. قۆناغی سەرەتایی لە نژمار و ناوەندیشی لە گوندەکانی کانیدینار و نەنە تەواو کردووە.

قۆناغی دواناوەندیی خوێندنی پڕ بووە لە چەرمەسەرێ و هەژاری و ئاوارەیی، نەبوونی و دەست کورتی بنەماڵە. نەبوونی شوێنێک بۆ حەسانەوەی شەوانە لە ناو شاردا، تۆپ بارانی مەریوان و بۆردمانی شیمیایی نژمار و....

سەرەڕای ئەم دنیایە، هەمووساڵێک وەک یەکێ لە قووتابییە زۆر چالاکەکانی قووتابخانەکەی ئەناسرێت و بەم چەشنە پلەکانی سەرکەوتن ئەبڕێ. پاش تەواو کردنی قۆناغی دواناوەندی لە زانکۆ کوردستان لە سنە وەردەگیرێ و بۆ یەکەم جار لە مەریوان پێ ئەنێتە دەر.

هێدی هێدی لە گەڵ ئەدەبیاتی جیهان ئاشنا ئەبێت، جانئەشتاین بەک، بوریس پاسترناک و هەروەها همینگوێ، سێ گەورە نووسەر بوون کە هەست و علاقەی ئەویان بۆ ئەدەبیات بزواندووە. نووسراوەکانی پاسترناک لە دوکتور ژیواگۆدا لە گەڵ جوان کارییەکانی ئەشتاین بەک پێخۆرێک بوون بۆ ڕۆحی ئەو.

ساڵی ١٩٩٣ کە چووەتە زانکۆ، لەوێ دەرفەتێکی چاکی بۆ لێکۆڵینەوە لە مێژو و ئەدەبیات بۆ ڕەخساوە. نووسراوەکانی ساڵی ١٩٩٦ لە دوای تەواو بوونی زانکۆ لە دایک بوون. خۆی ئەڵێ:[1] «وا هەست ئەکەم پێنووسەکەم دێر خستەگەڕ، بەڵام پێشتر جار جارێک چیرۆکێکی کورتم بۆ خۆم ئەنووسی.»

---

١. وت و وێژ لە گەڵ نووسەر.

ساڵی ١٩٩٨ بە تەواوی ماڵئاوایی لە نژمار ئەکات و لە مەریوان نیشتەجێ ئەبێت. بەرگی مامۆستایی لە بەر ئەکات و هاوکات لەگەڵ وانە وتنەوە، چالاکی فەرهەنگی ئەم نووسەرە گەشە ئەکات. مەولانا وتەنی شار هەلی بۆ نووسینی ڕەخساند، یەکەمین بەرهەمی لە گۆڤاری زرێبار بلاو کرایەوە. هەنووکەش بەردەوامە لە سەر نووسین سەبارەت بە مێژووی ئەدەبیاتی کلاسیك و نوێی کوردی.

ناوبراو ئەڵێ: «پێم وایە ئەدەبیاتی کوردی سفرەیەکی پان و بەر بلاوە کە ئەتوانێ میوانداری گشت هۆگرانی بیت. بە داخەوە من دێر هاتمە سەر ئەم سفرەیە و چێژم لێ وەرگرت.»

ئەم بەرهەمانەی بە زمانی فارسی کەوتۆتە بەردەستی خوێنەران: «یادداشت هایی پیرامون مهر پرستی در کردستان»، « سەیدی» و «دێوەزناو».هاوکاری لەگەڵ ئەم گۆڤارنەی خوارەوە بووە:

کەرەفتوو، ئاسۆ، ڕاسان، پیام کوردستان، ئاشتی، زرێبار، سیروان، تیشك، سروە و دیار کهن.

کتێبی ئامادەی چاپ: شاکارەکانی شێعری هەورامی، لێکۆڵینەوە لە سەر شێعرەکانی ناری.

## کەماڵ عەبدوڵلایی (مەریوانی)

ئەم نووسەرە ساڵی ١٩٧٢ی زایینی لە شاری مەریوان لە دایك بووە. باوکی ناوی محەممەد و دایکیشی حەفسە خاتوونە. خوێندنی هەر لە شاری مەریوان دەست پێکردووە بەڵام بەر لەوەی قۆناغی دواناوەندی تەواو بکات دەستی لێ کێشاوەتەوە. کەماڵ مەریوانی لە ساڵی ١٩٧٦ەوە بە شێعر و وتار لە گەڵ حەوتەنامە و گۆڤارە کوردییەکان هاوکاری کردووە. ئەم نووسەرە لە ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەری ئەنجوومەنی ئەندێشەی مەریوان بووە. لە ساڵی ٢٠٠٧ەوە لە وڵاتی سویس ئەژیت و لەو نووسەرانەیە کە لە تاراوگە، لە سەر کاری ئەدەبی و نووسین تا بە ئەمڕۆ چالاك و شێلگیرە.

**بەرهەمە چاپکراوەکان:**

١ــ تووکـایەک لە قەفەزدا، (بەرهەمـی نیما یوشیج، وەرگێڕانـی بە زمـانی کوردی)١٩٩٨. ٢ـ چرۆی باران (کۆمەڵە شێعر)٢٠٠٠.

کەماڵ مەریوانی ئێستا دوو بەرهەم (کۆمەڵە شێعرێک و سێ چاو پێکەوتن لە گەڵ وەرگێڕە ناسراوەکان)ی ئامادەی چاپە.

## مەحموود مۆبارەک شایی

ســاڵی ١٩٧٢ی زایینـی لە شـارۆچکەی «نۆدشـە» لە بنەماڵەیەکی ئایینی چاوی بە ژیـان هەڵێنـاوە. بـاوکی «مامۆسـتا محەمەد» و دایکی «مەنیژە» خاتوونە.

قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی، ناوەندی و دواناوەندی لە شارۆچکەی نۆدشەی سەر بە هەورامانی لهۆن تەواو کـردووە. سـاڵی ١٩٩٢ لە زانکـۆی ئیـسفەهان وەرگیـراوەوە و سـاڵی ١٩٩٦ بەکالۆریۆسـی لە ڕشتەی جۆگرافیـادا وەرگرتـووە. لە سـاڵی ١٩٩٦ەوە وەک مامۆسـتای جۆگرافیـای قوتابخانە دواناوەندییەکانی مەریوان خەریکی وانەوتنەوەیە.

ساڵی ٢٠٠٦ لە تاقیکاری زانکۆی بارهێنـانی مامۆسـتایان لە ڕشتەی «جۆگرافیـای ڕامیاری»دا سەرئەکەوێت، بەڵام بە هـۆی کێشەیەکەوە پێشی لێئەگرێـت. دوو سـاڵ دواتـر درێـژە بە خوێنـدن ئەدات و سـاڵی ٢٠١٠ خوێنـدنی لە ئاسـتی ماسـتەر تەواو کردووە و بڕوانامەکەی لە ژێر ناوی «بەربەستەکانی گەڕانەوەی کەرکووک بـۆ سـەر هەرێمی کوردستان» داناوە.

ئەم مامۆسـتا نووسـەرە یەکـێ لە چالاکـانی فەرهەنگـی شـاری مەریـوانە کە بە پێشکەش کردنی وتار لە کۆبوونەوەکاندا بەشـداری هەبـووە و لە گەڵ بڵاڤۆکەکـانی سیروان، ئاشتی، ئاسۆ، زرێبار، تاڤگە و چیا دا وەک نووسەر هاوکاری کردووە.

ئەم نووسەرە ئەڵێت: « گیروگرفتی فەرهەنگی، کۆمەڵایەتی و ئابووری وڵاتەکەم، هاندەری سەرکی بوون بۆ هاتنم بۆ دنیای نووسین و لێکۆڵینەوە».

ئەم نووسەر و لێکۆڵەرە کتێبێکی لە ژێر ناوی «جۆگرافیای ڕامیـاری کوردسـتانی باشوور» ئامادەی چاپە.

## پژمان حەبیبی

پژمان حەبیبی ساڵی ١٩٧٣ی زایینی لە گوندی «نسڵ» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. باوکی «غەفوور» و دایکی «ڕاحلە» خاتوونە.

قۆناغی سەرەتایی لە گوندەکەی خۆی و دوا ناوەندیش لە سەولاوا تەواو ئەکات. ساڵی ١٩٩٤ لە ناوەندی بارهێنانی مامۆستایان لە کرماشان وەرئەگیرێت. دوای شەش ساڵ مامۆستایەتی دیسان لە تاقیکاریدا سەرئەکەوێت و ساڵی ٢٠٠٢ لە زانکۆی بابولسەر بەکالۆریۆسی کیمیا وەرئەگرێت. ئەم مامۆستا نووسەرە بە نووسین و وتار لەگەڵ بلاڤۆکەکانی ڕاسان و چیادا هاوکاری کردووە و چەندین پەرتووکی چاپ و بڵاو بۆتەوە و چەند کتێبێکی تری ئامادەی چاپ و بڵاببوونەوەیە. ئەم مامۆستایە ئەڵێت: «هەژاری و نەداری قوتابیان وهەست کردن بەوەی کە پێویستیان بە هەوڵی زۆرتر هەیە هانیان دام کە ڕوو لە دنیای نووسین و لێکۆڵینەوە بکەم».

**بڵاوکراوەکان:**

١ـ شیمی دووی حەبیبی.

٢ـ ژیاننامەی پاڵەوان و هونەرمەند حسێن کۆکەن.

**ئامادەی بڵاببوونەوە:**

١ـ کوێستان (کچێک فیدای خۆسوتان)

٢ـ کۆمەڵێک چیرۆک و پەندی پێشینانی سەر زاری خەڵکی کوردستان.

## ڕەئووف جەهانی (سەیوان.ج)

لە ساڵی ١٩٧٣ی زایینی لە گوندی «خانمەشێخان» لە بنەماڵەیەکی دەسکورتدا لە دایکبووە. باوکی «ناوی ئیبراهیم» و دایکی ناوی فاتمەیە. لە سەردەمی ئاوارەیی و شەڕی ئێران و ئێراقدا لە گوندەکانی دەوروبەر و لە شاری مەریواندا تا پۆلی دووەمی دواناوەندیی خوێندووە.

ئەم نووسەرە لە بواری چیرۆکی منداڵاندا خەریکی

چالاکییە و ئەڵێت[١]: «لە پۆلی دوو و سێی قۆناغی سەرەتاییەوە گوێم لە بەشی کوردیی ڕادیۆی بەغدا گرتووە و هەر لەو ڕۆژانەدا باوکم گوێی لە کاسێتێک ئەگرت کە شێعرەکانی مامۆستا قانعی تێدا بوو و من هەندێ شێعری مامۆستا قانعم بیست و لەبەرمکردن. پاش چەند ساڵێک دیوانەکەیم بینی و چونکو هەندێ شێعریم - بە هۆی کاسێتەکەوە ـــ لەبەر بوو، شێعرەکانی تریشم بە زۆر و نقەنق ئەخوێندەوە و ئەمنووسینەوە و پاشان بۆ هاوڕێکانم ئەخوێندەوە. بەهۆی بەشی کوردیی ڕادیۆ بەغداوە هەندێ شیعر و گۆرانی و بابەتی فۆلکلۆر و هتد ...م بیستبوو و شێعرەکانی مامۆستا قانع و بە تایبەت ئەو کاسێتە کە پێشتر باسمکرد زۆریان هاندام بۆ کوردی نووسی».

بابەتەکانی نووسەر- کە زۆربەیان خۆی گوتەنی «چیرۆکلە» ن - لەم بڵاڤۆک و گۆڤارانەدا بڵاو بوونەتەوە: ئاویەر، سیروان، سروە، ڕەوت، ئاوێنە، تیشک، میراجی، کرمانج(بڵاوکراوەی قوتابیانی زانکۆی مەشهەد)، دیدگاە، چیا، کوردستانی نوێ و ئایەندە کە ئەم دوانەی ئاخری لە باشووری کوردستان دەردەچێ.

ئەم نووسەرە لەم چالاکییانەشدا بەشداییکردووە:

١ـ لە چەند خولدا ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەرایەتیی ئەنجومەنی فەرهانگی - ئەدەبیی مەریوان بووە و ئێستاش ئەندامی ئەو دەستەیەیە.

٢ـ ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری ڕەوت (گۆڤاری ئەنجومەنی فەرهەنگی - ئەدەبیی مەریوان).

٣ـ لە فستیڤاڵی چیرۆکی بانەدا بەشداریکردووە.

تا ئێستا (٢٠١١) چوار خولی فێرکاریی چیرۆکی لە ئەنجومەنی فەرهەنگی ـ ئەدەبیی مەریواندا بەڕێوە بردووە.

---

١. وتووێژ لە گەڵ نووسەر.

## فاتح ئەرژەنگی (تینوو)

ئەم شاعیرە ناوی فاتح ئەرژەنگیە و ناز ناوی «تینوو»ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە. ناوی باوکی شەریفە و لە گوندی «نێ»ی مەریوان لە ساڵی ١٩٧٣ی زایینی لە دایک بووە. قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی لە گوندی نێ تەواو کردووە و ساڵی ١٩٩١ دیپلۆمی بیرکاری(ریاضی) وەرگرتووە. ناوبراو لە ساڵی ١٩٨٩ بە دواوە دەستی داوەتە نووسین. لە بواری ئەدەبیدا زۆرتر خەریکی شێعر(کلاسیک و نوێ) و بابەتی فەرهەنگییە. شێعرەکانی لە گۆڤارەکاندا بڵاو ئەکاتەوە. پێنج دەفتەری شێعری ئامادەی چاپە کە بریتین لە: ١ـ شنەی ئەوین.٢ـ شەپۆلەکانی زرێبار.٣ـ نێ نامە. ٤ـ شەمامە(بۆمندالان). ٥. شەوچەرە(تارۆز).

کاک فاتح بەهرەی خەت خۆشی و نیگارکێشی هەیە. ناوبراو سەر قاڵی وەرزێرییە و دانیشتووی گوندی «نێ»یە.

**«بەرەو مەیخانە»**

نامەکەت هات و بە جارێ، ڕوی نامەوە لە مەیخانە
ڕەسمی عابد هەروەهایە، کە عاشقی وەرچەرخانە

ماوەیەکی فەراوانە، چاوەڕوانی لوتفی تۆمە
شوکر ئەمجارە لوتفی تۆ، وێنەی مێهری کەریمانە

ئاخر تاوانی من چی بوو، دار و بەردیش کڕنۆش دەبەن
بۆ منی شێت و دێوانە، تەماشای گوڵ بۆ تاوانە؟

پۆلێ عاشق زۆر دەبینم، دێن و دەچن سەر مەست و گێژ
خۆزگەم بەوەی لە جامی تۆ، پڕی کردووە ئەو لێوانە

خوا نەخواسە بڵێی من بم؟ یاکو خەوە کە دەی بینم!
ساقی هاتووە و دەفەرمێ، زرە بێنە لەو پیالانە

لە سەر لوتکەی بەختەوەری، جامی ئەلەست لە بەر دەستم
ئەوەیە فەخر و شانازی، کە دەی بینم لەم ژیانە

که لێــوی دا له پیــاڵه‌ی ئــاڵ، چــاوی لێکنــاو به ئه‌ســپایی
فه‌رمــوی، ئــازادی، بنۆشــه «تینــوو» کــاتی ده‌م ده‌مــانه

**نگار محه‌ممه‌دی**

٢٢ ی دیسه‌مبری ساڵی١٩٧٣ی زایینـی له مه‌ریـوان چاوی به ژیان هه‌ڵێناوه. پێش ده‌ست پێکردنی قۆناغی سه‌ره‌تایی فێـری خوێنـدن و نووسـین به زمـانی زگمـاکی خـۆی ئه‌بـێ. قۆنـاغی سه‌ره‌تایی و ناوه‌ندی و به‌شـێ له دوا ناوه‌نـدی له گونـده‌کان و شــاری مه‌ریــوان و ئه‌وی تریــشی له ســنه ته‌واو کــردووه. له درێژه‌ی خوێندنیدا له به‌شی مامایی زانکۆی سنه وه‌رئه‌گیرێت و دوای ترمێک له سه‌ر خواستی خۆی وازی لێ دێنێت.

نووسراوه‌کانی محه‌ممه‌دی قازی کاریگه‌ری ته‌واوی له سه‌ر دائه‌نێ. ساڵی ١٩٩٤ بۆ درێژه‌دان به خوێندن له به‌شـی وه‌رگێڕانـی زمـانی فه‌ڕانسه‌یی زانکـۆدا به‌شـداری ده‌کات و له کۆلیجی زمانی زانکۆی فیرده‌وسی مه‌شهه‌د وه‌رده‌گرێت.

تام و چێژی په‌رتووکی منداڵان بۆ لای خۆیـانی ڕائه‌کێشن و تێـزی ته‌واو بـوونی خوێنـدنه‌که‌ی وه‌ك یه‌که‌م کـاری له سـه‌ر «دائـره‌المعـارف مـصور» بـۆ منـداڵان و مێرمنداڵان هه‌ڵ ئه‌بژێرێـت. دووهه‌م کـاری وه‌رگێڕانـی له سـه‌ر «مێـشه‌نگوێن» ته‌واو ده‌کـات که له چاپخـانه‌دا وون ئه‌بێـت. سێهه‌م و چـوارم کـاری دوو په‌رتـووکن بـۆ منداڵان له ژێـر نـاوی «بولـو خـرس کوچولـو» (به زمـانی فارسـی) و «خرتـۆڵ ورچه بچکــۆل». به وته‌ی خــۆی : «هه‌رجــار که خرتــۆڵ له ده‌ســتی منداڵانــدا ئه‌بیــنم نه‌هامه‌تییه‌کانم له بیر ئه‌چێته‌وه.»

**موختار هووشمه‌ند**

ڕۆژی ٢٥ی ئووتی ساڵی ١٩٧٣ ی زایینی له مه‌ریوان له دایك بووه و تـا ئێستاش که ٣٨ سـاڵ ته‌مه‌نه‌یه‌تـی هه‌ر له‌م شاره‌یه.

له به‌ر چه‌ند هۆیه‌ك نه‌یتوانیوه خوێنـدنی ئاکادیمیـك

تەجروبە بکات، بەڵام هەتا ئێستاش هەر بە تەمای چوون بۆ زانکۆیە و بیری لێ ئەکاتەوە.

باوکی پاڵنەرێکی سەردەمی منالی بووە بۆ گەیشتن بەو دنیایەی کە هەزاران ڕەنگی پێ ناساندووە. پاش تووش بوونی بە هێندێک کێشەی ناوادە و تێپەڕاندنی دەورانێکی پڕ کەند و کۆسپ، سەرەنجام ڕۆژێکی پاییزی ساڵی ١٩٩٤، بە ئەمری مامۆستایەکی هونەر یەکەم هێڵی بە سەر یەکەم کاغەز هێناوە و چەند مانگ پاشتر، کاتێک یەکێک لە هاوپۆلەکانی بە هۆی بە گوناە زانینی کێشانەوەی ڕوخساری مرۆڤ، ماڵئاوایی لێکردووە. زانیویەتی کە باوکی بە باشی پەروەردەی کردووە.

ساڵی ١٩٩٧ لە یەکەم خولی فێرکاریی هونەری فۆتۆگرافدا کە نوێنەرایەتی سینەمای جەوانی مەریوان بەڕێوەی بردووە، وەک هونەرمەندی هەڵبژێردراوە و بڕوانامەی دەرچوونی پێ بەخشراوە.

یەکێک بووە لە دامەزرێنەرانی «ئەنجومەنی هونەرە هزرییەکان»ی مەریوان. لە پاییزی ١٩٩٨ەوە تا ئێستا وەک بەرپرسی ئەو ئەنجومەنە و مامۆستای بەشی هێڵکاری، چالاکیی هەیە. جگە لەوەش بونیادنەر و سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی «ڤستیڤاڵی ناوچەیی هونەرە هزرییەکانی لاوانی ڕۆژئاوای ئێران» بووە کە تا ئێستا شەش جار بەڕێوە چووە.

بەشداری کردن لە چەندین فستیڤاڵ و پیشانگای هاوبەش، دانانی چەندین پێشانگاش بەتەنیا خۆی و ... و نووسینی بابەتگەلی هونەری، بەشێکی ترە لە هەوڵە هونەرییەکانی ئەم هونەرمەندە. موختار هوشمەند بە ڕازاندنەوەی دیکۆر و کێشانەوەی پۆستەر نەخشی برۆشۆر بەردەوام هاوکاری گرووپە شانۆکارەکان بووە.

**شانازییەکانی ئەم هونەرمەندە لە بواری هونەریدا:**

١ـ هەڵبژێردراوی کێبەرکێی وێنەکێشان بە پلەی سێهەم لە پارێزگای کوردستان ـ زستانی ١٩٩٩.

٢ـ هەڵبژێردرانی وەک کەسی یەکەمی داڕشتنی شانۆی فستیڤاڵی ناوچەیی ئەندیشەـ سنە ١٩٩٩ ( نمایش کنار شیر آتش نشانی ).

٣ـ وەرگرتنی دیپلۆمی فەخری و بە دەستهێنانی پلەی یەکەمی داڕشتنی شانۆ و نەخشی برۆشۆر لە سێزدەهەمین فستیڤاڵی شانۆی پارێزگای کوردستان، ساڵی ٢٠٠١ (نمایش آوار).

٤ـ وەرگرتنی دیپلۆمی فەخری و بە دەستهێنانی پلەی یەکەمی دارشتنی شانۆ و پلەی دووهەمی نەخشی برۆشۆر لە سێهەمین فستیڤاڵی شانۆی کوردی، سەقز ـ ساڵی ٢٠٠٢ (شانۆی ژانی ژن).

٥ـ پلەی دووهەمی ڕازاندنەوەی دیکۆر و نەخشی برۆشۆری شانزدەهەمین فستیڤاڵی شانۆی پارێزگای کوردستان، ساڵی٢٠٠٤ ( نمایش نقش زن ).

٦ـ هەڵبژێردراوی یەکەمی ڕازاندنەوەی دیکۆر و نەخشی برۆشۆر لە هەشتەمین فستیڤاڵی شانۆی سلێمانیدا، بەهاری ٢٠٠١.

**ـ هەوڵەکانی ئەم هونەرمەندە لە بواری نووسیندا :**

١ـ نووسینی وتاری هونەری و کۆمەڵایەتی لە حەوتەنامە و گۆڤارەکانی سیروان، ئاسۆ و چیا (گۆڤاری کوردی خوێندکارانی زانکۆی ئیسفەهان)دا.

**ئەمجەد مەلایی**

ساڵی ١٩٧٤ی زایینی لە گوندی جانەوەرە چاوی بە ژیانێکی پڕ مەینەت هەڵێناوە. باوکی وەستا شەریف و دایکی خاتوو جەهان بووە. بنەماڵەی لە «تووار مەلا»وە هاتوونەتە جانەوەرە و باوکی بە بەناییەوە سەرقاڵ بووە. ئەمجەد هێشتا کۆرپەڵەیەکی شیرەخۆرە ئەبێ کە مۆمی ژیانی دایکی ئەکوژێتەوە و لە تەمەنی دوو ساڵیشیدا بە هۆی داڕووخانی دیوارەوە باوکی ماڵئاوایی لە ژیان ئەکات. ئەرکی بەخێو کردنی ئەم منداڵە دوو ساڵە ئەکەوێتە ئەستۆی خاتوو پیرۆزی دایەگەورە و حاجی حەبیبی باوەگەورەیەوە. دوای چوار ساڵ خوێندنی سەرەتایی باڵی ڕەشی هەژاری و کەمتەرخەمی خۆی بە سەریدا ئەکێشێت و لە بەر بێ پشتیوانی قوتابخانە بە جێدێڵێت. دواتر بەهرەکانی وەدەر ئەکەوێت. پەیکەر تاشی، نیگارکێشی، خەت خۆشی، شانۆگەری، تەڕدەستی و لە گەڵ ئەمانەشدا لە نووسینی شێعر و چیرۆکدا دەستی هەبووە. بۆ بژێوی ژیانی ڕوو لە شارەکانی تری ئێران دەکات و بە کرێکاری و سەرتاشی و ڕادیۆ سازی ژیان ئەباتە سەر. ئازار و ناسۆرەکانی ژیانی خۆی و کۆمەڵگای کوردی بە شێعر هۆنیوەتەوە و نازناوی شێعری «کۆڵنەدەر»ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە.

کۆڵنەدەر ساڵی ١٩٩٥ هەواری ژیانی بۆ کوردستانی باشوور ئەگوێزێتەوە و ساڵی ١٩٩٨ لە کارەساتێکی دڵتەزێندا ماڵ ئاوایی لە شێعر و نووسین و هونەر دەکات.

### «کۆڵنەدەر و گۆڕستانی شاری مەریوان»[1]

ئەمن کۆڵنەدەر ئەڵێم کۆڵ نادەم
بەرانبەر بە گۆڕ ئەژنۆ دائەدەم

لە بۆ مەرگی کوڕێکی نەوجوان
ڕۆشتمە گۆڕسان شاری مەریوان

دەمنواڕی بۆ سەر هەر کێل و گۆڕێ
مردووە و نووسراوە جوانێ بە جۆرێ

یەکێ نووسرابوو نەوجوانی وڵات!
بۆ چی دڵی تۆ نەگەشت بە ئاوات؟

یەکێ نووسرابوو کیژۆڵەی نازدار
لە بۆردماندا کرای لەت و پار

یەکێ نووسرابوو سەلاحی هەتیو
هەتیوی خۆشی لە دنیا نەدیو

دوو چاوی ڕەشی من هاتە گرین
لەو گۆڕستانە کردمە گریە و شین

چوومە سەر گۆڕی نەنکی هەژارم
وتم هاودەمم، تەنیا هاویارم

بۆچی تەرکت کرد خوێش و دیارم
ئەی خۆشی نەدیو، نەنکی هەژارم

خەڵکی نەنکی من لەوێ نێژراوە
جەفای زەمانەی بە منۆ کێشاوە

گەلێ عاجز بووم لە دەس گۆڕستان
وتم ئەی برسی بۆ لاشەی ئینسان

لە گوێمدا دەنگێ ئەزرنگایەوە
نەنکم وەڵامی ئەمنی دایەوە

کوتی کۆڵنەدەر کوڕی هەژارم
ئەی ژیان تاڵی ڕووی ڕۆژگارم

دایک و باوکی خۆت تۆ بە چاو نەدی
من هەرچی ئەڵێم ئەبێ گوێ بگری

ڕۆڵەگیان دنیا یەکجار فانی یە
ئەم گۆڕستانە ئاوەدانی یە

کۆڵنەدەر هەتا ساحێب ژیانی
چاکەکە کوڕم هەتا ئەتوانی

لە نێو خەڵکیدا کوڕێکی چاک بە
ڕۆڵە بۆ ژێر پێی هەموو کەس خاک بە

ئەگەر وا نەبێ یاخوا کۆڵنەدەر
حەرام بێ لە تۆ شیرم سەرانسەر

وتم خوا حافیز نەنکی هەژارم
لە سەر ڕاوێژت هەر بەرقەرارم

تۆ بە هیوابە بەڵام نەنکەگیان
ئەمرم و پێکۆ ئەبین بە هاوژیان

ئەی گۆڕستانی جوان و خۆش نما
ئاخرین خانووی ژیانی دنیا

---

١. شریتی ئەم شێعرەی شاعیر، قوتابی خۆشەویست «بەرزان داردان» دەسی خستم کە جێگای ڕێز و پێزانینە.

له خۆ دەرنەچی کۆنەی کۆنه ساڵ هیچ شاعیرێ تۆی نایەته خەیاڵ
ئەگەر کۆڵنەدەر بردی ناوی تۆ یادی لاوانی وەتەن ئەکاتۆ
خوا حافیز بێ له تۆ گۆڕستان دڵی من ئەتۆ هێناته گریان

## ئەنوەر هوژەبری

ئەنوەر هوژەبری، مانگی ٣ ی ساڵی ١٩٧٤ ی زایینی له گوندی «کانی میران» چاوی به ژیان هەڵێناوه. باوکی «عەلی» و دایکی «مەحبووبه» خاتوونه. قۆناغەکانی خوێندنی تا وەرگرتنی دیپلۆم له مەریوان درێژه پێداوه. ساڵی ١٩٩٠ پێوەندی به ئەنجومەنی ئەدەبیی مەریوانەوه گرتووه و بۆته ئەندامی ئاسایی. تا ساڵی ١٩٩٦ ئەندامی ئاسایی ئەنجومەن بووه و له کۆڕ و کۆنفرانس و کۆنگره جۆراوجۆره ئەدەبییەکانی ئەنجومەندا بەشدار بووه. ساڵی ١٩٩٧ بۆته ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری ئەنجومەنی فەرهەنگی ئەدەبی مەریوان و ١٩٩٨ بۆ ماوەی دووساڵ بەرپرسی ئەو ئەنجومەنه بووه. له بواری ڕەخنەی ئەدەبی له سەر چیرۆک و شێعرکاری کردووه. له هەفتەنامەکانی سیروان، تیشک، شێعرستان (سلێمانی)، ڕاڤه و نڤیسادا وتاری ئەدەبی و فیکری بڵاو کردۆتەوه. یەکێک له ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەری ناوەندیی فیکریی ڕۆنان بووه له مەریوان. ساڵی ٢٠٠١ ژیانی هاوبەشی پێکهێناوه و ئێستاش سەرقاڵه بەکاری ڕۆژنامەوانی و مێدیای کوردییەوه.

نامناسمەوه
چاو له بێ ڕێیی دورگه و
له بازنەی سەبرترین نامۆیی
ئای له خنکاوترین سەبری دەریا
بپێی پڕ به ژانێک ژیابین ئاوانه و
بهێڤین سەبرانه، نەخنکاو و ڕەوەکی؟
یان نا،
مەرجه سەرمان مشتێ وەهمه

سەرمان پزیسکێک بپچڕێن بلەز
بلەزتر گوێلێک ژیان وەهمیوە توند
ئاخ مانیا!
ڕەهێڵ بوونمانە ئەگەر،
ڕەوا تاکێ؟
ڕەوینەوەمان ڕایەڵبوونە بەرەوچی؟

## ئیبراهیم مینوویی

ئیبراهیم مینوویی، کوڕی ساڵح، ساڵی ١٩٧٤ ی زایینی لە مەریوان چاوی بە ژیان هەڵێناوە. تا وەرگرتنی دیپلۆم لە شاری مەریوان خوێندوویەتی. لە بواری عومران و ئاوەدانیدا لە زانکۆی «ئازادی سنە» بڕوانامەی ئەندازیاری وەگرتووە.

**ناسنامەی فەرهەنگی ئەم نووسەرە:**

١ـ ئەندامی ئەنجومەنی فەرهەنگی ئەدەبی مەریوان (٢ساڵ وەک دەستەی بەڕێوەبەر).

٢ـ ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری «دەق».

٣ـ نووسین و خوێندنەوەی چەندین وتار و ڕەخنەی ئەدەبی لە کۆڕ و کۆبونەوەکان وەک: کۆنگرەی نالی لە سەقز و یکەمین کۆنگرەی شێعری کوردی لە زانکۆی مەشەد.

٤ـ لە گەڵ حەوتەنامەکانی سیروان، ڕۆژهەڵات و گۆڤارەکانی باشوری کوردستان بە نووسین هاوکاری کردووە.

## ڕەحمان هوشیاری

ساڵی ١٩٧٤ی زایینی لە شاری مەریوان چاوی بە ژیان هەڵێناوە. باوکی «تایەر» و دایکی «پیرۆزە»یە. خوێندنی سەرەتایی تا وەرگرتنی دیپلۆم لە مەریوان تەواوکردووە. ساڵی ١٩٩٤ لە زانکۆی ڕەشت وەرئەگیرێت و بەکالۆریۆسی لە بەشی پیشەسازی

تەواو کردووە . ئەم نووسەرە یەکێکە لە شانۆکارانی چالاکی مەریوان و لە کارنامە هونەرییەکەیدا ئەتوانین ئاماژە بەم مژارانەی خوارەوە بکەین:

۱ـ ئەندامی بەڕێوبەری ئەنجومەنی شانۆی شارەکانی مەریوان و کرماشان.

۲ـ لە دامەزێنەرانی فستیڤاڵی شانۆی سەرشەقامی مەریوانە و لە سێ فستیڤاڵی ئەم شانۆیەدا بەڕێوەبەری ڕێوڕەسمی کۆتایی بووە.

۳ـ بەرپرسی دەبیرخانەی شەشەمین فستیڤاڵی شانۆی زانکۆکانی پەییام نووری سەرانسەری ئێران (کرماشان ۲۰۱۰).

۴ـ تا ئێستا وەکوو دەرهێنەر شانزە شانۆی پێشکەش کردووە و لە زیاتر لە دە شانۆدا وەکوو ئەکتەر دەوری گێڕاوە.

**ئەم شانۆنامانەی خوارەوە بەرهەمەکانی هونەرمەندن لە بواری نووسیندا:**

۱ـ دەنگەکانی شەو،۱۹۹۹. ۲ـ تیرۆریست بازی، ۲۰۰۰. ۳ـ دەنگی سەگ لە دوورەوە، ۲۰۰۱ . ۴ـ مانگ لە تەنیاییدا ئەمرێت، ۲۰۰۲. ۵ـ سەگ و تفەنگ،۲۰۰۳.

۶ـ سێ بیرکردنەوە لەسەر مەرگ،۲۰۰۴. ۷ـ چوارچێوەی خوێندنەوەی ئەسپێک، ۲۰۰۴. ۸ـ دوانانەوە، ۲۰۰۴. ۹ـ گۆرانی با، ۲۰۰۴. ۱۰ـ خەونە ناخۆشەکانی ئاسنگەرێک، ۲۰۰۵. ۱۱ـ ژیان و چەند کێشەی بە ڕەواڵەت بچووک، ۲۰۰۵. ۱۲ـ کێ بیری لێ نەکردەوە، ۲۰۰۶. ۱۳ـ دەرباز بوون، ۲۰۰۸. ۱۴ـ تاریکییەکان بکوژێننەوە، ۲۰۰۸. ۱۵ـ بێستوون بانگم بکە، ۲۰۰۸. ۱۶ـ ژنێکی تازە، ۲۰۰۸. ۱۷ـ لەم هەموو هاوارە، ۲۰۱۰. ۱۸ـ پرسەی ئاشقانی پیر، ۲۰۱۰.

**فەرید نیکخا**

ناوی باوکی محەممەد و دایکی بەیخان خاتوونە. ساڵی ۱۹۷۴ی زایینی لە مەریوان لە دایک بووە. لە سەرەتاوە تا کۆتایی دواناوەندی لە شاری مەریوان خوێندوویەتی.

جموجۆڵی هونەری وەک نووسەر و دەرهێنەر و ئەکتەر لە ساڵی ۱۹۸۴ لە کاتی شەڕی نێوان ئێراق و ئێراندا بە بینینی شانۆیەک کە ئەبێت بە هاندەری، دەست پێئەکات. بە نووسینی سناریۆی چەندین

فیلمی کورتی دکۆمێنتاری وەک: مهر، قاپ بسته ی من، بی دە نگی،سنوور، مشقهایم رانوشته ام، چراغ قرمز، میم مثل معلم، مرگ در گدانها ریشه کرده، پیمانه ی اشک، ایست بانک، پیراهن سفید، آنجا که ماهی ها، بم۱۲ثانیه، خواب بادهای زرد، پیکرتراش، دێوەزناو، وه زان، روزهای بی تقویم، دریاچه ی خاموش، نشانه، پرواز را به خاطر بسپار، گەزۆ، پنجه های ارغوانی، زندگی باید کرد، ژنانی هه ورامان، سەفەری کۆتاییەکان، آوازهای فولکلور، صنایع دستی اورامان، شاید دیر برگردم، مسافر، رویاهای کودکی، روزهای بی تقویم، صبر ایوب، آهسته قدم بردار، فیلم سینمایی مریوان ترمینال هوایی و ...

بەڕێوەبردنی چەندین پێشانگای وێنە، کۆکردنەوەی وێنەکانی بۆردمانی مەریوان که ئامادەی چاپ و بڵاوبوونەوەیە لە چالاکییەکانی ئەم هونەرمەندەن.

### کافیه جەوانڕوودی

لە بەر هەندێ هۆ چەند دێڕێک لە سەر ئیجازەی خۆی لائەبەم و پێناسەی ئەم نووسەرە لە زاری پێنووسەکەی خۆیەوە ئەکەم :

لە وەرزی زستانی ساڵی ۱۹۷۴ ی زایینی لە مەریوان لە دایک بووم. لە بیرم نییە هەر بە منداڵی چۆن نیشانم داوە که تامەزرۆی خوێندنەوەم! که بووم بە پێنج سال باوکم دەستی گرتم و بە پارتی لە پۆلی یەکەمی سەرەتایی ناوی نووسیم. ساڵی ۱۹۷۹ کۆچ ئەکەین بۆ عیراق و لە هاوینی ۱۹۸۱ دا ئەگەڕێینەوە بۆ مەریوان. ساڵەکانی سەرەتایی و ناوەندی لە کاتی شەڕی ئێران و ئێراق لە مەریوان و سنە و دەرەتفێ و سەولاوا درێژەم بە خوێندن داوە. هەر لەو ساڵانەدا بە زۆری ڕووم کردۆتە خویندنەوەی کتێب، بەتایبەت شێعر و چیرۆک.

لەو ساڵە پڕ لە چەرمەسەری و ئاوارەیی و نەداریانەدا ماڵی ئێمە پڕ بوو لە کتێب و شێعر و سیاسەت و وتوویژ. باوکم فێری دیموکراسی و پلۆڕالیزمی کردین. دوانزده کەس بووین بە دوانزده جۆری بیر کردنەوە. کچ و کوڕ، ژن و پیاو فەرقی نەبوو هەرکەس لێزانتر بوایە زۆرتر شانازی پێوە ئەکرد.

دوای کۆتایی هاتنی شەڕ و گەڕانەوەمان بۆ مەریوان لە ساڵی ١٩٨٨ دەستم کرد بە نووسینی چیرۆک. بووم بە ئەندامی «کانوونی نووسەرانی» ئیدارەی پەروەردە و لە ساڵی ١٩٩٠ بە دامەزراندنی ئەنجومەنی ئەدەبی مەریوان دەستم کرد بە نووسینی کوردی. چەن چیرۆکم لە سروە و زرێبار چاپ بوون.

ساڵی ١٩٩٢ کۆبوونەوەی ئەندامانی لێکۆڵەری بەرهەمەکانی «سمیناری ئه دەبی ڕێبەندان»ی مەریوان بە بۆنەی نەخۆشینی باوکمەوە ــ چەن ڕۆژ بوو بە هۆی شێرپەنجەوە عەمەلی کردبوو ـ شەو لە ماڵی ئیمەدا بەڕێوە چوو. منیش چیرۆکێکم خوێندەوە! چیرۆکی کەسێ بوو، لە پشت دەلاقەی کۆڵیتەکەی چاوی بڕیبوە مانگ‌گیران و گوێی لە زرمەی پێی ئەسپ سوارانی ئاسایش بوو کە بۆ دەسگیر کردنی ئەو تا دەهات نزیکتر ئەبوونەوە ...

لە کاتی خوێندنەوەی چیرۆکەکەم دەنگم کز و نزم بوو، باوکم وتی: «کچی من نیت ئەگەر ئەوەی ئەتەوێ بیڵێیت بە دەنگی بەرز هاواری نەکەیت.»

شەوی دواتر کە باوکم هێشتا دەستی بە سرۆمێکەوە بوو هەشت نۆ نەفەر لە ... خۆیان کرد بە ماڵا و ژێر باڵیان گرت و بردیان و لە ٢٢ی ئاوریلی١٩٩٣ تەرمەکەیان بۆ ناردینەوە. وەسیەتەکەی دوو بەیت شێعر بوو کە دوور لە چاوی ئەوان لە سەر چەسپێکی کاغەزی نووسیبوی و چەسپاندبووی بەژێر باڵیا. هەر ئەو ساڵە لە «ناوەندی پەروەردە و بارهێنانی مامۆستایان» لە سنە زمانی ئینگلیزی قەبووڵ بووم. بەڵام دوای کۆتایی هێنانی دەورەی دوو ساڵەی ئەو ناوەندە لە ساڵی ١٩٩٥ لەوێ دەرکرام!

دیسانەوە کنکور، ساڵی ١٩٩٦ بۆخوێندنی زمان و ئەدەبیاتی فەڕەنسی بۆماوەی چوار ساڵ چووم بۆ زانستگای تاران. ساڵی ٢٠٠٠ «سەحرا» (تاران نەشری ئیحسان ٢٠٠١)، ڕۆمانی نووسەری فەڕەنسی «لۆکلزیو» و ساڵی دواتر « مۆندۆوچیرۆکەکانی تری» هەمان نووسەرم وەرگێڕایەوە سەر زمانی کوردی (سلێمانی، سەردەم: ٢٠٠٣) لۆکلزیو ساڵی ٢٠٠٨ خەڵاتی ئەدەبی نۆبلی وەرگرت.

دواتریش دوو کتێبی تر، کە هێشتا چاپ نەبوون. بەتەمام کتێبێکی‌ترم دەس کەوێ وەری گێڕمەوە و... حەزم لە مۆسیقا و کتێب و فیلم و سەفەرە و لەوانەیە لە داهاتوودا دیسانەوە بنووسم...

## کاوه موعین فەر

کاوه ساڵی ١٩٧٤ی زایینی لە مەریوان لە دایک بووه و ئێستاکەش دانیشتووی مەریوانە. ناوبراو یەکێ لە چالاکانی فەرهەنگی و هونەرییە و بە وتەی خۆی لە بواری هونەریدا کەس هاندەری نەبووه و تەنیا حەز و خواستی خۆی پاڵنەری بووه[١].

**چالاکییە فەرهەنگی و هونەرییەکان:**

١ـ دامەزراندنی گرووپی هەڵپەڕکێی کوردی، مەریوان ١٩٩٨.

٢ـ یاریدەدەری دەرهێنەر، سەمیرا مەخمەڵباف لە فیلمی سینەمایی «تەختەڕەش»دا، ١٩٩٩.

٣ـ یاریدەدەری دەرهێنەر، بەهمەن قوبادی لە فیلمی سینەمایی «کاتێ بۆ مەستی ئەسپەکان»دا، ١٩٩٩.

٤ـ یاریدەدەری دەرهێنەر، فەرهاد مێهران فەڕ لە فیلمی سینەمایی «چریکەی هەورام»دا، ١٩٩٩.

٥ـ دەرهێنەری فیلمی « نیوەی بەرزی گریان و پێکەنین»، ٢٠٠٠.

٦ـ یاریدەدەری دەرهێنەر، موحسن مەخمەڵباف لە فیلمی سینەمایی « سەفەری قەندەهار»، ٢٠٠٠.

٧ـ یاریدەدەری دەرهێنەر، سەمیرا مەخمەڵباف لە فیلمی سینەمایی «پێنجی عەسر»دا، ٢٠٠٢.

٨ـ یاریدەری دەرهێنەر، سەدیق بەرمەک لە فیلمی سینەمایی «ئوسامە«دا، ٢٠٠٢.

٩ـ یاریدەری دەرهێنەر، مەرزیە مشکینی لە فیلمی سینەمایی «سەگە خوێڕییەکان»دا، ٢٠٠٣.

١٠ـ یاریدەری دەرهێنەر، موحسن مەخمەڵباف لە فیلمی سینەمایی «سیکس و فەلسەفە»دا، ٢٠٠٤.

١١ـ لێکۆڵینەوەیەک لە سەر هەڵپەڕکێی کوردەکانی ئێران، ٢٠٠٥.

١٢ـ نووسەر، ئامادەکار و دەرهێنەری فیلمی کۆمەڵی شایی ( لە سەر هەڵپەڕکێی

---

١. کورت نووسینی ژیانی ئەم بەڕێزە لە سەر خواستی خۆی بووە.

کوردەکانی ئێران)، بۆ تەلەفزیۆنی کوردسات٢٠٠٦ ـ ٢٠٠٨.

**مامۆستا مادح مرادی**

کوڕی ئەحمەد کوڕی سۆفی محەمەد و دایکی ڕابێعە خاتوونە. ساڵی ١٩٧٤ی زایینی لە گوندی «بڵبەر» لە ناوچەی هەورامان لە بنەماڵەیەکی ئایینی و دەست کورت چاوی بە ژیان هەڵێناوە.

لە خزمەت خاڵۆ فەتاح و مامۆستا سەید تەهای کوڕی سەید عەبدوڵڵای بڵبەریدا قورئانی خوێندووە. بۆ درێژدان بە خوێندن ئاواییەکانی «کەلجی» سەر بەناوچەی هەورامانی تەخت، «داریان» سەربەناوچەی پاوە و «کەڵەکان» سەر بە شاری سنە، «تخان» سەر بە ناوچەی سەوڵاوا و دووڕۆ و دەرەکێ گەڕاوە. لە خزمەت مامۆستایان مەلا محەمەد ئادوایی، مەلا سەید ئەحمەدی پێش نوێژی خانقای دووڕۆدا دەرسی خوێندوە و لە سەر دەستی مەلا عەبدولخالقی دزاوەریدا ئیجازەی مامۆستایەتی وەرگرتووە.

دوای ئیجازە وەرگرتن ماوەیەك لە زێدەکەی خۆی، بڵبەر، ئەمێنێتەوە و دواتر هەواری ژیان بۆ گوندی «سەڵوات ئاوا»ی سنە ئەگوێزێتەوە و ئەبێ بە مامۆستا و پێش نوێژی مزگەوتی جامێعای ئەو گوندە.

ئەم مامۆستایە، وێڕای خزمەت ئایینی لە بواری شێعریشدا چالاکە و کۆمەڵە شێعرێکی لە ژێر ناوی «گەوهەری سیروان» لە ژێر چاپدایە و نازناوی شێعر «مادح»ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە.

ئەم شاعیرە سەبارەت بە هاتنی بۆ دنیای شێعر و هەڵبەستەوە ئەڵێت: «عەلاقە و خۆشەویستییەك کە بە دیوانی شاعیرانی کورد وەکوو مەولەوی و وەفائی و بێسارانی بووم، بوو بە هۆی ئەوەی کە ڕوو لە دنیای شێعر و شاعیری بکەم و خۆم لەو گۆڕەپانە بەر بڵاوەدا تاقی بکەمەوە».[1]

---

١. وتو وێژ لەگەڵ نووسەر.

**«کەبکی کام کۆسار»؟**

کەبکـــی کـــام کۆســـار؟ غەزاڵـــی کـــام بەڕ؟
گـــوڵی کـــام گـــوڵزار؟ کـــام نەمـــامی تەڕ؟
وەنەوشـــەی کـــام جـــۆ؟ ڕێحـــانی کـــام بـــاخ؟
ســـەرمایەی کـــام شـــا؟ چراخـــی کـــام کـــاخ؟
قـــومری کـــام چەمەن؟ ســـەیرەی کـــام نـــسار؟
بە نـــاز پەروەردەی کـــام دێهـــات و شـــار؟
شـــەوبۆی کـــام بنـــار؟ چنـــووری کـــام شـــاخ؟
چەن کەست چون من کوشت بە ئاخ و داخ؟
نەرگـــسی کـــام جـــاڕ؟ گـــۆڕاڵەی کـــام کـــۆ؟
جە کـــــام وەڵاتەن بەژن و بـــــاڵای تـــــۆ؟
تـــــۆ جە کـــــۆ ئامـــــای؟ عەیـــــاری ڕازەن!
ئەر خانـــــای بەی تەور دڵ نە ســـــەرای تەن
شـــــازادەی کـــــام شـــــار جە کـــــام ئیقلیمـــــی؟
کـــــام قەســـــر و ئەیـــــوان بە نـــــاز مـــــوقیمی؟
باڵاخـــــــانەی تـــــــۆ جە کـــــــام وەڵاتەن؟
چەن کەس قەڵغـــــــــــــانی قەزاو بەڵاتەن؟
چـــــن جـــــوان هەر ڕۆ ســـــاداری نـــــازت؟
شـــــکاری خەنـــــجەر دوو دیـــــدەی بـــــازت؟
چـــــن «مـــــادح» خەریـــــك مەدحـــــی بـــــاڵاتەن؟
تەوســـــیفی شـــــان و شـــــەدە و کـــــاڵاتەن؟
تـــــۆ جە کـــــۆ ئامـــــای ڕازەنـــــی خـــــۆتەن؟
ئەر خانـــــای بەی تەور دڵ نەســـــــەراتەن

## موختار محەممەدی

موختار محەممەدی کوڕی ئەحمەد و دایکی «ئافتاو خاتوون»ە. ساڵی ١٩٧٤ی زایینی لە بنەماڵەیەکی هەژار و دەس کورت لە گوندی «بالک» چاوی بە دنیا هەڵێناه. خوێندنی سەرەتایی هەر لە قوتابخانە تەختەڕەش لەکۆڵگرتووەکەی، لەم دارستان و ئەو گۆڕستاندا، لە ژێر گوللەباران و شریخەی تەیارەدا بردۆتە سەر. دواتر دێتە شاری مەریوان و خوێندنی ناوەندی و دواناوەندی تەواو کردووە. لە هەشتاکانی زایینیدا ڕووی هێناوەتە نووسین و ئەدەب و هونەر و لە بەشی شانۆدا وەک نووسەر و ئەکتەر و دەرهێنەر، خەریکی خزمەت بە هونەر و ئەدەبی گەلەکەیەتی. پتر لە ٥٠ خەلاتی بەرزی شانۆیی وەدەست هێناوە و خاوەنی پتر لە ٢٥ شانۆنامەی سەحنەیی و ٥٠ شانۆنامەی سەرشەقامە. لە ٢٠٠٢ بەم لاوە، لە فستیڤاڵی نێونەتەوەیی فەجردا لە تاران، وەکوو ئەکتەر و نووسەر و دەرهێنەر بەشدار بووە.

ژانی ژن، شەولەبان، پەیکەری بێسەری باوکم، ئەنفال، تاراوگەی دەستەکان، سەفەری من و سەمای درگاکان، دارجامانە و ....لە شانۆنامەکانی موختار محەممەدین.

## نووری بەراری

لە بەهاری ساڵی ١٩٧٤ی زایینی لە مەریوان لە بنەماڵەیەکی فەرهەنگی چاوی بە دنیا هەڵێناوە. قۆناغی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە ئاوارەیی و دەربەدەری لە نێو جەرگەی شەڕی ئێران وئێراق لە نێو دەوار و ماڵە قوڕینەکانی گوندەکانی سەرنژمار، زەکریان، نەنە و سەولاوا و دوا ناوەندیش لە مەریوان تەواو ئەکات.

حەز و ئەوینی خزمەت بە منداڵانی هۆزەکەی وەک باوک و سێ برای تری هانی ئەدات کە لە ناوەندی بارهێنانی مامۆستایانی شاری سنە تا وەرگرتنی بڕوانامەی مامۆستایەتی (فەوق دیپلۆم) لە بەشی زانستە ئەزموونییەکاندا درێژە بە خوێندن بدات. ساڵی ١٩٩٢ ئەبێ بە مامۆستای گوندەکانی دەور و بەری مەریوان. هاوکات لە گەڵ

ئەرکی مامۆستایەتی درێژە بە خوێندن ئەدات و ساڵی ١٩٩٩ لە ناوەندی خوارەزمی سنە بڕوانامەی بەکالۆریۆس وەرئەگرێت.

دڵەڕاوکێ و پەرۆشی بۆ قووتابییەکانی وای لێ ئەکات کە شێوازی وانە وتنەوە بۆ باشتر فێر بوون بە شێوازی هاوچەرخ بگۆڕێ. هەر بەم بۆنەوە لە دوای تاقیکرنەوەیەکی زۆر ئەتوانێ شێوازی دڵخواز و کارامەی پەیدا بکات.

ئاکامی ڕەنج و تێکۆشانی چەند ساڵەی لەم بووارەدا پەرتووکێکە لە ژێر ناوی «٥٠ آزمایش سادەی علوم راهنمایی» (٥٠ تاقیکرنەوەی ساکاری زانستیی قۆناغی ناوەندیی) کە پێشکەشی منداڵانی

### حامد بەهرامی

حامید بەهرامی، کوڕی ئەحمەد بەهرامی شاعیر، لە دایك بووی ساڵی ١٩٧٥ ی زایینی لە گوندی ساداوای مەریوانە. لە ساڵانی شەڕ و ئاوارەیی و دێهاتەودێهاتدا قۆناغی سەرەتایی، ناوەندی و دواناوەندی تەواو ئەکات. ساڵی ١٩٩٤ لە زانکۆی کوردستاندا بۆ بەشی ئەدەبیاتی فارسی وەرگیرا و لە ١٩٩٧دا بوو بە مامۆستای قوتابخانەکانی دواناوەندی مەریوان. ئێستاش خەریکی خوێندنی ماستەری زماناسییە. لە بۆن و بەرامەی وشە و شێعر و ئەدەبی کوردیدا کە بە سەر کەش و هەوای ماڵەکەیاندا زاڵ بوو، کەوتە گڕوگاڵ و چاوی بە سەر وشەی کوردیدا کرایەوە.

بە هۆی کارەکانی باوکیەوە، ڕووی کردووەتە ئەدەبیاتی کوردی و هەر لە سەرەتاییەوە بە سەر نووسین و خوێندنەوەی کوردیدا زاڵ بوو. لە ١٩٩٢دا، واتە ساڵی یەکەمی دواناوەندی، یەکەمین بەرهەمی شێعری خۆی لە کۆڕێکی مەریواندا خوێندەوەو هەر لەو کاتەوە دڵی بە دونیای خەیاڵاوی ئەدەبیاتەوە بەست.

ساڵی٢٠٠٢ پاش ئامادە کردنی شێعرەکانی خاتوو مەستورەی خوسرەوانی بە ناو «فرمێسکی کانیاو»، یەکەمین بەرهەمی وەرگێڕاوی خۆی بە ناوی

«ساختارسیاسی‌اسلام وتعدد احزاب [١]» بڵاو کردەوە. دواتریش «سرافرازی در ازدواج» و «زن در ئاینەی حقیقت»ی بڵاو کردەوە و پاشان کتێبی «سلامی با کردستان»ی نووسی.

لە بەشی ئەدەبیاتی منداڵاندایشدا چەندین بەرهەمی وەك «چیرۆکی قومری و دارفرۆشی هەژار»، «چیرۆکی هەتاو و ڕەشەبا»، «دەرسێ بۆ چۆلەکە»، «تەفرەقە»، «بەبری جەوان ومرۆڤی پیر»، «ئەستێرەکانی سلاو» و «بیخوێنە و بیچەرخێنە، بیبینە»ی بڵاوکردۆتەوە.

## مێهدی خووندڵ

مێهدی خووندڵ لە ٦ ی ئاوریلی ساڵی ١٩٧٥ ی زایینی لە گوندی «ڕووار» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. باوکی توفێق و دایکی خۆرشید خاتوونە.

یەکەم ڕۆژەکانی دارە دارەی خوێندنی لە قوتابخانەی زێدەکەی خۆی دەست پێئەکات و تا تەواو کردنی قۆناغی سەرەتایی هەر لەوێ بووە. بە هۆی بارودۆخی تایبەتی ئەو سەردەمەی کوردستان، ئەو گوندە بە جێ دێڵن و لە مەریوان ئەگرسێنەوە. قۆناغەکانی خوێندنی ناوەندنی و دواناوەندی لەم شارە تەواو ئەکات.

بۆ یەکەم جار لە پۆلی پێنجەمی سەرەتاییدا دوای ئاشنا بوون لە گەڵ دیوانی شاعیرانی کورد، وەك: مەولەوی و سەیدی و بێکەس و قانع، خامەی پێنووسی وەك هەست دەڕژێتە سەر پانتای پەڕاو. هاتن بۆ مەریوان و ئاشنا بوون لە گەڵ ئەنجوومەنی ئەدەبیدا ئەبێ بە هاندەرێکی زۆر چاك و ئەمیش بە شاعیرێکی سوار چاك. هاتوچۆ و هاوکاری لە گەڵ ئەنجومەن درێژەی ئەبێ و بۆ سێ خول وەك دەستەی بەڕێوەبەری ئەنجومەن هەڵی ئەبژێرن. لەو ماوەیەدا چەندین کۆڕ و کۆنگرەی جۆراوجۆر وەك کۆنگرەی بێسارانی و قانع و ناری و... بە ڕێوە ئەبرێت و دوو ژومارە لە گۆڤاری «ڕەوت» دەرئەچێ.

---

١. پێکهاتەی ڕامیاری ئیسلام و فرەحیزبی.

ئەم نووسەرە لە دوای کز بوونی چالاکی ئەنجومەنەکان لەو سەردەمەدا هاوکاری خۆی لە گەڵ گۆڤار و حەوتەنامە کوردییەکاندا وەک: سروە، زرێبار، سیروان، میراجی، ئاینده درێژە پێ ئەدات. نووسینەکانی لە شێعرەوە بۆ وەرگێڕان ئەگوێزێتەوە و لە بواری وەرگێڕان دەست بە کار ئەبێت.

**کارنامەی فەرهەنگی ئەم نووسەرە لە بواری وەرگێڕاندا:**

**چاپکراو:**

١ـ مێژووی ئەندێشەی سیاسی، نووسینی دوکتور کەماڵ پوولادی، لە سێ بەرگدا، دەزگای وەرگێڕان هەولێر٢٠٠٨.

٢ـ شەپۆلی چوارەم، کۆمەڵە وتاری ڕامین جیهانبەگلوو، دەزگای چاپ و پەخشی موکریانی، هەولێر٢٠١٠.

٣ـ ماکیاڤیلی و ئەندێشەی ڕێنسانس، ڕامین جیهانبەگلوو، مەکتەبی ڕێکخراوە دیموکراتیەکان، سلێمانی٢٠٠٨.

ئامادەی چاپ:

١ـ شۆڕشی شکۆمەند، نووسینی کلاریس سۆیشێر. ٢ـ ڕێنسانسی ئیتالیا، نووسینی کارێن ئۆسمەن. ٣ـ دەرکەوتنی مەسیحیەت، نووسینی دان ناردۆ. ٤ـ ژاپونی ئەمڕۆ، نووسینی دان ناردۆ. ٥ـ شارستانیەتی مایا، نووسینی پاتریشیاد د.نێتزلی. ٦ـ مێژووی شارستانیەت، نووسینی هێزی لۆکاس، لە دوو بەرگدا. ٧ـ هەزار و پێنج سەد پەندی پێشینیانی هەورامان ( کۆکردنەوە، لێکدانەوە و بەراورد لە گەڵ شێوەی سۆرانیدا).

## عەلی دڵاوێز

لە وەرزی پاییزی ساڵی ١٩٧٥ی زایینی لە مەریوان هاتوەتە دونیاوە. سەرەتا بنەماڵەیەکی مامناوەندیان هەبووە، بە هۆی کۆچی دوایی باوکی لە تەمەنی شەش ساڵی ئەودا و دەسپێکردنی شەڕی ئێراق و ئێران و ئاوارەبونیان بۆ دێهات و شارەکانی دیکە، بارودۆخی بنەماڵە و دۆخی نیشتەجێ بوونیان بەرە و خراپی ڕۆیشتوە. تا سەرەتای پۆلی دووی ناوەندی لە دەرەوەی مەریوان، لە

سنه و دێهاته‌کانی ده‌وروبه‌ری مه‌ریوان چووه‌ته قوتابخانه. پاشان به گه‌ڕانه‌وه‌ی خه‌ڵک بۆ شاری مه‌ریوان ـ دوای کۆتایی شه‌ڕ ـ ساڵی ١٩٩٤ له ڕشته‌ی بیرکاری (ریاضی ـ فیزیک) دیپلۆم وه‌رئه‌گرێت. به درێژایی ده‌رس خوێندنی هه‌موو هاوینێک بێکار نه‌بووه و بۆ په‌یداکردنی خه‌رجی قوتابخانه له مه‌ریوان و له تاران کاری کردووه. هه‌ر له‌و ساڵه‌دا بۆ درێژه‌دانی خوێندن ده‌چێته «ناوه‌ندی بارهێنانی مامۆستایان» له سنه و له به‌شی بیرکاری، بڕوانامه‌ی «فوق دیپلم» وه‌رئه‌گرێت. له ساڵی ١٩٩٦ بۆ ماوه‌ی ساڵێک له ئاوایی «نژمار»ی مه‌ریوان بووه‌ته مامۆستا. ساڵی دواتر له تاقیکاری سه‌رتاسه‌ری زانکۆکانی ئێراندا، بۆ وه‌رگرتنی خوێندکار، سه‌رئه‌که‌وێت و له کۆلیژی «زانسته کۆمه‌لایه‌تییه‌کانی» زانکۆی تاران درێژه به خوێندن ئه‌دات.

سه‌ره‌تای چالاکی فه‌رهه‌نگی و زانستی عه‌لی دلاویز له زانکۆوه ده‌ستی پێکردووه.

ئه‌م نووسه‌ره له گه‌ڵ هه‌ندێک له قوتابیانی‌تر ساڵی ١٩٩٨ ناوه‌ندێکی فه‌رهه‌نگیی کوردی به ناوی «کازیوه» له به‌شی «زانسته کۆمه‌لایه‌تییه‌کانی» زانکۆی تاران دائه‌مه‌زرێنن. ڕاده‌ی بالای به‌شداری خوێندکارانی کورد له تاران، ته‌نانه‌ت نووسه‌ران و چالاکانی کوردی دانیشتووی تاران، هه‌لێکی چاکی بۆ کار و چالاکی فه‌رهه‌نگی و ئاشنایی له گه‌ڵ هه‌ندێک که‌سایه‌تی فه‌رهه‌نگی و سیاسی کورد بۆ ئه‌ڕه‌خسێنێت. سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ش له زۆر کۆڕ و کۆبوونه‌وه‌ی فه‌رهه‌نگی و زانستی له تاران به‌شداری ئه‌کات. له ماوه‌ی خوێندن له زانکۆی تاران بۆ یه‌که‌م جار چه‌ند وتار و وه‌رگێڕان له چه‌ند گۆڤار و ڕۆژنامه‌دا بڵاو ئه‌کاته‌وه.

پاش ته‌واوکردنی خوێندن له ساڵی ٢٠٠٠ دا و گه‌ڕانه‌وه بۆ مه‌ریوان، له قوتابخانه‌کانی شاری مه‌ریوان بووه‌ته مامۆستای وانه‌ی «کۆمه‌ڵناسی و زانسته کۆمه‌لایه‌تییه‌کان و ئابووری». له پاییزی ساڵی ٢٠٠٠ له گه‌ڵ چه‌ند که‌س له‌و که‌سانه‌ی که له کاتی خوێندن و چالاکیدا له گه‌ڵیان ئاشنا ببوو، بۆ ڕێکخستنی چالاکی زانستی و فه‌رهه‌نگی له مه‌ریوان ناوه‌ندێک به ناوی «ناوه‌ندی زانستی ـ فه‌رهه‌نگی ڕۆنان» دائه‌مه‌زرێنن[1]. له‌و کاته‌وه، زۆربه‌ی چالاکیی فه‌رهه‌نگی و

---

١. ده‌سته‌ی دامه‌زرێنه‌ری ڕۆنان بریتی بوون له :مه‌سعوود بینه‌نده، بورهان ڕۆسته‌می، ئه‌نوه‌ر هۆژه‌بری، که‌ریم په‌رویزی، حسێن محه‌مه‌دزاده، حه‌مزه محه‌مه‌دی، عیرفان ڕه‌هنموون، ئازاد ڕه‌حیمی و عه‌لی دلاویز.

کۆمەڵایەتییەکانی لە ناوەندی ڕۆنان و بە ناوی ڕۆنانەوە بەڕێوە بردووە.[١]

**لە چالاکییەکانی ئەم نووسەرە ئەتوانین ئاماژە بکەین بە:**

١ـ نووسینی چەندین وتاری زانستی و بڵاوکردنەوەیان لە گۆڤارەکانی ڕۆنان، ئەندێشەی جامیعە، زرێبار و ...

٢ـ بەشداری کردن لە چەندین کۆڕ و کۆبوونەوەی زانستی و فەرهەنگیدا، وەک: کۆڕی زمانی کوردی (مەریوان،ساڵی ٢٠٠٥)، کۆڕی ئەرک و مافی شارۆمەندی (مەریوان، ساڵی ٢٠٠٧) و کۆڕی نێونەتەوەیی ئەنفال(سنە، زانکۆی کوردستان، ساڵی ٢٠٠٢ ) و ...

٣ـ دانان و بەڕێوەبردنی وانەگەلی وەک: کۆمەڵناسی ـ دەروونناسی، تیۆری کۆمەڵناسی، ڕۆژنامەگەری و ...

٤ـ بڵاوکردنەوەی گوڤاری «ڕۆنان» بە هاوکاری ناوەندی فەرهەنگی هەژان لە زانکۆی کوردستان.

٥ـ ئەنجامدانی سێ توێژینەوەی زانستی بۆ ئیدارە و ناوەندەکانی مەریوان.

ساڵی ٢٠٠٣ بە سەرکەوتن لە تاقیکاری زانکۆی تەوڕێز درێژە بە خوێندن ئەدات و دوو ساڵ دواتر لە بواری کۆمەڵناسیدا بڕوانامەی ماستەری زانکۆی نابراو وەرئەگرێت. لە پاییزی ٢٠٠٤ ەوە ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری «زرێبار»ە. پاش تەواو کردنی دەورەی ماستەر هاوکات لە گەڵ مامۆستایەتی لە قوتابخانەکانی مەریواندا، لە زانکۆی «پەیامی نووری مەریوان»یش وانەی کۆمەڵایەتی و جۆگرافیای شاری ئەڵێتەوە.

## جەمیل فارۆقی

لە سەرەتای مانگی ئووتی ساڵی ١٩٧٥ی زایینی لە ناو چیا سەربەرزەکانی هەورامان لە گوندی «دەمەیۆ» چاوی بە دنیا هەڵێناوە. دوو ساڵی خوێندنی لە گوندی دەمەیۆ ئەبێ و ئەم جار وەک میراتە مێژینەکەی کورد ـ ئاوارەیی ـ ناوەتە تۆشەیی و بە

١. کە تا ئێستایش درێژەی هەیە.

هۆی شەڕی ئێران وئێراق ئاوارە ئەبن. لە دوای قۆناغی سەرەتایی ئەنێردرێتە بەر خوێندنی ئایینی و لە دێهاتەکانی بالک، دەرەتفێ و نژمار و شاری سنە لە خزمەتی گەورە پیاوانێکی وەک مامۆستا سەید نەجمەددینی تەها چۆکی فەقێیەتی دا ئەدات و بە وتەی خۆی بە تەواوەتی چێژی زانیاری و کوردایەتی ڕاستەقینەی لێ وەرئەگرێت. هەر لەوێ ئیجازەی زانیارییە شەرعییەکانی پێئەدرێت. وانەکانی کەلام و فەلسەفەش لای مامۆستا شێخۆلئیسلام ئەخوێنێت. جێگای باسە کە شان بە شانی فەقێیەتی خوێندی قوتابخانەیشی درێژە پێئەدات و دوای تاقیکردنەوەی لە گەڵ مامۆستایانی ئایینی بەکالۆریۆس وەرئەگرێت.

چەند ساڵێک بۆ خوێندنی (اصول، فقه، حدیث) ئەچێتە باشووری ئێران، لە ساڵی ٢٠٠٠ لە تاقیکاری سەراسەری ماستەر لە زانکۆی تاران بە پلەی پێنجەمەوە وەرئەگیرێت. ئێستا مامۆستای زانکۆی پەیام نووری مەریوانە. جێگای ئاماژەیە کە کاک جەمیل خاوەن بەهرەی خەت خۆشییە. بڕێک لە بەرهەمەکانی بڵاو بوونەتەوە و بڕێکیشیان ئامادەی چاپ و بڵاو بوونەوەن، وەک:

١ـ زەنجیرە باسی ناسینی زانایانی کورد، بریتییە لە لێکۆڵینەوەیەکی تێر و تەسەل لە ژیان، ئاسەوار، دەسنووس و بنەماڵەی مەلا خزری ڕوواری لە شەش بەرگدا، چاپ وبڵاو بووەتەوە.

٢ـ وەرگێڕانی قورئانی پیرۆز، بۆ یەکەم جار بە زاراوەی هەورامی کە لە بەردەم چاپدایە.

٣ـ زەنجیرە ناسینی زانایانی کورد، بریتییە لە شرۆڤەی کتێبێکی نایاب و بەپێزی زانای نەناسراوی کورد سەید عەبدوڵڵای بڵبەری بە ناوی گوڵزار کە هێشتا تەواو نەبووە.

٤ـ لێکۆڵینەوە و کۆکردنەوەی دیوانی میرزا سەعدوڵڵای خەدیری هەجیجی شاعیری نەناسراوی هەورامان، بەم زوانە دێتە بازاڕەوە.

٥ـ وەرگێڕانی کتێبێکی زانای بەرزی ئێراقی د.محەممەد ئەحمەدەلڕاشد بە ناوی «صنعت زندگی» بە فارسی کە ئەویش لە ژێر چاپدایە.

کاک جەمیل ئەڵێ: « زۆر جار بۆ پرۆژەی لێکۆڵینەوە داوایان لێکردووم کە بۆ شوێن گەلیتر بچم، بەڵام لە بەر ئەوەی کە کەمتر خزمەتی گەلەکەی خۆمی تێدا

بوو، ئەم کارانەم هەڵبژاردووە و خوا یار بێ هەتا ئەتوانم دەستی لێ بەرنادەم و بەهۆی ئەوەوە من هەر لە منداڵییەوە هەتا ئێستە سەرنجم داوە ئەم وڵاتەی ئێمە ئەو هەموو زانا گەورە و نووسەرە چاکەی بووە بەڵام نووسراوەکانیان یا هەموو یان زۆربەیان دیار نین و کەس نازانێ لە کوێ سەریان دەرهێناوە؟! یان کێ بە ناوی خۆیەوە بڵاوی کردوونەتەوە ؟! یان چەندێکیان فەوتاون؟!

بە بیر کردنەوە لەو تاڵانەی لەم بارەیەوە لێمان کراوە بە ڕاستی چاو ئەپەڕێتە تەوقی سەر. کاتێ ئەبینم زۆرینەی کتێبخانە هەرە گەورەکانی بەغا هی زانایانی کوردن و هەروەها کتێبخانە تایبەتییەکانی کەسانی بێگانە و شوێنانیتر کە پڕن لە کتێب و پەرتووکی دەسنووسی کوردی زۆرێکیان لە کوردستانەوە بۆ ئەوێ براون. با ئەوەش بوەستێ کە چەندێکیتر بووە بە خۆراکی مشک و دراوە بە ئاودا. ئەمانە و چەندین خەمی تر هانی دام بۆ ئەوەی تا ئەتوانم هەوڵ بدەم و میراتی گەلەکەم لە فەوتان ڕزگار بکەم[1]».

کەخاوەن شێعر بمرێ نرخی قسەی  لە زێڕ و دووڕ و گەوهەریش زیاترە
دەسا کێ لە دنیا بە شاعیر دەگا  کە مەرگی لە ژینی گەلێ چاترە

«وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار»

## حەمزە محەممەدی

ساڵی ١٩٧٥ی زایینی لە بنەماڵەیەکی کرێکار لە شاری مەهاباد لە دایک بووە. باوکی «ئەکبەر» و دایکی «ئایشێ خاتوون»ە. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی و دوا ناوەندیی لە بارودۆخێکی ئاڵۆزی ئەندێشەیی، ڕامیاری و کۆمەڵایەتی تێپەڕاندووە. بە پێچەوانەی داخوازی بنەماڵەکەی و بۆچوونی کۆمەڵناسی سەبارەت بە ڕشتەگەلی ئەو سەردەمە، ڕشتەی زانستە مرۆڤایەتییەکان هەڵئەبژێرێت. ساڵی ١٩٩٣ لە ڕشتەی «فەرهەنگ و ئەدەب»دا دیپلۆم وەرئەگرێت. ڕشتەی کۆمەڵناسی یەکەم هەڵبەژاردەی لە کێبەرکێی زانکۆدا ئەبێت. ساڵی ١٩٩٧ لە کۆلێژی زانستەکۆمەڵایەتییەکانی زانکوی تاران بەکالۆریۆسی

---

١. وت و وێژ لەگەڵ نووسەر.

کۆمەڵناسی و ساڵی ۱۹۹۹ هەر لەو زانکۆیەدا ماستەری مرۆڤ ناسی وەرگرتووە.

دوای تەواو کردنی زانکۆ خەریکی مامۆستایەتی لە قوتابخانەکانی دواناوەندی و هاوکات مامۆستای زانکۆی پەیام نووری مەریوانە.

**کارنامەی فەرهەنگی ئەم نووسەرە بریتییە:**

۱ـ ئەندامی دامەزرێنەری کانوونی زانستی ـ فەرهەنگی ڕۆنان، ئەندامی نەگۆڕی بەڕێوبەرایەتی کانوون و لە ماوەی پێنج ساڵدا دەبیری کانوونە.

۲ـ ئەندامی ئەنجوومەنی پیشەیی مامۆستایانی مەریوان.

۳ـ ئەندامی دەستەی نووسەرانی وەرزنامەی زرێبار.

۴ـ نووسین و وەرگێڕانی پێوەندیدار بە پرسە کۆمەڵایەتییەکانەوە.

۵ـ بەڕێوەبەر و هاوکاری چەندین پرۆژەی لێکۆڵینەوە.

۶ـ پێشکەش کردنی وتار لە چەندین کۆبوونەوەی نەتەوەییدا.

**ڕزگار عەلایی**

کوڕی سەید مەحموود کوڕی شێخ سەیفەددین (حەوتاشی) لە ساڵی ۱۹۷۵ی زایینی لە مەریوان، کە بە بڕوای خۆی پارچە زێڕێکی دیاریی پەروەردگارە بۆ گەلی کورد، چاوی بە دنیای پڕ لە گێژاو و سەخڵەت هەڵێنا و سەرەتای چیرۆکێکی پڕ سەرکەوتنی تۆمار کرد و بەڵام...

هێشتا منداڵێکی چاوگەش بوو کە ئاگری شەڕی ئێران و ئێراق هەڵگیرسا. بنەماڵەی ڕزگار وەکوو زۆربەی خەڵکی شار لەو شارە و دەوروبەری مانەوە و ڕزگار ئەزموونی خوێندن و فێربوونی لە ناو ئاگر و خوێندا بەئاکام گەیاند.

پاش وەرگرتنی بڕوانامەی دیپلۆم لە ساڵی ۲۰۰۰ دا بۆ درێژەدان بە خوێندن چووە زانستگای پیشەیی ئاو و کارەبای تاران. پاش تەواو کردنی خوێندن لە بەشی ئەندازیاری ئاو و ئاوەڕۆدا، وەکوو سەرباز لە کۆمپانیای «ئابفا»ی پارێزگای کوردستاندا دەستی بە کار کرد. ماوەی کورتی سەربازی مەودایەکی زێڕین بۆ ناوبراو بوو تا زانستەکانی بکاتە کردەوە و لە خزمەتی شار و هاوولاتیانیدا بێت. کە لەو ماوە کورتەدا توانی ببێتە ئەندامێکی کارا و جێی متمانەی زانستیی ئەو بەشەی

کاری لێدەکرد. بەڵام بە داخەوە مەرگ مەودای نەداو لەکاتی سەفەرێکی زانستی بۆ شاری ئیسفەهان لە ڕێکەوتی ۲۷ ژوییەی ۲۰۰۲ دا بە هۆی کارەساتی هاتووچۆوە ماڵئاوایی لە ژیان و لە گەلەکەی کرد.

خوالێخۆشبوو لە ماوەی دوو ساڵ پاش تەواو بوونی زانستگا بێجگە لە کۆمەڵێ نووسراوە و بیرەوەریی ئەدەبی، توانی فەرهەنگنامەیەکی فارسی ـ ئینگلیزی وەک یەکەمین «فەرهەنگنامەی تایبەت بە ئاو و ئاوەڕۆ »پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی بکات.

## موسلێح کۆنە پۆشی

ساڵی ۱۹۷۵ی زایینی لە گوندی «سەڵەسی» مەریوان، لە بنەماڵەی شێخانی کۆنەپۆشی چاوی بە ژیان هەڵێناوە. باوکی شێخ سەدرەدین و دایکی مەحبووبە خاتوونە.

ساڵی ۱۹۸۱ جانتای خوێندن لە کۆڵ ئەکات و ڕێگای مەزرای خوێندن لە قوتابخانەکانی شاری مەریواندا ئەگرێتە بەر. هەر لەم شارەدا قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی دەبڕێ. لە گەرما و گەرمی شەڕی ئێران و ئێراق و ئاوارەیی خەڵکی مەریواندا، بنەماڵەکەیان ڕوو لە شاری سنە ئەکات و ساڵی ۱۹۹۳ قۆناغی دوا ناوەندی لە سنە تەواو ئەکات. هەر لەو ساڵەدا ئەبێ بە مامۆستا و بۆ ڕەواندنەوەی شەوەزەنگی نەزانی شارێی خزمەت بە منداڵانی گەل و هۆزی لە دێهاتەکانی مەریوان دەگرێتە بەر.

خولیای زانست و فێر بوون هانی ئەدات کە بەرە و کانیاوی فێر بوون لە زانستگاکان بڕوات و ساڵی ۱۹۹۶ لە زانکۆی بەهەشتی تاران لە بەشی کۆمەڵناسیدا وەرئەگیرێت. لە ساڵانی ۲۰۰۱ تا ۲۰۰۴ یشدا ماستەری لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی لە زانکۆی تاران تەواو ئەکات. لە پەنای وانە وتنەوە لە قۆناغی دواناوەندیشدا وەک مامۆستا لە گەڵ زانکۆی پەییام نووری مەریوان هاوکاری ئەکات.

موسلێح لە پاڵ وانە وتنەوەدا، چالاکێکی فەرهەنگی و مەدەنییە و لە پێکهێنان و بەڕێوەبردنی ئەنجومەن و کۆمەڵە مەدەنییەکاندا ڕۆڵێکی کارای بووە؛ لە وانە بەشداری لە پێکهێنانی ئەنجوومەنی پیشەیی مامۆستایانی مەریوان، چالاکی لە ئەنجومەنی زانستی فەرهەنگی ــ هونەری ڤەژین و... هتد، هەروەها لە گەڵ

کۆمەیسیۆنی فەرهەنگی شۆرای شاری مەریواندا هاوکارییەکی چڕ و پڕی هەیە.

**ئەمەش کارنامەی ئەم نووسەرەیە:**

١ـ پێشکەش کردنی زۆرتر لە بیست وتار لە کۆڕ و کۆبوونەوەی نەتەوەیی و نێو نەتەوەیەکاندا.

٢ـ سێ گەلاڵەی لێکۆڵینەوە.

٣ـ مامۆستای بەردەوامی ڕێنوێنی لێکۆڵینەوە و تیزی قوتابیانی زانکۆ و مامۆستایانی قوتابخانەکان.

## عەبدولڕەحمان ڕەحیمی نیا

ساڵی ١٩٧٦ی زایینی لە گوندی «بێلوو» لەبنەماڵەیەکی هەژار و نەدار، دوای سێ کچ، ئاواتی بنەماڵەکەی کە بوونی کوڕێک هەبووە وەدی دێنێت.

پێنج ساڵی خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانە تەپ و تۆزاویی گوندەکەی کۆتایی پێ دێنێت. قوناغی ناوەندی هاوکات لە گەڵ شەڕی ئێران و ئێراقدا لە گوندەکانی دەوروبەر و لە مەریواندا تێپەڕاندووە.

پاییزی ساڵی ١٩٩٠بۆ خوێندنی قۆناغی دواناوەندی لە «ناوەندی بارهێنانی مامۆستایان» وەرئەگیرێت.

پاییزی ١٩٩٤ داری زانستی بەرئەگرێت و لە گوندی «پیربابائەلی» سەر بەشاری «قوروە» ئەبێ بە مامۆستا. دوای ساڵێک بۆ مەریوان ئەگەڕێتەوە.

ساڵی ٢٠٠٦ کۆلێژی زمان و ئەدەبی فارسی تەواو ئەکات و بە بڕوانامەی بەکالۆریۆسەوە ئەبێ بە مامۆستای وانەی زمانی فارسی لە قوتابخانەکانی مەریوان.

لە سەردەمی خوێندنیدا هەست بەوە ئەکات کە ئەتوانێ شێعر یان چیرۆک بخوڵقێنێ و دواتر خۆی دەرئەخات و نازناوی «ئاوان بێلوویی» بۆ خۆی هەڵئەبژێرێت.

لە یەکەم ساڵەکانی مامۆستاییەوە بە چڕ و پڕی دەست لە مل پێنووس بووە و بڕێک لە چیرۆکەکانی سادق هیدایەت، جەماڵ میرسادقی و مەنسوور یاقووتی و

شێعری فرووغ فەڕووغزاد و پابلۆنیرۆدا و چەندین چیرۆکی منداڵان وەرئەگێڕێتە سەر زمانی زگماکی خۆی. هەر وەها لە زمانی کوردیشەوە چەند چیرۆکێکی شێرزاد حەسەن و ڕەئووف بێگرد و ... وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی.

ئێستاکەش بەرهەمەکانی هەموو لە نێو دەفتەرەکانیدا و لە تاقی کتێبخانەکەیدا ماونەتەوە و هەلیان بۆ نەڕەخساوە هەوای جیاوازی کتێبخانەکان هەڵمژن.

بەرهەمەکانی «ئاوان بێلووویی» لە گۆڤارەکانی سروە، زرێبار و ڕەوت و هەر وەها لە کتێبی «گوڵچینی شێعری شاعیرانی کورد(١)[1]» ... بڵاو بوونەتەوە.

کۆچەرتێل
ئەریٚ تۆ لە ئاوازی کام تێلی
دارتێلەکانی تەلەفوونی ڕۆژئاواوە هاتووی..!؟
کە لە ئاوازی «سورێن بەفری»
کەنار «باران دەشتی زرێبار»ی من ناگەی!؟
بۆ لە من ناگەی!؟
بۆ دەگەم لێت!؟
نێوان من و تۆ
نە حەوت کێوە
نەحەوت دەریا...!
نێوان من و تۆ تەنیا هەناسەیەکە...!
دە دەستەکانت بێنە!
با لە گوڵستانی دڵما بیانچێنم...!

## بەختیار کەریمی

لە وەرزی هاوینی ساڵی ١٩٧٦ی زایینی لە مەریوان لە دایک بووە. قوناغی دواناوەندی لە مەریوان تێپەڕ ئەکات و ساڵی ١٩٩٥ لە زانکۆی تاران وەرئەگیرێت و ساڵی ٢٠٠٠

١. لە لایەن ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگی ئەدەبی سەلاحەدین ئەیوبییەوە دەرچووە.

بەکالۆریۆسی زانستی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لقی ڕۆژنامەوانی تەواو ئەکات. دوای تەواو کردنی زانکۆ، لە بەشی هەواڵی تەلەفزیۆنی شاری سنە وەک وەرگێڕ و بێژەر چالاکی هەبووە. هاوکات لە گەڵ کاری تەلەفزیۆندا لە حەوتەنامەی ئاسۆ ئەندامی شۆرای نووسەران و بەرپرسی بەشی هەواڵی کوردی بووە و دوای سێ ساڵ کارکردن لە تەلەفزیۆندا دەرئەکرێت. بۆ تێراو کردنی بیر و هزری لە کانیاوی زانست، دیسانەوە ڕوو لە زانکۆ ئەکات و ساڵی ٢٠١٠ ماستەری ڕۆژنامەوانی وەرئەگرێت.

یەکەم بەرهەمی وەک کتێب لە ژێر ناوی «بەرەو ڕۆژنامەوانی مۆدێرن» چاپ ئەکات و وتارەکانیشی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانی: ئاسۆ، هەواڵ، ئاشتی، زرێبار، نەدای دانشجوو، ڕۆژهەلات، سیروان و ماڵپەڕە کوردییەکان بڵاو دەکاتەوە. کتێبێکی تری لە ژێر ناوی «سەردەمی گەشەی دەسەڵاتی نەرمی هەواڵەکان» ئامادەی چاپ و بڵاوبوونەوەیە.

### د. ڕەحمەت سادقی

لە وەرزی پاییزی ساڵی ١٩٧٦ی زایینی لە گوندی «یەنگیجە» لە بنەماڵەیەکی دەس کورت و ئایینی چاوی بە ژیان هەڵێناوە. ساڵی ١٩٨٢ قۆناغی خوێندنی سەرەتایی لە مەریوان دەست پێئەکات. بە هۆی شەڕی ئێراق و ئێران ئاوارە و ڕوو لە زێدەکەی باوکی (زەکریان) ئەکەن. زۆر چالاکانە دوو پۆلی بە یەکساڵ خوێندووە. لە دوای کۆچاوکۆچێکی زۆر و ئەم لاو ئەو لا کردن ساڵی ١٩٩٣ دیپلۆمی تەجروبی وەرئەگرێت. هەر لەو ساڵەدا بۆ بەشی مامۆستایەتی کیمیا لە زانکۆی کوردستان وەرئەگیرێت. بە وتەی خۆی «کەسایەتی زانستی ئەو لەم قۆناغەدا پێک دێت.» بە پلەی یەکەمەوە ساڵی ١٩٩٧ بەکالۆریۆس تەواو ئەکات. دوای ماوەیەک مامۆستایەتی لە قوتابخانەکانی مەریوان دیسانەوە لە قۆناغی ماستەر لە زانکۆی تەوریز درێژە بە خوێندن ئەدات و بە هۆی لێکۆڵینەوەی زانستی و هاوکاری کردن لە گەڵ گۆڤارە بە ناو بانگە نێو نەتەوییەکاندا، وەک قوتابییەکی نموونە و لێهاتوو ئەناسرێت. دوای تەواو کردنی ئەم قۆناغەش لە ساڵی ١٩٩٩دا، بە یەکەم کەس

لە ئێراندا بۆ پلەی سەرتر واتە دوکتورا ( PHD) هەر لە زانکۆی تەورێز وەرئەگیرێت و لە وەزارتــی پەروەردە و بارهێنــان واز دێنێــت و لە وەزارەتــی علــووم (زانکــۆی کوردستان) وەک ماموستا و ئەندامی زانستی لێژنەی کیمیا دەست بە کار ئەبێت.

**ئەمەش بەشێکە لە چالاکییە زانستیەکانی:**

١ــ نووســین و چــاپی ٥٥ وتــار لە گۆڤــارە بە ناوبانگەکــان (ISL)ی ئەوروپــی و ئەمریکاییدا، وەک :

J. Chem. Thermodynamics ،Fluid Phase equilibria ،J. Chem. Eng. Data Chem.Eng. Science ،iophysicalChemistry ،Polymer و ...

٢ـ پێشکەش کردنی زۆرتــر لە ســی وتــاری زانــستی لە کــۆنگرە نەتەوەیــی و نێــو نەتەوەییەکاندا.

٣ـ بەڕێوەبردنی دوانزە گەلاڵەی لێکۆڵینەوە.

**جەمال محەممەدی**

جەمال محەممەدی ساڵی ١٩٧٧ی زایینی لە مەریوان چــاوی بە ژیان هەڵێناوە. باوکی محەممەد ســاڵح و دایکــی مەحبــووبە خاتوونە. قۆناغەکانی خوێندنی تا وەرگرتنی دیپلۆم لە مەریــوان درێژە پێداوە. ساڵی ١٩٩٩ لە بەشی زمان و ئەدەبیاتی ئینگلیــزی لە زانکــۆی بارهێنــانی مامۆســتایانی تــاران بەکالۆرێوســی وەرگرتووە. دوو ساڵ دواتــر ماستەر و پاشــانیش دوکتــورای زانــستی کۆمەڵناســی لە زانکــۆی تــاران تەواو کــردووە. ئێــستاش وەک ئەنــدامی لێــژنەی زانــستیی زانکــۆی کوردستان لە سنە خزمەت دەکات.

**چاپ کراوەکانی نووسەر:**

١ــ بیروڕاکــانی ئەم دوایــیەی کۆمەڵناســی، بە هاوکــاری حەمیــد ڕەزا جەلایــی پوور،ساڵی ٢٠٠٨.

٢ـ خوێندنەوەی فەرهەنگی، هژموونی و فەرهەنگی گشتی،٢٠٠٠.

**بەرهەمی وەرگێڕاو:**

١ـ وەرچەرخانی پێکهاتەی بواری گشتی، یورگن هابرماس،٢٠٠٥.

٢ــ پێشەکییەک لە سەر ڕای فەرهەنگی هاوچەرخ، ئاندورا میلنر و جف براویت،٢٠٠٦.

٣ـ یورگن هابرماس، ئل.ئی.هاو،٢٠٠٨.

٤ـ فەرهەنگی مێژووی ئەدێشەکان، فیلیپ پی. واینر، لە سێ بەرگدا، ٢٠٠٦.

٥ـ کۆمەڵناسی (معرفت و زانست)، دیوید گلوور و شیلاف ئسترابریج، ٢٠٠٤.

٦ـ بۆچوونەکانی خراپ کەڵک وەرگرتن لە مادە هۆشبەرەکان، دن.جی لتیری، ٢٠٠٥.

٧ـ خوێندنەوەی فەرهەنگی، ڕوانگەکان و کێشەکان، ٢٠٠٨ .

٨ـ مۆسیقا وەک کرۆکی کۆمەڵگا، ٢٠١٠.

٩ـ سەبارەت بە خوێندنەوەی فەرهەنگە،کۆ وتار،٢٠٠٩.

ئەم نووسەرە، چەندین وتاری زانستی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی و لە گەڵ زۆرێک لە گۆڤار و ڕۆژنامەکان وەک: راهبرد، هم میهن، آیندەی نو، جام جم، اعتماد و زرێبار هاوکاری کردووە.

**کاوە دەستوورە**

ساڵی ١٩٧٧ی زایینی لە گوندی «باشماخ» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. ناوی دایکی ڕابێعە و باوکیشی محەممەدە. ساڵی ١٩٨٠ هەواری ژیان بۆ شاری مەریوان ئەگوێزنەوە و بە هۆی شەڕی ئێران و ئێراقەوە ڕوو لە سنە ئەکەن و ماوەی سێ ساڵ لە سنە ئەمێننەوە. قۆناغەکانی خوێندنی تا وەرگرتنی دیپلۆم لە ساڵی ١٩٩٦ لە قوتابخانەی ئیمام غەزاڵی مەریوان درێژە پێداوە. ساڵی ٢٠٠٠ لە بەشی زانستی کۆمەڵناسی لە زانکۆی تاران بەکالۆریۆسی وەرگرتووە. دوو ساڵ دواتر ماستەری یەکەم ـ نامەکەشی لە سەر ناسیۆنالیزمی کوردی و بنەماکانی ـ تەواو ئەکات. ساڵی ٢٠٠٥ بۆ درێژەدان بە خوێندن ئەڕواتە فەرانسە و ساڵی ٢٠٠٦ ماستەری دووهەمی لە زانکۆی سۆربۆن لە سەر کۆمەڵناسی وڵاتانی ئەورووپی ـ نامەکەی لە سەر مەسەلەی ڕەگەز لای میشل فوکۆ ـ وەرئەگرێت. لە ساڵی ٢٠٠٧وە خەریکی خوێندنی دوکتۆرای کۆمەڵناسییە. لە چەندها کۆڕ و کۆبونەوەی کولتوریدا بەشداری کردووە.

**چالاکییەکانی نووسەر:**

ـ ساڵی ١٩٩٨تا ٢٠٠٢ بەرپرسی ناوەندی کولتوری کازیوە لە زانکۆی تاران.
ـ خاوەن ئیمتیاز و سەرنوسەری گۆڤاری ڕاڤە ـ تاران.
ـ سەرنوسەری گۆڤاری نویسا ـ تاران.
ـ ٢٠٠٩ دەستەی نوسەرانی گۆڤاری لۆمۆندی دیپلۆماتیکی کوردی ـ پاریس.

## کوورش ئەمینی

ساڵی ١٩٧٧ی زایینی لە شارەدێی «نۆدشە» لە بنەماڵەیەکی نیشتمانپەروەر لە دایک بووە. دایکی خاتوو ئایشێ و باوکی محەممەد ڕەشیدی ناوە.

قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی و دوا ناوندیش هەتا وەرگرتنی دیپلۆم هەر لە نۆدشە بووە و لە زانستگای زانسیتیە پزشکیەکانی شاری کرماشان و هەمەدان کارناسی بێهداشتی حێرفەای وەرگرتووە و لە زستانی سالی ١٩٩٧وە دانیشتووی مەریوانە و لە نەخۆشخانەکانی شاری مەریواندا خزمەت دەکات.

یەکەم نووسراوەی بە نێوی «نقطه صفر» لە قۆناغی دواناوەندیدا و لە ساڵی ١٩٩٥ لە گۆڤاری «ایران فردا»دا بڵاو ئەبێتەوە.

وەک کارنامەی فەرهەنگی ئەم نووسەرە، ئەتوانین ئامازە بکەین بە وەرگێرانی کتێبی «شازدە بچکۆلە»ی ئانتوان سەنتەگزۆپێری بە زاراوەی هەورامی. ناوبراو وتارەکانی لە گۆڤار و حەوتەنامەکانی سیروان، ئاسۆ، پیام مردم و مەهاباد دا بڵاو ئەکاتەوە.

## پەرویز ڕۆستەمی

پەرویز ڕۆستەمی، کوڕی علی و نەجیبە خاتوونە. وەرزی بەهاری ساڵی ١٩٧٧ی زایینی لە ناو شاخە سەربەرز و دڵڕفێنەکانی «هەورامانی تەخت» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. قۆناغی سەرەتایی لە هەورامان و قۆناغی ناوەندی لە قەڵاجێ ئەخوێنێت.

له مەریوان دیپلۆم وەرئەگرێت. نیگارکێشی وەک بەهرەیەکی سروشتی لە گەڵ حەز و خواست و لێبڕانی خۆیدا پەرە پێئەدات و سەرنجی مامۆستاکانی لە قوتابخانەکاندا ڕائەکێشێ و ئەوانیش ئەبن بە هاندەری. بەڵام ئەوەندە خەریکی نیگارکێشی و ڕەنگ ئەبێت کە زۆرجار لە لایەن خزم و نزیکانییەوە بەرنگاری ئەبنەوە. ئەم هونەرمەندە لە وەرزی هاویندا بۆ بژێوی ژیان وکڕینی پێداویستییەکانی نیگارکێشان لە تاران کرێکاری کردووە. بۆ پەرەپێدانی ئەو بەهرەیە بە شێوەی زانستی، لە وانەکانی مامۆستایانی گەورەی نیگارکێشی وەک: هادی زیائەدینی، ئەکبەر مەنسووری و فەردین سادق وەزیری چێژی زانستی وەرگرتووە. لە دوای وەرگرتنی دیپڵۆم لەو بوارەدا، وەک نیگارکێشێکی کارامە و لێهاتوو بە شێوەی تاک و کۆ پێشانگای کردووەتەوە. لە پەنای ئەم هونەرەدا بەشێوەیەکی زانستی فێری دەف لێدان ئەبێت و وەک مامۆستای دەف چەند خولی فێرکاری لە مەریوان ئەکاتەوە. حەز و خولیای هونەر هانیداوە کە دەلاقەیەکی تری هونەر بە ڕووی خۆیدا بکاتەوە و ڕوو لە دنیای وێنەگرتن و فیلمسازی ئەکات و کارنامەیەکی ڕەنگینی لەم بوارەدا بۆ خۆی تۆمار کردووە. بە هاوکاری شەهێن خاتوونی خێزانی زۆرێک لە داب و نەریتی تایبەتی ناوچەی هەورامانی وەک فیلمی دیکۆمێنتاری هەڵگرتووە.

**کارنامەی فەرهەنگی پەرویز ڕۆستەمی:**

۱ ـ فیلمی کورتی «کەوش». ۲ـ فیلمی «گۆرانیەک بۆ ڕووبار». ۳ـ فیلمی «هیواکان لە نێو بەفردا ئەمرن». ۴ـ فیلمی «سفرەیەک بۆ شادی ڕۆحەکان». ۵ـ فیلمی«پاجال».

۶ـ فیلمی «بەرد». ۷ـ فیلمی «ژین و ئەوین». ۸ـ فیلمی «میوانی گازە». ۹ـ فیلمی «میراتی مەندۆخ». ۱۰ـ فیلمی «توولە ڕێ». ۱۱ـ فیلمی «جێگەپێیەک لە باراندا». ۱۲ـ فیلمی «زستانی هەورامان». ۱۳ـ هاوکاری لە گەڵ ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکان.

## ڕەئووف سەعیدیان (ئاریا هەورامی)

لە سپتەمبەری ساڵی ١٩٧٧ی زایینی لە گوندی «نوێن»ی هەورامان، زێدی کەڵەپیاوی مەیدانی ڕامیاری و خۆڕاگری، «مامۆستا ئەمین حەیدەری»[1] لە دایک بووە. سەردەمی منداڵی لە ناو کەژ و کێوەکانی هەورامان تێپەر بووە و ئەو شاخانەی بە قەڵا و پاڵ پشتی هۆزەکەی ناسیوە. هەر لە گوندی نوێن ناردوویانەتە قوتابخانە و هاوکات لە گەڵ قوتابخانەکەیدا، دەرسی قورئان و کتێبە سەرەکییەکانی مەکتەبخانەی ئایینی خوێندووە.

ڕەئووف دەڵێ: «هەر لە سەردەمی فەقیەتیدا بوو هەستم بەوە کرد کە دەبێ بۆ فەرهەنگ و کەلتووری وڵاتەکەم هەوڵ بدەم.» ڕۆژ لە دوای روژ ئەم هەستە، کە لە سەرەتادا ڕەنگ و چێژی ئایینی هەبوو، قووڵتر و گەورەتر دەبوو. بۆیە بۆ هۆشیار کردنەوەی لاوان و منداڵانی زێدەکەی، کتێبخانەیەکی بە ناوی «حەرا» واتە مەڵبەند و کۆگای بیر و هزر و هەڵسانەوە، لە گەڵ هاوڕێ بچکووکەکانی کتێبخانەکەیان سەرپەرەستی دەکرد. بە هەوڵ و تێکۆشانی ئەوان، «حەرا» پەرە ئەسەێنێت و بۆ ماوەی چوار پێنج ساڵ هەوڵەکانی بەردەوام دەبن. هەر ئەمەش ئەبێتە بنەما بۆ هەوڵ و تێکۆشانی زۆرتر. لە پاڵ کتێبخانەکەشدا، بۆ ماوەی دوو ساڵ، چەندین پۆلی زانیاری وئایینی و ڕوشنبیری بۆ لاوان و ئەندامانی حەرا دانا. ئەم هەوڵانە درێژەیان هەبوو، هەتاکوو لە ساڵی ١٩٩٦ دا زانستی ئایینی لە قوتابخانەکانی پاوە، ڕەوانسەر، سنە، کرماشان، مەریوان و هەورامان تەواو کرد. ساڵی ١٩٩٨ لە تاقیکاری زانکۆدا سەرئەکەوێت و ئەچێتە زانکۆی زانستی ئیسلامی ڕەزەوی (دانشگاه علوم اسلامی) لە شاری مەشهەد و بۆ ماوەی چوار ساڵ، لەو زانکۆیە ئەمێنێتەوە و بەکالۆریۆس تەواو ئەکات. هاوکاتیش لە حەوزەی خۆراساندا، ماستەری زانستی ئایینی وەرئەگرێت. دوای تەواو بوونی خوێندنەکەی گەڕایەوە بۆ کوردستان و لە بەر چەند هۆیەک لە

---

١. یەکێ لە ڕۆشنبیران و تێکۆشەرانی گوندی «نوێن» بووە کە ساڵی ١٩٦٨ لە لایەن ڕژێمی پاشایەتییەوە دەسبەسەر و بۆ ماوەی سێ ساڵ لە زیندانی «قەجەر» لە شاری تاران بەند ئەکرێت. دوای ئازاد بوونی لە زیندان، لە لایەن «ساواک»ەوە دەرمان خوارد ئەکرێت و ماڵئاوایی لە ژیان ئەکات.

کاری دەوڵەتی بێبەش کرا.

لە زانکۆدا بوو کە بیری گۆڕا. بەرە و بیری کوردایەتی گەڕایەوە. بە هۆی نزیک بوونەوەی لە کتێبخانە گەورەکان، لە گەڵ زمان و فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی شارەزا بوو. دوا بە دوای ئەوە، لە زانکۆدا هەوڵی دا بۆ هۆشیار کرنەوەی دۆستانی کوردی کرماشانی و خۆراسانی. بەم بۆنەوە ڕێنووسێکی کوردی بۆ نووسین و چەند دانیشتنێکی بۆ فێر کردنی ڕینووسی کوردی لە گەڵیان پێک هێنا. شارەزا بوونی بە مێژووی وەلاتەکەی، لە ساڵی ئەوەلی زانکۆوە، زیاتر بیرە نەتەوایەتیەکەی بزواند.

لە سەر هەوڵەکانی کتێبخانەی «حەرا»، کە ئەمجارە تام وچێژی کوردایەتییان گرتبوو، لە هەواری کراویەدوڵ و دەرەویان، لە سەر بەرزاییەکانی، «مرۆڵە و بەرزڵە» گروپێکی هونەری ئەدبی پێک هێنا بە ناوی «یارسان»، هۆی ناونانی گروپەکە بە یارسان ئەوە بوو کە یارسان و یارسانییەکان بە درێژایی شەش سەد ساڵ بنیات نەر و پەرەدەری فەرهەنگی هەورامان بوون.

ئەم گرووپە دواتر بە ناوی ئەنجومەنی فەرهەنگی ـ ئەدەبی بێسارانی هەورامان، لە مەریوان لە ژێر ناوی ئەنجۆمەن، دەوری تازەی خۆی بینی. ئێستاکە ئەنجومەن خاوەنی گۆڤاری ناوخۆیی بە زاراوەی هەورامی بە ناوی «دەلاقە»یە و بۆ زیندوو کردنەوەی ئەدەبی هەزار ساڵەی هەورامی تێدەکۆشێت.

ڕەئووف سەعیدیان وەک نووسەرێکی بە توانا بە زاراوەی هەورامی و سۆرانی و بە زمانی فارسی خەریکی چالاکی فەرهەنگی ـ ئەدەبییە و بابەتانەکانی خۆی لە گۆڤارەکانی سیروان و ئاوێنە و فەرهەنگی کوردستان و تبیاندا بڵاو کردۆتەوە.

**بەرهەمە چاپ کراوەکانی نووسەر:**

۱ـ افسانه های هورامان، چهل دختر، چهل دیو، چهل پسر و دختر شاه پریان؛ پرتو بیان،۲۰۰۴.

۲ـ سه گوهر شب چراغ (از افسانه های هورامان) سفیر علم، ۲۰۰۷.

۳ـ صد سیاچەمانه از هورامان، با همکاری فریاد شیری، مشکی،۲۰۱۰.

۴ـ ئامادە کردنی دیوانی شێعری «هۆنراوەکانی دایکی سەلام» (فریشتە عەلەوی).

۵ـ ئامادە کردنی دیوانی شێعری «بەهەشتی هەورامان»ی سەید ڕەئووف حسێنی.

**ئامادەی چاپ:**

١ـ ئەفسانەکانی هۆرامان، بە هاوکاری ڕەئووف مەحموود پوور.

٢ـ وەرگێڕانی کتێبی «فروید لە ترازووی ژیریدا» لە نووسینی مامۆستای شارەزووری، بۆ سەر زمانی فارسی.

**مەسعوود بینەندە**

ساڵی ١٩٧٧ی زایینی لە مەریوان لە دایک بووە و قۆناغی سەرەتایی، ناوەندیی و دواناوەندی خوێندنی لە شارەکانی مەریوان و سنە تەواو کردووە. دواتر لە بواری زانستی فیزیا لە زانکۆی زەنجان پلەی بەکالۆریۆسی وەرگرتووە و هەروەها پلەی ماستەری لە بواری زانستی کۆمەڵناسەیدا لە زانکۆی تاران بە پێشکەش کردنی نامەی «شیکاریی ڕەخنەگرانەی گوتاریی گۆڤارە خوێندکارییەکان سەبارەت بە کێشەی نەتەوەکان لە ئێراندا» وەدەست هێناوە و لە ساڵی ٢٠٠٨ وەک خوێندکارێکی چالاک و لێهاتوو بۆ قۆناغی دوکتورا وەرگیراوە.

ئەم نووسەرە زۆرتر لە بواری فەلسفە و کۆمەڵناسەیدا دەنووسێت و هەنووکەش وەکوو سەر نووسەری گۆڤاری زرێبار و ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری ناوەندی فەرهەنگی ـ زانستی ڕۆنان درێژە بە چالاکی ئەدات.

**کورتەیەک لە چالاکییە فەرهەنگی و زانستیەکان:**

١ـ دامەزرێنەر و بەرپرسی ناوەندی فەرهەنگی ـ ئەدەبی خوێندکارانی کوردی زانکۆی زەنجان «ڤەژین».

٢ـ ئەندامی دەستەی دامەزرێنەر و بەڕێوەبەری ناوەندی ـ زانستی ڕۆنان لە مەریوان.

٣ـ سەرنووسەری بڵاوکراوەی خوێندکاریی «آفاق نو»، زانکۆی زەنجان.

٤ـ سەرنووسەر و بەرپرسی بڵاوکراوەی خوێندکاریی «فراسو»، زانکۆی زەنجان.

٥ـ ئەندامی دەستەی نووسەرانی بڵاوکراوەی خوێندکاریی «ڕۆنان»، زانکۆی کوردستان.

٦ـ ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری کۆنگرەی نێونەتەوەیی ئەنفال، زانکۆی کوردستان.

٧ـ بەرپرسی یەکەمین فستیڤاڵی ڕۆشنبیری کوردی ڕۆنان، شاری مەریوان.

٨ـ سەرنووسەری وەرزنامەی فەرهەنگی ـ کۆمەڵایەتی زرێبار.

لەم گۆڤار و ڕۆژنامانەدا وتار و بەرهەمەکانی ئەم نووسەرە بڵاو بوونەتەوە: ڕەهەند، گەلاوێژ، ئایەندە، ڕامان، هاووڵاتی، چاودێر، زرێبار، ڕۆژهەڵات، سیروان، ڕاسان، دەنگ، ئاسۆ، دیدگاه، اعتماد ملی و ...

## مێهدی چۆڕی

مێهدی چۆڕی کوڕی سەید محەممەد، کوڕی سەید زەینەلعابدین، کوڕی ئاغا حسێن، کوڕی حاجی سەید حەسەنی چۆڕی، ناسراو بە «عەللامەی چۆڕ»ە.

لە وەرزی پاییزی ساڵی ١٩٧٧ی زایینی لە بناری قەڵەبەرد لە مەکۆی زانست و عیرفان و لە گوندی «چۆڕ» و لە زێدەکەی بلیمەت و نووسەری بەناوبانگی کورد «موسەننیفی چۆڕی» لە بنەماڵەیەکی ئایینی لە دایک بووە. خوێندنی سەرەتایی لە چۆڕ دەست پێئەکات. دوو ساڵ لە خوێندنی تێپەڕ نابێ کە باوکی ماڵئاوایی لە ژیان ئەکات و ئەرکی بەخێو کردنی ئەکەوێتە ئەستۆی دایکیەوە.

ساڵی ١٩٨٨ لە دوای کۆچی دوایی زانای گەورە و پایەبەرزی مەریوان، «مامۆستا سەید عەتای چۆڕی[١]»، بۆ درێژە بەو ڕێبازە لە پۆلی یەکەمی دواناوەندیدا قوتابخانە جێ دێڵێت. ڕوو لە قوتابخانە ئایینییەکەی گوندی «دەگاشێخان» ئەکات. لە خزمەت «مامۆستا ئەحمەد ڕۆستەمی» و خوالێخۆشبوو «مامۆستا ئەسعەدی شوکری[٢]»دا چۆکی شاگردی دائەدات.

دوای دوو ساڵ خوێندن لەو گوندە جانتای سەفەر لە شان ئەکات؛ بۆ فێر بوون ڕوو ئەنێتە سیاناو و دواتریش بەرەو قوتابخانە گەورەکەی بیارە ئەڕۆات. پاشان لە

---

١. یەکێ لە مامۆستایانی ئایینی پایەبەرزی ناوچەی مەریوان بوو، ساڵی ١٩٩٣ ماڵئاوایی لە ژیان کرد.

٢. مامۆستای ئایینی گوندی «بەردەڕەشە»ی مەریوان بوو، ساڵی ٢٠٠٧ لە تەمەنی ٣٩ ساڵی لە گەڵ مامۆستا مەجیدی نژمارێدا، بە ڕووداوی هاتوچۆ ماڵئاوایی لە ژیان کرد.

شارەکانی ڕەوانسەر و سنە (گوندەی ئارەنان) درێژە بە خوێندن ئەدات. دیسانەوە بۆ بیارە ئەگەڕێتەوە و دوای تەواو کردنی چەند پەرتووکێکی تر لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٣ لە ژێر دەستی مامۆستا محەممەد ئەمینی عالیدا، ئیجازەی مامۆستایی و پێش نوێژی پێئەدرێت. ئەم بەڕێزە ئێستا مامۆستای ئایینی و پێش نوێژ و وانەبێژی مزگەوتی گوندی «نەنە»یە.

کتێبەکانی موسەننیفی چۆڕی و حاجی سەید حەسەنی چۆڕی بۆ نووسین هانی ئەدەن و لە قۆناغی فەقێیەتیدا دەست بۆ پێنووس ئەبات.

**بەرهەمەکانی نووسەر:**

١ـ حاشیەی چۆڕی لە سەر کتێبی «الفرائد الجدیدة»ی سیوتی.

٢ـ وەرگێڕان و لێکۆلینەوەی کتێبی « تصریف زنجانی».

٣ـ «راز ماندگاری مذاهب».

٤ـ ئامادە کردنی پەراوێزی چۆڕی لە سەر «فناری» لە زانستی «منطق»دا.

٥ـ وەرگێڕانی لێکۆلینەوەی دەقی «فتح القریب» لە زمانی کوردییەوە بۆ سەر زمانی فارسی لە زانستی «فقە»دا.

٦ـ وەرگێڕانی لێکۆلینەوەی «منهاج الطالبین» لە زمانی کوردییەوە بۆ سەر زمانی فارسی لە زانستی «فقە»دا.

٧ـ وەرگێڕانی بەشی «حوزووری قلب لە نوێژدا» لە کتێبی «احیاء علوم الدین» بۆ سەر زمانی فارسی.

٨ـ وەرگێڕان و لێکۆلینەوەی نامیلکەی «ایسا غوجی» لە زانستی «منطق»دا.

٩ـ وەرگێڕان و لێکۆلینەوەی «تصریف زنجانی» لە زانستی «صرف»دا.

**هیوا نادری**

ساڵی١٩٧٧ ی زایینی لە مەریوان چاوی بە ژیان هەڵێناوە. خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی ١٧ی شەهریوەر، لە ژێر بۆردوومانی ڕژێمی بەعسی ئێراقدا تەواو ئەکات. هەر لەو ساڵانەدا، کاتێک لە پۆلی چوارەمدا بووە، بە هۆی بۆردوومانی شاری مەریوانەوە باوکی کۆچی دوایی ئەکات. وەک منداڵی

گەورەی بنەماڵەکەی، لە گەڵ گیر و گرفتەکانی ژیان و ئاوارەیی و دەربەدەریی بەرەوڕوو ئەبێت. خوێندنی ناوەندیشی هەر لە قوتابخانەکانی شاری مەریوان تەواو ئەکات.

بە پێی حەز و هۆگرییەکی کە بە شێعر و ئەدەبیات بوویەتی، لە سەرەتای خوێندنی دواناوەندییەوە، لە سەر ڕێنوێنی مامۆستاکانی لە بواری ئەدەبیاتدا دەست لە مل پێنووس ئەکات و بۆ درێژە پێدانی ئەو ڕێگایە ڕۆچنەیەک بەرەو ڕووی خۆی ئەکاتەوە. ئەو حەز و خواستە بوو بە هۆی ئەوەی بۆ خوێندنەوەیەکی بەرفراوانتر لە بواری ئەدەبیاتدا، ڕێگای زانکۆی تاران بگرێتەبەر.

ساڵی ٢٠٠٠ بەکالۆریۆسی ئەدەبیاتی فارسی وەرئەگرێت و پاشان ئەبێ بە مامۆستا و لە قوتابخانەکانی مەریواندا وانە ئەڵێتەوە. هاوکات لە زانکۆی ئازادی سنە قۆناغی ماستەر ئەخوێنێت.

**چالاکییەکانی نووسەر:**

١ـ ٢٠٠١ ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری ئەنجومەنی فەرهەنگی ـ ئەدەبی مەریوان، ئەنجومەنی سینفی مامۆستایانی مەریوان، ئەنجومەنی فەرهەنگی ـ هونەری ڤەژین.

٢ـ ٢٠٠٧ نوێنەری هەڵبژێردراوی NGOکان و ڕێکخراوە مەدەنییەکانی مەریوان.

٣ـ ٢٠٠٨ ئەندامی چالاکی کۆمیسیۆنی فەرهەنگی شۆرای شاری مەریوان.

٤ـ بەڕێوە بردن و بەشداری کردن لە شەوە شێعر و هەمایشەکان (ئەدەبی، فەرهەنگی، هونەری و...)

٥ـ بەشداری لە دانانی فێرگەی زمانی کوردی بۆ یەکەم جار لە زانکۆی میللی تاران و هەروەها لە ئەنجومەنی ئەدەبی مەریوان.

٦ـ چالاک لە بواری زانستی، فەرهەنگی، هونەری و کۆمەڵایەتی کە بە بەشداری کردن لە کۆبوونەوەکان و نووسینی وتار و لێکۆڵینەوەی ڕوونکەرەوە لە گۆڤارە جۆراوجۆرەکان (تیشک، ڕۆژهەڵات، زرێبار، سیروان، ئاسۆ، دیدگاه و ... ) ئاوڕی لە سەر کێشە کۆمەڵایەتییەکان داوەتەوە.

چرپەیەک،
وەنەوزی شکاوی شەقام،

ژانە ڕاچڵەکاوەکانی خۆر؛
دیسان پەنجەم دەقریشکێنێت ؛
چڕنووکی «با»
ڕوومەتی شار دەڕووشێنێت...
دیسان چرپەیەك..
چاویلکەی مێژوویەکی شکاو،
دڵی ژانێك دەخورپێنێت.
بەڵام
دیسان.. هەتا دیسان... هەتا دیسان ...
مێلۆی ڕقی هەزارساڵەم ڕاناژنرێت...

**زاهید بارخدا**

ساڵی ١٩٧٨ی زایینی لە گوندی هەنجیران هاتۆتە دنیاوە. لە بنەماڵەی سەیدەکانی هەنجیرانە و ناوی باوکی شێخ قادر و دایکی قەمەرناز خاتوونە.

خوێندنی لە زێدەکەی خۆی دەست پێ ئەکات و تا پلەی سێی ناوەندی لە شاری مەریوان درێژە پێئەدات. لە بەر نەبوونی و هەژاری واز لە خوێندن دێنێت. لە بەر ئەوەی باوکی تامەزرۆی شێعر بووە و شێعری زۆرێك لە کتێبەکانی ڕۆستەم و زۆراب، لەیلێ و مەجنوون و شیرین و فەرهادی لە بەر بووە و هەر لە منداڵییەوە بۆی خوێندۆتەوە، هەوێنی ئەو حەزەش لە بیر و مێشکی زاهیدا ئەگیرسێت. دواتر باوکی بە بۆنەی کارەساتێکەوە بۆ یەکێ لە کوڕەکانی پێش دێت وەك یەعقووبی پێغەمبەر (د.خ) بینایی چاوەکانی لە دەست ئەدات. ئەمەش کاریگەری لە سەر زاهید دائەنێت. بە هاندانی مەلا ئەحمەدی بالیکەدەر[1] کە پیاوێکی زانا و ڕۆشنبیر بووە بواری شێعرەکانی ئەگۆڕدرێت و بە

١. بالیکەدەر: گوندێکە لە سەر سنووری کوردستانی باشوور.

هەوڵی کاک عوسمانی جێماو و تێکۆشانی خۆی گوڵی هەست و شێعری بە جوانی ئەپشتووکێت و نازناوی شێعری «زاهید» بۆ خۆی هەڵئەبژێرێت. ئەم شاعیرە خاوەن دەفتەرە شێعرێکە بە شێوەی کلاسیک کە هێشتا نەکەوتۆتە نێو کتێبخانەی کوردییەوە.

**«شادی سەر قەباخی خەم»**

خۆشە دەمەو بەهاران لە ناو مێرگ و چیمەنێ
لە فیردەوسی کوردستان لە گەڵ دڵبەر بە تەنێ
تێر لە ئامێزی بگری تاکوو خەو دەیباتەوە
جار جارۆ ماچی بکەی لە خەوی ڕانەچەنێ
ئەویارە شیرینەی وا ئێستاش هەروەکوو جاران
هەموو دنیا دەهێنێ ئەو کاتەی پێدەکەنێ
ئەوەندە خۆش بوو جێژوان دەپاڕامەوە لە خوا
کە پەنجا هەزار ساڵم بداتێ بە تەمەنێ
بە خوێنی دڵ و عومری لاوێتی نازم کێشا
کە چی دەبینم ڕەقیب دەم لە ناو دەمی دەنێ
زۆر هەوڵم داوە شادی کەم بە سەر قەباخی خەم
بەڵام هەرچی سەیرم کرد هەر خەم دەروون دەتەنێ
«زاهید» کە دڵی پڕە لە عەشقی گەل و یاری
بۆ گەیشتن بە ئامانج خۆی لە دەریای خەم ئەنێ

**ماموستا ساحێب غەریبی**

ساحێب غەریبی کوڕی مەلا مەحموود هەورامی کوڕی سۆفی حسێنی خەلیفە، ساڵی ١٩٧٨ی زایینی لە گوندی «مەحموود ئاوا»ی دووڕووە سەر بە ناوچەی سەوڵاوا لە بنەماڵەیەکی ئایینی چاوی بە ژیان هەڵێناوە. دوای تێپەڕبوونی شەش مانگ بە سەر ژیانیدا بە هۆی ڕاپەڕینی گەلانی ئێران و بارودۆخی ئاڵۆزی وڵات بۆ زێدەکەی باوکی(هەورامان) ئەگەڕێتەوە. مامۆستا

مەحموودی باوکی وەک یەکێ لە شوێن کەوتووانی ڕێبازی نەقشبەندی، بە بۆنەی ئاڵۆزبوونی بارودۆخی ڕامیاری ناوچەکە لە گەڵ کۆچی شێخ عوسمانی سێڕاجەددینی هەواری ژیانی بۆ کوردستانی ئێراق ئەگوێزێتەوە.

لە پێنجساڵیدا لای باوکی خوێندنی بە قورئانی پیرۆز و کتێبە سەرەتاییەکانەوە دەست پێئەکات. بە وتەی خۆی دوو هۆکار سەرەکی زۆرتر بۆ خوێندن هانیان داوە، کە بریتین لە: یەکەم؛ لە گەڵ باوکی بۆ بەغدا ئەڕوات و لە کۆڕێکی زانستی ـ عیرفانی لەماڵی شێخ عوسمانی سێڕاجەددینی لە بەغدا بەشداری ئەکەن. دوای ئەوەی کە شێخ عوسمان دوو سورەتی قورئانی پێ ئەخوێنێتەوە ڕوو ئەکاتە باوکی و ئەڵێ «مەلا مەحموود حەتمەن مەشیۆ پی کوڕی وانی». دووهەم: هەر لەو سەفەرەدا لە بارەگای گەیلانی بە خزمەتی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس ئەگەیەن و دوای پێشکەش کردنی کتێبی «سەنا و سکاڵا» لە سەر کتێبەکە ئەنووسێ «بۆساحیب گیان، خوا بیکا بە ساحیبی عەقڵ و عیلم و عەمەڵ لە ڕێگای ئیسلامدا».

ئەم مامۆستایە لە خزمەتی ئەم کەسایەتییانەدا چۆکی فەقێیەتی داداوە و چێژی زانستی وەرگرتووە وەک: سەید حامد کەرەمی لە دووڕووە، سەید حامدی کوڕی ماموستا ئەحمەد هەر لە دووڕوە، مەلا سەلاح قادری لە نێ، مەلا عەزیزی بندۆڵی لە دەرەتفێ، مەلا خالید دەرەکێیی لە کانی دینار، ملا سەید عەبدوڵڵای هەورامی لە مەریوان، مەلا محەمەدی مل چەور لە مەریوان، مەلا یۆنس دزاوەری لە چۆڕ، مەلا عەلی هەورامی لە گۆشخانی، مەلا جەمال و مەلا باسیت لە سیاناو، مامۆستا ئیبراهیم لە زالواوی کرماشان، مامۆستا فەرهادی شکاک لە میاوقی ورمێ، مامۆستا محەممەدی بەداقی (وەک گوێگر) لە پیرانشار و لە ئاکامدا ساڵی ٢٠٠٢ لای مەلا عەبدولڕەحمانی کوڕی مەلا ئەحمەد گردک سپی لە پیرانشار بڕوانامەی زانستی وەرئەگرێت. لە گوندەکانی دووپلوورە و سێفی خوار مامۆستایەتی کردووە و ئێستاش لە گوندی نێ گیرساوەتەوە.

شێعری شاعیرانی کورد و فارس وەک: فەنایی، نالی، سەعدی و حافیز و ڕۆمانی جەک لەندەن و خوێندنەوەی بیروڕاجیاوازەکان کاریگەریان لە سەرداناوە و بیر و هەستیان بزواندووە. ئەم مامۆستایە وێڕای خزمەت لە بواری ئایینیدا، لە هەڵبەست و

شێعردا دەستێکی توانای هەیە.

هەموو کاتێ سەوزە کەپرم
بۆ ئامانجێکی پیرۆزە
بۆ ئاواتێکی ڕووناکە
بۆ بڕینی ئەم ڕێگایە، کێ نەترسە؟! کێ دڵ پاکە؟!
بۆ سەرکەوتن لەم هەورازە، کێ هاوڕازە؟!
من بە تەنیاش بێ ملی ئەشکەنجەی لارە ڕێ دەبڕم
نایەڵم لە وڵاتێکدا کە شەم ڕازی نەدرکێنێ
بیر مانگەشەو نەخنکێنێ
ڕاستی کەوێتە بستێنێ
ئاواتەکانم لە گەڵ خۆم بەمە ناو تاریکی قەبرم
چۆن ویژدانی من هەڵ گرێ
چاویلکەی بایەقوش بسڕم
نانا بە پێ هەڵدێم بە باڵ ئەفڕم
هەمووکاتێ سەوزە کەپرم تا لە وڵاتێکدا دەمرم
فریشتەی خۆشەویستی دێت
مۆمی ئیمان و نیشتمان داگرسێنێ لە سەر قەبرم

**عەبدوڵڵا ئازەری دوخت**

بیستی مارسی ساڵی ١٩٧٨ ی زایینی لە گوندی «ژان»، سەر بە ناوچەی ژاوەرۆ ئەبێ بە سێهەم منداڵی مام ڕەمەزان و فاتمە خاتوونی خێزانی.

به هۆی کۆچ و ئاوارەیی باوکییەوە، بەهاری زانستی لە کوردستانی باشوور چرۆ ئەکات و تا وەرگرتنی دیپلۆم هەر لەوێ ئەمێنێتەوە.

یەکەم بەرهەمی شێعری خۆی وەک پەرتووک لە ژێر ناوی «شێوەنەکانی کۆچێکی ئێوارەوەخت» پێشکەش بە کتێبخانەی شێعر و ئەدەبی کوردی ئەکات.
لە زۆر گۆڤار و ڕۆژنامەدا بەرهەمەکانی کردووەتە دیاری بۆ هۆگرانی ئەدەب. زۆر بابەت و نووسراوەی تری ئامادەی چاپ و بڵاو کردنەوەن کە هێشتا بۆی نەڕەخساوە بیان کات بە دیاری. وەک:

١ـ تەور و پەنجە، کۆمەڵە شێعر.
٢ـ ئەو ئافرەتانەی بەم شارەدا تێدەپەڕن ڕووتی ڕووتن، کۆمەڵە شێعر.
٣ـ پەراوێزەکانی پیاوێک، سەرنجی جۆراوجۆر.
٤ـ ڕۆژنامە دیواریی قووتابخانەکەی ئێمە، چیرۆکی بیانی.
و...

ئەم شاعیرە هەنووکە دانیشتووی مەریوانە و لە ڕێگای بیناسازییەوە بژێوی دابین ئەکات.

## فەرید پەروازە

لە دایک بووی ١٩٧٨ی زایینی گوندی «نێ»ی سەر بە شاری مەریوانە، ساڵی ١٩٨٤ وەک منداڵانی تری ئاوایی دەنرێتە خوێندنگە، سەرەڕای خوێندن، لە کاتی پشوودانی هاویناندا لە کاروباری وەرزێڕی و باخەوانیدا دەستی بەدەست باوکیەوە بووە ژیانی بە هەژاری بردۆتە سەر. لە خوێندنگەدا بە فەرمی هەتا ساڵی یەکەمی دواناوەندی دەخوێنێ و پاشان بە هۆی گیر و گرفتی ژیانەوە دەست لە خوێندن هەڵئەگرێت.

ساڵەکانی ١٩٨٩و ١٩٩٠وە بە هۆی خوێندنەوەی شێعرەکانی شیرین و فەرهاد، خورشید و خاوەر، لەیلی و مەجنوون، قەڵای خەیبەر، ڕۆستەم و زۆراب و هتد ... لە نێو بنەماڵەکەیدا (وەکوو باوی سەردەم) بە شێوەی سەرەتایی فێری خوێندنەوەی زمانی دایکی خۆی (واتە زمانی کوردی) دەبێت.

لە دوای خوێندنەوەی ئەو شێعرانە پێ دەنێتە قۆناغێکی دیکە، واتە دیوانە شێعرییەکانی مامۆستا قانع، وەلی دێوانە، ئیل بەگی جاف، پیرەمێرد و هتد ... موتاڵا دەکات. لە دوای ئەو قۆناغەش بۆخۆی هەستی شاعیرانەی تافی لاوییەتی ئەجۆشێ و

بە شێعری نوێوە دەست ئەکات بە نووسین. بەڵام هەر وەک خۆی دەڵێ بە شێعر نووسین قەناعەت ناکات و دەست ئەداتە وتار نووسین. هاوکات لە گەڵ ئەوەشدا تەنیا بە خوێندنەوەی شێعر تاسەی ناشکێ و بە ئەندام بوون لە کتێبخانەی مەریوان، کتێبخانەی خوێندنگاکان و قەرزکردنی کتێب لە دۆستان و هەڤاڵان و خوێندنەوەی بەردەوامی گۆڤارەکانی سروە، ئاوێنە، دوحەوتونامەی ئاویەر و هتد... بواری خوێندنەوەی ئەگۆڕێ. لە ساڵی ١٩٩٩ یەکەم وتاری بەناوی « ژن، ژین، ژیان» لە بڵاڤۆکی "ئەندێشە"ی ئەنجومەنی ئەدەبی مەریوان بڵاو دەبێتەوە.

بە هاوکاری چەند دۆستێکی ساڵی ١٩٩٠ « ئەنجوومەنی فەرهەنگی ئەدەبی نێ» دائەمەزرێنن.

لە چوار چێوەی ئەنجوومەندا سەرەڕای کاروباری ئەنجوومەن دەست ئەداتە وەرگێڕانی وشە، زاراوە، ناوی ڕێکخراوە سیاسیەکان و کۆکردنەوەی ئەو وشە و زاراوە کوردیانە کە لە فەرهەنگەکاندا دەگمەنن و دەست ناکەون. ناوبراو پەرتۆکێک لەو بوارەدا ئامادەی چاپ دەکات کە بە هۆی گرفتێکەوە کە بۆی پێش دێ، ئەو پەرتۆکە ئەفەوتێ. بێجگە لەو چالاکییە هەوڵی داوە لە گۆڤار و حەوتوونامەکاندا وتار بڵاو بکاتەوە. لە ماوەی شەش ساڵ چالاکی ئەنجوومەنی فەرهەنگی ئەدەبی «نێ»دا ئەندامێکی کارامە بووە و چەند خولی فێرکاری سەرەتایی زمانی کوردی بەڕێوە بردووە.

وتارەکانی لەم گۆڤار و ڕۆژنامانەدا بڵاو بوونەتەوە: ئەندێشە، زرێبار، سیروان، سروە، ڕۆژهەڵات، ئاسۆ و هەروەها چەندین وتار و وەرگێڕاو لە گۆڤارەکانی کوردستانی ئێراقدا.

## تۆفیق مورادی (ڕێبوار هەجمنەیی)

ئەم شاعیرە ناوی تۆفیقە و کوڕی ئەحمەدە ناسراو بە «ڕێبوار هەجمنەیی»، ساڵی ١٩٧٨ی زایینی لە گوندی «هەجمنە»ی مریوان چاوی بە ژیان هەڵێناوە.

خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی هەر لە هەجمنە تەواو ئەکات و لە دووهەمین بەهاری خوێندنیدا دەستی قەدەر، زۆر زوو لە گوڕ و تینی ئەچڕێنێت و ناسۆری بێ باوکی دەفتەری هیواکانی ئەدڕێنێت. بەڵام

دایکێکی ژیر ئەو بۆشاییەی بۆ پڕ دەکاتەوە؛ ورەی پێ ئەبەخشێت و بەرە و زانست هانی ئەدات و بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕووی ئەکاتە سەولاوا و مەریوان و سنە. هاوکات لە گەڵ خوێندن بەوتەی خۆی بۆ بژێوی ژیان و یارمەتیدانی باری ئابووری بنەماڵەش، ئەم ئیش و کارانەی کردووە: وەرزێڕی، کرێکاری، شوانی، کووتاڵ فرۆشی و ئێستاکەش کاربەدەستی دایەرەی بازرگانی شاری مەریوانە. هاوکاتیش لە زانکۆ خەریکی خوێندنی زمان و وێژەی فارسییە.

«ڕێبوار هەجمنەیی» هەر لە سەرەتای خوێندنەوە وەک قوتابییەکی قسەزان لە زۆر کۆڕ و کۆبوونەوەی هونەری و ئایینی و ... بە وتار و هەڵبەست یان وێژەری بەشداری کردووە و توانای خۆی نواندووە.

وەک هاو پۆلەکانی بێ بەش بووە لە زمانی زگماکی خۆی، بەڵام کورد وتەنی: ئەوین و هونەر سنووریان بۆنییە. هەر لە سەرەتای لاوییەوە بە ئەوین و سۆزی پڕماناوە چووەتە پێشوازی هونەر و بە گوێدان بە دەنگی مامۆستا حەسەن زیرەکی نەمر و خوێندنەوەی پەرتووک و دیوانی نووسەران و هۆنەرانی کوردی وەک قانع و هێمن و هەژار و هەردی و مەلەوی ... لە ساڵی ١٩٩٣دا یەکەم هەڵبەستی دائەنێ و ماوەی حەڤدە ساڵە لەم ڕێگایەدا بێ وچان خەریکی نووسینە.

**کارنامەی فەرهەنگی ئەم شاعیرە بریتییە لە:**

١- وەرگێڕانی قورئانی پیرۆز بە شێعر و هەڵبەست بۆ سەر زمانی کوردی لە دە هەزار دێڕە شێعردا کە لە ژێر چاپدایە.

٢- زیرەک نامە، ژیاننامەی حەسەن زیرەک بە شێعر ئامادەی چاپ.

٣- کوردستان‌نامە، ناوەڕۆکی شێعرەکانی بریتین لە عیرفان و ئەوین و دووری و سروشت.

٤- گوڵزاری هەجمنە، مێژو و جۆغرافیای هەجمنە بە شێعر و هەڵبەست.

لە ئاسمانی کوردستان ئەی مەریوان! تۆ هەتاوی
بۆیە سەربەرزی لە دونیا، لە بۆ وێژە بەرزە ناوی
گوڵی ئەشق و خۆشەویستی، شاری زانست و هونەر
مەڵبەندی شێرانی ژین و بۆ ئەدیبان، تیشکی چاوی

## حامد کۆنه پۆشی

حامید کۆنـه پۆشـی، بـەهـاری سـاڵی ١٩٧٨ی زایینـی لـە مـەریـوان، لە بنەمـاڵەی شـێخانی کۆنەپۆشـی چـاوی بە ژیـان هەڵێناوە. باوکی شێخ سەدرەدین و دایکی مەحبووبە خاتوونە.

ئەوەی کە لە منداڵی خـۆی لـە بیـری مابێـت بۆمبا، گولـە، ئاوارەیی و شەڕە. لە سنە خوێندنی سەرەتایی دەست پێدەکات، بەڵام شەڕ مەودای مانەوە لەوێیش ناداتە بنەماڵەکەیان و بۆیە خوێندنی سـەرەتـایی لـە ئاوارەیی ئەم دێ و ئەو دێدا درێژە پێ ئەدات.

ساڵی ١٩٩٥ لە مەریوان دیپلۆمی بیرکاری وەرئەگرێت و لە تاقیکـاری وەرگرتنـی خوێندکار بۆ زانکۆکاندا پلەی بیست وسێی بیرکـاری و یـەکـەمـی زمـانی ئینگلیـزی وەدەست دێنێت. هـەر ئـەو سـاڵە ئەبێـتە خوێنـدکاری «ئـەنـدازیاریی کۆمپیـوتەر» لـە زانکۆی «عیلم و سەنعەت»ی تاران. پاش تەواو کردنی خوێندنی ئەنـدازیاری دێتـەوە مەریوان و لە بواری کۆمپیوتێردا کار دەست پێدەکات.

لە ساڵی ٢٠٠٤ بۆ خوێندنی ماستەری « لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی» دەچێتە زانکۆی تەورێز و ئێستاش(٢٠١١) خەریکی خوێندنی دکتۆرای کۆمەڵناسی، لقی «پەرەپێـدانی ئابووری و کۆمەڵایەتی» زانکۆی تەورێزە.

**چالاکییە مەدەنی و فەرهەنگییەکانی نووسەر:**

بەڕێوەبردنی چەندین خولی فێرکردنـی نووسـین و ڕێزمـانی کـوردی، هاوکـاری لەگـەڵ بڵاڤۆک و گۆڤـارە فـەرهـەنگـی و خوێندکارییـەکانـدا، ئـەنـدامی دەسـتەی دامەزرێنەر و دەستەی بەڕێوەبەری ناوەندی زانسـتی ـ فـەرهـەنگیـی ڕۆنـان، دەبیـری ناوەندی فەرهەنگی ـ هونەریی ڤەژین، ئەندامی ئەنجومەنی ئەدەبیی مەریوان.

## شەریف مورادی

شەریف مورادی، کوڕی «محەممەد ئەمین» و «ئامینە خاتوون»، ساڵی ١٩٧٨لە شاری «مەریوان» چاوی بە ژیان هەڵێناوە و لە بـۆن و برامەی باوک بێ بەش بـووە. ئەرکی بەخێـو کردنـی وەئەسـتۆی مامیەوە بووە. خوێندنی سـەرەتایی تـا وەرگرتنـی فەوق دیپلۆم لە

مەریوان خوێندوویەتی. ساڵی ٢٠٠٦ ژیانی هاوبەشی پێکهێناوە. شەریف لە بواری شێعردا چالاکی ئەنوێنێت.

**ناسنامەی فەرهەنگی ئەم نووسەرە:**

١ـ لە ساڵی ١٩٩٧وە ئەندامی ئەنجومەنی ئەدەبی مەریوانە.

٢ـ چوار خول ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری ئەنجومەن.(دوو خول وەك بەرپرسی ئەنجومەن).

٣ـ دەستەی دامەزرێنەری ئەنجومەنی ئەدەبی هۆزانی زانکۆی پەیام نووری مەریوان.

٤ـ بەڕیوەبردنی چەند خولی فێرکاری زمانی کوردی.

٥ـ بەشداری لە چەندین فستیڤاڵی ئەدەبی لە ناو خۆ و دەرەوە.

٦ـ وەدەست هێنانی پلەی سێهەمی شێعری نوێی کوردی لە فستیڤاڵی شێعری نوێی کوردی ساڵی ٢٠٠٣ لە سنە.

٧ـ وەدەست هێنانی پلەی یەکەمی شێعری قوتابیانی پارێزگای کوردستان ساڵی ١٩٩٩.

٨ـ کۆمەڵە شێعرێکی ئامادەی چاپ.

تا تەڕ بوون ماتڵی ئێوارەم
هاوڕێ!
بڕی ئەم بارانە
هەنسکت ناکات
تۆ بۆ دەزگیرانی خۆرەتاو باشی
ئەو لە من کاڵتر
نیگات مارە دەکات.
لە ساردی خیابانێك
پەنجەکانم بەشی گووشینی گەرمیت ناکەن
لێی گەڕێ هاوڕێ، لێم گەڕێ
بۆنی با ساردیم
خشە تەنیا لە شێعرم هەڵواسێ.

قیژەی تەلەفوون بە تووڕە بوون دانامرکێ و
ئامێزی لە ئێوارەوە هەنسک ئەنێ
تەنیاییم لێزمەی لە هەرچی چەترە هەراسان دەمگووشێ
لە بەر ئەم چەخماخە
لە شێعرم دوای باران ئەنووسێ
تاتەڕبوون ماتڵی ئێوارەم
نەک لە گەڵ هەتاودا کاڵ بڕواتەوە
تۆ لە تەنیاییەوە دەست پێدەکەم و
هەنگاوێک لە ئێوارەوە دەجۆڕێنم
ئێوارەش خۆی ئەکات بە شێعرداو
زووتر لە نیگات دەمخواتەوە.
من بە ئێوارەوە گۆچ کراوم!
هەرچی کاڵە، لە ئێوارەدا دەتوێتەوە
کەس بڕی ئەم خەونە ناکات
هاوڕێ!
ڕوو لە ئێوارە باڵا نەکەی
نەک چاوەڕوانیم بتناسێتەوە و
باڵای لە بەرزی کا
هاوڕێ!
بڕی ئەم بارانە هەنسکت ناکات
بڕی هیچ بارانێک هەنسکت
هیچ بارانێک...

## ئەسکەندەر موڕادی

سپتەمبەری ساڵی ١٩٧٩ی زایینی لە بنەماڵەیەکی مام ناوەندی لە گوندی «گورگەیی» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. باوکی «محەممەد» و دایکی «عەتیە» خاتوونە. قۆناغی سەرەتایی خوێندنی لە زێدەکەی خۆی و قۆناغی ناوەندی و دوا ناوەندی لە سەولاوا ئەبڕێت و ساڵی ١٩٩٦ لە بەشی زانستی جۆگرافیادا لە زانکۆی تاران وەرئەگیرێت. بە وتەی خۆی: «هاوکات لە گەڵ خوێندنی ڕەسمی لەم بوارەدا هەستم بە بۆشاییەک لە خۆمدا دەکرد، هەر بۆیە بە تەنیا و بێ هیچ مامۆستایەک زمان و جۆگرافیا و مێژووی کوردم بە تێر و تەسەلی موتالا کرد». ساڵی ٢٠٠١ لە تاقیکاری زانکودا بەشداری ئەکات و بە پلەی سێهەمەوە سەرئەکەوێت و بە پلەی یەکەمەوە ماستەری لە بەشی «زانستی ڕامیاری و ژئۆپولەتیک» تەواو ئەکات. بڕوانامەکەشی لە سەر بابەتی «ژئۆپولەتیکی کوردستان: ڕۆڵی هێزە ناوچەیی و پەڕا ناوچەییەکان» ئەنووسێت.

یەکەمین ئەزموونی ڕۆژنامەگەری لە حەوتەنامەی سیرواندا دەست پێئەکات و دواتر لە گەڵ حەوتەنامەی ڕۆژهەڵاتدا بە نووسینی وتار هاوکاری کردووە.

بۆ تێراو بوون لە کانیاوی زانست، ساڵی ٢٠٠٥ لە تاقیکاری بۆ قۆناغیPHD بەشداری ئەکات و بە پلەی یەکەمەوە لە زانکۆی تاران لە بەشی ژیئوپولەتیک وەرئەگرێت. ساڵی ٢٠٠٨ دەرفەتی خوێندن لە «زانکۆی لاتروبی ئوسترالیا» لە ژێر چاوەدێری «پڕۆفیسۆر جوزف کامیرلی» پێئەدرێت. دوو وتار لە ژێر ناوی «ژیئوپولەتیک دژی ژیئو پولەتیک و پۆست مودێرنیزم» و «کودی ژیئوپولەتیکی ئێران» پێشکەش ئەکات و تێزی لە سەر «ژیئۆپولەتیک و گوتار» پێشکەش بە زانکۆی تاران ئەکات.

ئەم نووسەرە، بە نووسینی وتاری زانستی ـ لێکۆڵینەوە چالاکی ئەنوێنێت و بەرهەمی لەم بوارەدا دوو کتێبە کە لە ژێر چاپدایە.

## ئەیوب حەق بین

ساڵی ١٩٧٩ی زایینی لە گوندی «گاگل» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. باوکی «مام عەبدوڵڵا» و دایکی «ئامینە خاتوون»ە.

لە تەمەنی سێ ساڵی ئەیوبدا بنەماڵەکەی بۆ کوردستانی باشوور کۆچ ئەکەن و لە شاری سلێمانی قۆناغی سەرەتایی دەست پێئەکات و ئەو قۆناغە لە سلێمانی ئەبڕێت. بە هۆی باری ئاڵۆزی ئێراقەوە ساڵی ١٩٩٢ ئەگەڕێنەوە مەریوان. دوای ئەو گەڕانەوە هەلی بۆ نەڕەخساوە درێژە بە خوێندن بدات. لە ساڵی ١٩٩٤وە بە خوێندنەوەی شێعری شاعیرانی گەورە وەك: قانع، نالی، موفتی پنجوێنی، فایەق بێکەس و پیرەمێردی نەمر خولیای هەڵبەست و هۆنینەوە ئەبێت. دواتر بە بەشداری کردن لە «کۆڕی غەریبان[1]» ئەو هەستەی گەشە ئەکات و خونچەی هەست و شێعری ئەپشکوێت و نازناوی شێعری «قەرزار»ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە.

بە هەست کردن بە ئازارەکانی کۆمەڵگا و مرۆڤ دۆستی شێعرەکانی بە دوو شێوەی کلاسیك و نوێ هەڵبەستی هەیە. دەفتەرە شێعرێکی ئامادەی چاپە.

قەرزار خۆی لە گەڵ دنیای هونەر و مۆسیقادا تێکەڵ کردووە و بە دەنگی دیوان خەم ڕەوێن و شادی هێنەری بەزم و کۆڕی دۆستانییەتی.

**نموونەیەک لە شێعرەکانی قەرزار:**

**«دووری تۆ»**

لەکام وشە پاڕێمەوە کە زۆر جوان و ڕازاوە بێ
لە بۆ مناڵە شێعرێکی شەوی دووریت کەژاوە بێ
پەنا بۆ کام ڕستە بەرم وەکوو خوێنی دڵم سوور بێ
کە بۆ تاریکی بێ تۆیی هیوایەکی پڕ لە نوور بێ
لە کام شەرابی چەند ساڵە قوم لە دوای قوم بخۆمەوە
کە ئیتر باسی تۆ نەکەم شەو و ڕۆژ لە بەرخۆمەوە

---

١. کۆڕی غەریبان، کۆمەڵێک لە شاعیران و هەڵبەست وانانی مەریوانن کە شەوانی هەینی هەر حەوتەیەك بۆ خوێندنەوە و هەڵسەنگاندنی شێعر و هۆنراوەکانیان لە ماڵی یەکێکیان دائەنیشن.

گوڵدانی بەر پەنجەرەکەم یەک جار باسی تۆم لەلا کرد
خۆی دا لە شیشەکەی پاڵی و گیانی خۆی هەلا هەلا کرد
سازەکەم هێند گەڕا بە ناو ئاوازی ئاڵۆز و چڕا
هەتا دوا تاڵی پرچی خۆی ڕنیو یەک لە دوای یەک چڕا
زامەکانم کرد بە مەقام لە گەڵ ئاوازێکی نەرما
بەستەڵەک بوو دام بە بولبول ئارەقی تکان لە شەرما
ئیتر هانا بۆ کێ بەرم کە باسی دووری تۆی لا کەم
کێ ماوە کە بەم دەردەوە ئەویش وەک خۆم کەلەلا کەم
ئەمڕۆ کە بۆ عالەم جەژنە و وامنیش بە خەمی تۆوە
لە دووری بەرامەی زوڵفت ئەژنۆی خەم ئەکەم بە بۆوە
«قەرزار» بەو هیوایە بژی ئەو گوێ گری ناڵەی تۆ بێ
کە ساتێ بێتە ساقیت و چاوەکانی پیاڵەی تۆ بێ

## ڕەحمان ڕەحیمی

ساڵی ١٩٧٩ی زایینی لە گوندی «زەکریان» لە بنەماڵەیەکی مام ناوەندی چاوی بە ژیان هەڵێناوە. لە نێوان ساڵانی ١٩٩٠ـ ١٩٩١ لە زێدەکەی خۆی خوێندنی سەرەتایی تەواو ئەکات.

ساڵی ١٩٩٠ باوکی ماڵئاوایی لە ژیان ئەکات و ئەرکی بەخێوکردن و پەروەردەکردنی ئەکەوێتە ئەستۆی دایکێکی لێهاتوو کە لە گەڵ دوو برا و خوشکەکەیدا وەبەر خوێندنیان ئەنێرێت. لە بەر نەبوونی قووتابخانە لە گوندەکەی خۆی قۆناغی ناوەندی و دوا ناوەندی لە دێهاتەکانی دەوروبەر مەریوان و شاری مەریوان ئەخوێنێت و لە ساڵی ١٩٩٨ دیپلۆمی بیرکاری(ریاضی ـ فیزیک) وەرئەگرێت.

ساڵی ١٩٩٩ لە تاقیکردنەوەی کنکووردا لە بەشی کان (معدن) بۆ زانکۆی کوردستان وەرئەگیریت کە دواتر لە سەر ویستی خۆی بۆ بەشی وەرزشی ئەیگۆڕێت و ساڵی ٢٠٠٣ بڕوانامەی بەکالۆریۆسەکەی وەرئەگرێت.

حەز و خولیای فێر بوونی زۆرتر هانی ئەدات کە لە کانیاوی زانستی زانکۆدا تینوویەتی خۆی بشکێنێ. لە هەمان ساڵدا وەک قووتابیەکی سەرکەوتوو بۆ خوێندنی ماستەری زانکۆی ڕازی کرماشان وەرئەگیرێت. ساڵی ٢٠٠٥یش ئەو قۆناغە سەرکەوتوانە ئەبڕێت. هەر لە قۆناغی ماستەردا دەست لە مل پێنووس دەکات و گۆڤارە زانستییەکانی وڵات و دەرووەی وڵات ئەبڕێ و وتارەکانی لە بڵاڤۆکە نێونەتەوەیەکاندا وەک: ISI و SIRCCanada «ایندکس بەوون» چاپ و بڵاو ئەکاتەوە.

لە ساڵی ٢٠٠٤ تا ساڵی ٢٠٠٦ بە شێوەی کاتی لە بەشی وەرزشی زانکۆی کوردستاندا وانە ئەڵێتەوە. ئەم نووسەرە ئێستا ئەندامی زانستیی زانکۆی ئازادی مەهابادە و هاوکاتیش قووتابی دوکتورای بەشی فیزیۆلۆژی وەرزشی (PhD) زانکۆی گیلانە.

ڕەحمان ڕەحیمی تا ئێستا زیاتر لە پانزە وتاری لە گۆڤارە زانستییەکانی ناوخۆو دەرەوەی وڵاتدا بە چاپ گەیاندووە و لە کۆنفرانسە نێونەتەوەییەکانیشدا وتاری پێشکەش کردووە.

**سەلام قادری**

ساڵی ١٩٧٩ ی زایینی لە مەریوان چاوی بە ژیان هەڵێناوە. ساڵی ١٩٨٥ بە بۆنەی شەڕی ئێران و ئێراق و هەروەها شەڕی ناوخۆوە شار بە جێدێڵن و ئاوارە ئەبن. چوار ساڵی سەرەتایی لە دەربەدەری دا ئەخوێنێت. لە دوای تەواو بوونی شەڕ بنەماڵەکەیان بۆ شاری مەریوان ئەگەڕێتەوە و تا وەرگرتنی دیپلۆم درێژە بە خوێندن ئەدات.

بارودۆخی شەڕ و دەربەدەری و ئاوارەیی لە گەڵ لە ناو چوونی مامەیەکیدا، کاریگەرییەکی زۆری لە سەر دائەنێن و لە قۆناغی دواناوەندیدا پەنا بۆ نووسین ئەبات و هەر لەو سەردەمەدا یەکەم بەرهەمی خۆی شانۆنامەیەک لە ژێر کاریگەری شێعرێکی مێهدی ئەخەوانی سالس بە نێوی «مەشخەڵی کوژاوەم» ئەنووسێت.

ساڵی ٢٠٠٢ یەکەم پەرتووکی خۆی وەک کۆمەڵە شێعر لە ژێر ناوی «من برادەر خانە گومانم» چاپ و بڵاو ئەکاتەوە. ساڵی دواتر، دووهەمین بەرهەمی خۆی کۆمەڵە

شێعرێک لە ژێر ناوی «دەسە و پارە» پێشکەش بە دنیای منداڵان ئەکات. ساڵی ٢٠١١سێهەم بەرهەمی بە نێوی «ئینسان ناوی نەخۆشینێکی تازەیە» چاپ و بڵاو ئەکاتەوە. بە نووسینی شێعر لە گەڵ ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان وەک زرێبار، سەردەم و سیروان هاوکاری ئەکات.

لە ساڵی ٢٠٠٥ وە تا ئێستا (٢٠١١) چەندین شانۆنامە ئەنووسێت وەک: ئوکسیژنێک بۆ مەرگ، هیتر، لارشا، ماسی گرتن لە وشکێنیدا، ڕۆئیا و ڕەوشەنەک، مەزنوون، کە لە وانە «ئوکسیژنێک بۆ مەرگ» لە شارەکانی مەریوان و سنە و سقز و ... پیشان ئەدرێت.

وەرگێڕانی شانۆنامەگەلی «ڕۆژی نوێ، مەینەتی نوێ» و « دیسان بەزمەکەی جاران» لە نووسینی نووسەری گەورە «داریوو فۆم» بۆ سەر زمانی کوردی لە بەرهەمەکانی ئەم نووسەرەن. ناو براو ئێستا دانیشتووی شاری مەریوانە و پیشە و کاری ئازادی هەیە.

## مەستوورە خوسرەوانی

مەستوورە پاییزی وەک دەروازەی هاتنە ژوورەوەی هەواری ژیان هەڵبژارد. لە وەرزی پاییزی ساڵی١٩٧٩ی زایینیدا ئاوایی «باشماخ»ی وەک هەوەڵین دیمەنی ژین چاو پێکەوت.

بە هۆی شەڕی ئێران وعێراقەوە هەر ساڵەی لە گوندێک خوێندوویەتی. لە ئاکامی ئاوارەیی و دەربەدەری لە گەڵ بنەماڵکەیاندا نیشتەجێی شاری مەریوان بوون. پێش دەست پێکردنی قوتابخانە لە لایەن باوکیەوە فێری نووسین و خوێندنەوە ئەبێ. بە وتەی خۆی یەکەم جار کە دەستی برد بۆ پێنووس و کتێب، ئەو کاتە بوو کە بە هۆی کارەساتێکەوە لە بنەماڵەکەیان ون ئەبێت و ئەوماڵەی کە ئەیدۆزنەوە، یەکەم کەس بوون کە پێنووس و قامکەکانی دەستی بە یەک ئەناسێنن.

نووسین و خوێندنەوەی کوردی لە پۆلی چوارەمی دواناوەندییەوە بە نووسینی شێعرەوە دەست پێئەکات و یەکەم بەرهەمی شێعر لە ژێرناوی « فرمێسکی کانیاو» بڵاو کردووەتەوە.

مەستوورە ئێستا خوێندکاری بەشی کارگێڕی بازەرگانی زانکۆی ئازادی سنەیە و لە شاری مەریوانیش نیشتەجێیە.

## عەدنان داستوار

عەدنان داستوار ساڵی ۱۹۸۰ی زایینی لە گوندی «کاڵی ژوورو»ی مەریوان لە دایک بووە. باوکی عەبدوڵڵا و فەرمانبەری «دایەرەی حەج و ئەوقاف» و دایکی شنۆ خاتوونی ناوە. دوو ساڵی خوێندنی سەرەتایی بە بۆنەی ئاوارەیی و شەڕی ئێران و عێراق لە گوندی «کەڵکەجان» و درێژەی خوێندنی تا ساڵی ۲۰۰۰ لە مەریوان بووە. هەر لەو ساڵەدا لە زانکۆی پەروەردەی مامۆستایانی «تەورێز» درێژە بە خوێندن ئەدات و دوو ساڵ دواتر لە سنە بەکالۆریۆسی جۆگرافیا وەرئەگرێت و وەک مامۆستا لە ئاواییەکانی ناوچەی سەوڵاوادا خزمەت بە منداڵان ئەکات.

جوانی و ڕازاوەیی دەشت و کۆیستانی وڵات ڕایکێشاوە بۆ پاراستنی ژینگە و لە ساڵی ۲۰۰۳وە لە ئەنجومەنی سەوزی چیا خەریکی چالاکییە. ئێستەش یەکێک لە ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەری «چیا»یە. هاوکات یەکێ لە دەستەی نووسەرانی بڵاڤۆکی چیایە[1].

## ئەحمەد محەممەدی

کوڕی مەجید و دایکی شەمسە خاتوونە. ساڵی ۱۹۸۰ی زایینی لە ئاوایی قوڵقوڵەی مەریوان لە دایک بووە. خوێندنی لە شاری مەریوان دەست پێکردووە و هاوکات لە گەڵ خوێندنی قوتابخانە، ساڵی ۲۰۰۰ بڕوانامەی ئایینیشی لە لایەن ناوەندی گەورەی ئیسلامی (مرکز بزرگ اسلامی) سنەوە پێدراوە. لە هەمان ساڵدا بڕوانامەی مەلایەتیشی لە خزمەت مەلا محەممەدی

---

۱. بڵاڤۆکی ئەنجومەنی سەوزی چیایە، کە لە لایەن ئەو ئەنجومەنەوە بە شێوی کاتی دەرئەچێ.

شێخەلئیسلامی بانەای وەرگرتووە. سەرەتا بەکالۆریۆسی ئیلاهیاتی لە کۆلیژی ئیلاهیاتی زانکۆی تاران تەواو کردووە و دواتریش هەر لەوێ پلەی ماستەری زمان و ئەدەبی عەربی بڕیوە. ماوەی پێنج ساڵ مامۆستای زمانی فارسی لە قوتابخانەکانی شاری مەریوان بووە.

بە وتەی خۆی هیچ هاندەرێکی نەبووە بەڵکو هەست وحەزیکی بەرفراوانی دەروونی بە نیسبەت نووسینەوە هەبووە و ئەڵێ: «لە بواری نوسینی شێعرەکانمدا هەستێکی دەروونی هەڵقوڵانی شێعرەکانم هان ئەدات هەر بۆیە زۆرینەی شێعرکانیشم باس لە خۆشەویستی بێ بناخەم دەکەن. شایانی باسە ئەوینی ئاسمانی من و نیشتمان لە شێعرەکان و لە ژیانمدا لە کەس شاراوە نیە. نووسینەکانم بوارێکی تایبەتیان لە خۆ نەگرتووە. بەتایبەت وەرگێڕاوەکانم هەرکات کتێبێک یان نوسراوەیەکی باشم دیبێت وەرم گێڕاوەتەوە.» ئەحمەد محەممەدی هاوکاری ئەنجومەنی فەرهەنگی ـ ئەدەبی مەریوان و ماوەیەکیش ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەرایەتی کانونی ڤەژینی مەریوان بووە. لە گەڵ حەوتە نامەکانی سیروان، ئاوێەر، سۆران و نیشتمان بە وتار هاوکاری کردووە. ئەم نووسەرە زیاتر لە دە بەرهەمی لە بواری نوسین و وەرگێڕاندا ئامادەی چاپە.

**وێنەیەک لە شێعری منداڵان:**

بەیانیان کاتی سەحەر
بۆخۆم هەڵ ئەستم لە خەو
پشتی ڕەشی ئەشکێنم
دەس و چاوم ئەشۆرم
مسواک ئەدەم دەم و دیان
تێروپڕ ناشتا دەخۆم
بیرو هۆشم لە سەرە
لاوێ ژێر و نەجیبم
لای مامۆستا بتوانم

پێش ئەوەی خۆر بێتەدەر
شەقێک هەڵ ئەدەم لە شەو
تا ڕووناکی بنوێنم
بەرگەکانم ئەگۆڕم
دڵشاد ئەکەم ڕۆح و گیان
ئەوسا بۆ مەکتەب ئەڕۆم
دەرسەکانم لە بەرە
خوا بیکات بە نەسیبم
پرسیارەکان بزانم

پەروەردەی قوتابخـــــانەم دوا ڕۆژی ئەم جیهـــــانەم
گرتـــومەتە نێـــو دەســـتان ئاســوی ڕوونــی کوردســتان

**محەممەد کەریمی**

حەمەی کەریمی سـاڵی ١٩٨٠ی زایینـی لە بنەمـالەیەکی هەژار و دەستکورت لـە گونـدی هەنجمـنە چـاوی بە ژیـان هەڵێناوە. باوکی ئەحمەد و دایکی فەریدە خـاتوونە. قۆنـاغی سەرەتایی لە گوندەکەی خۆی و ناوەنـدی و دوا ناوەنـدیش لە شـاری مەریـوان تەواو کـردووە. سـاڵی ٢٠٠١ لە زانکـۆی تـاران بەکالۆریۆســی ئیلاهیـات و زانـستە ئیـسلامیەکانی وەرگرتووە. ئەم نووسەرە سەبارەت بە هاندەری لە خوێندندا ئەڵێت: «لە ڕاستیدا هـیچ کەسێك هاندەری من نەبووە، بە داخەوە بە هۆی ئەو بارودۆخە ئەبستراك و جمودە فکرییە کە بە سەر گوندەکەماندا سەپابوو ـ بە داخەوە تا ئێستاشی لە گەڵ بێ ـ بە هۆی باری ئـابووریی کە منـداڵان و گەنجـانی تازەپێگەیـشتووی بەرەو ئۆردوگـای کـاری زۆرەکی بۆ شارەکان ڕادەکێشن بگرە بنەماڵەکەی منیش وەکوو دیکەی خەڵکەکەیتر موخالفی خوێندن من بوون».

ئەم شاعیرە سـاڵی ٢٠١٠ یەکەم کـۆمەڵە شـێعری بە نێـوی «ئـاوابوونی ژیـان» بـڵاو کردۆتەوە.

محەممەد یەکێ لە ئەندامانی چالاکی ئەنجوومەنی پێشانگای مـاف، ئەنجـومەنی فەرهەنگی ئەدەبیی مەریوان و «ئەنجومەنی زانستی ـ فەرهەنگی ڕۆنـان»ە کە چەنـدین خولی فێرکاری بۆ ئاگاکردنەوەی خەڵکی گوندەکانی سەرسـنوور لە مەترسـییەکانی مین لە ژێر ناوی «من و مین» و خولی فێرکاری زمانی کوردی لە مەریوان و سـەوڵاوا و گوندەکانی دەوروبەر بەڕێوە بردووە. ماوەی سێ ساڵ بەرپرسی قوتابخانەی ئـاوایی هەجمنە بووە. ئەم ڕەخنەگرە بە نوسینی وتـار و شـێعر لـە گـەڵ بڵاڤۆکەکـانی سروە، زرێبـار، ڕوانـگە، مەهابـاد، تـریفە، چیـا، ئاسـۆ، ڕۆژهەڵات، نیـشتمان و دیـارکهن دا هاوکاری کردووە.

## عەدنان حەسەن پوور[1]

ڕێکەوتی ٢٥ی مانگی یەکەمی ساڵی ١٩٨١ی زایینی لە مەریوان لە دایک بووە. ناوی باوکی مەحموود و ناوی دایکی ئایشێ خاتوونە. لە سەرەتاییەوە تا کۆتایی قۆناغی دواناوەندی لە مەریوان خوێندوویەتی. ئەم نووسەرە هەر لە سەرەتای تەمەنی لاویەتییەوە لە گەڵ وێژەی کوردی هۆگری پەیدا ئەکات. ساڵی ٢٠٠١ وەک یەکێک لە ئەندامانی بەڕێوەبەرایەتی ئەنجومەنی فەرهەنگی ـ ئەدەبی مەریوان هەڵئەبژێردرێت. ئەبێتە بەرپرسی گۆڤاری «ڕەوت» کە بڵاوکراوەی ئەم ئەنجومەنە بووە. هاوکات لە بەڕێوەبەرانی وەرزنامەی ڕاڤە بووە ـ وەرزنامەی خوێندکارە کوردەکانی زانستگای تاران ـ ئەم نووسەرە لە چەندین کۆبوونەوە و کۆنگرەی فەرهەنگی و ئەدەبیدا، وەک کۆنگرەی بێسارانی(١٩٩٦)، کۆنگرەی ناری(١٩٩٨)، کۆنگرەی قانع(٢٠٠٠) و ... بەشداری چالاکانەی بووە. ساڵی ٢٠٠٤ ئەبێتە ئەندامی دەستەی نووسەرانی حەوتەنامەی ئاسۆ. عەدنان حەسەن پوور زۆر وتار و بابەتی لە گۆڤار و حەوتەنامە کوردییەکانی ئێران و کوردستانی باشووردا بڵاوکردۆتەوە. وەک کتێب پێویستە ئاماژە بکەین بە وەرگێڕانی «داهاتووی ئازادی» لە نووسینی فەرید زەکەریا، بۆ سەر زمانی کوردی کە هێشتا لە چاپ نەدراوە.

## عیرفان حسێنی

عیرفان حسێنی، ساڵی ١٩٨١ی زایینی لە گەڕەکی لەیلاخی مەریوان، چاوی بەژیان هەڵێناوە. باوکی «سەید مەحێدین» و دایکی «نەهیە خاتوون»ە. بە هۆی شەڕی ئێران و عێراقەوە، خوێندنی لە قوتابخانەی ئاوایی «نێ» دەست پێکردووە و تا وەرگرتنی دیپلۆم لە مەریوان بووە. ساڵی ٢٠٠٠ لە کۆلیژی زمان و ئەدەبی عەرەبی « زانکۆی ئەراک» وەرگیراوە. بە هاوکاری چەند خوێندکارێکی تری کوردی ئەو زانکۆیە، گۆڤاری کوردی ـ فارسی «تریفە»بڵاو

---

١. ئەم زانیارییە «کاک عیرفان حەسەن پوور» دەسی خستم کە جێگای ڕێز و پێزانینە.

دەکەنەوە. پاش دوو ساڵ کانوونی فەرهەنگی ـ هونەری «پێنگاف»ی زانکۆی ئەراک دائەمەزرێنن. هەر وەها لە دەورانی خوێندکاریدا جگە لەو چالاکیانە، لەگەڵ گۆڤارەکانی «دریچەی حضور، نسل سوم و اهالی امروز» هاوکاری کردووە.

پاش تەواو کردنی زانکۆ گەڕاوەتەوە بۆ شاری مەریوان و دەستی لە چالاکی مەدەنی و فەرهەنگی بەرنەداوە و یەکێ لە ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەری ناوەندی کولتوری هونەری «ڤەژین» بووە. هەر لەو ساڵانەدا لە گەڵ کۆمەڵێک لە لاوانی ئاوایەکانی دەوروبەری زرێبار و شاری مەریوان «ئەنجومەنی سەوزی چیا» دائەمەزرێنن. لە سەرەتای دەرچوونی بڵاڤۆکی «چیا»وە وەک دەستەی نووسەران هاوکاری کردووە.

## فەریدە محەممەدی (نارین)

نازناوی ئەم شاعیرە «نارین»ە. ساڵی **١٩٨٣**ی زایینی لە مەریوان لە دایک بووە. قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی و دوا ناوەندی هەر لەو شارەدا تەواو دەکات. ساڵی **٢٠٠٤** لە بەشی هونەرەجوانەکانی زانکۆی شاری سنە دوایین خشتی خانووی خوێندنی دادەنێت.

لە دوو خولی فستیڤاڵی گەنجانی ڕۆژ ئاوای ئێران لە بەشی شێوەکاری و تەڕاحی پلەی سێهەم وەدەست دێنێت. ساڵی **٢٠٠٥** یەکەم بەرهەمی خۆی وەک کۆمەڵە شێعرێک بە زمانی فارسی، لە ژێر ناوی «سکوت خاکستری»(خامۆشیی خۆڵەمێشی) دەکاتە پێناسەی ژیانی ئەدەبی خۆی و پێدەنێتە بازنەی نووسەرانی ئەدەبیی کوردییەوە.

نارین بۆ ماوەیەک ئەندامی ڕێکخراوی ژنانی مەریوان بووە و لە بواری نووسین و وێنەگرتن چالاکی هەبووە. بۆ ماوەیەکیش مامۆستای «ناوەندی پەروەردی فکری منداڵان و مێرمنداڵان» لە سنە بووە.

ئێستاکە وەک چالاکی مافی مرۆڤ و ڕۆژنامەوانی سەربەخۆ کاری نووسین و لێکۆڵینەوە دەکات و خەریکی نووسینی کۆمەڵە چیرۆکێکە لە ژێر ناوی «ژانی بوون» و هەروەها کاری وێنەکێشانیشی لە سەر تەوەری تۆلرانس لە کۆمەڵگای کوردیدا بەدەستەوەیە.

## سۆران حەیدەری

له یه‌کەم ڕۆژی وەرزی بەهاری ساڵی ١٩٨٣ی زایینی له مەریوان له دایک بووه. له قۆناغی سەرەتاییەوه تا تەواو کردنی دواناوەندی هەر له مەریوان خوێندوویەتی.

له پەنای دەرس خوێندنیدا گرینگییه‌کی تایبەتی بە وەرزش داوه و توانیویەتی چەندین پلەی باش له کێبەرکێ کانی وڵاتدا له کارنامەی خۆیدا تۆمار بکات. ساڵی ٢٠٠١ بە هۆی پێشهاتێکی بنەماڵەکەیەوه دەست له خوێندن بەرئەدات. بەڵام چەند مامۆستا و چەند هەڤاڵێکی دڵسۆزی ورەی پێئەبەخشن و له ماوەی چل و پێنج ڕۆژ دەرس خوێندن، له تاقی کردنەوەی زانکۆی ئەو ساڵەدا له بەشی وەرزش (تربیت بدنی) سەر ئەکەوێت. بۆ درێژەدان بە خوێندن ئەچێته زانکۆی تەورێز.

ساڵی ٢٠٠٥ بۆ خوێندنی ماستەر له بەشی خەسارناسی و جووڵەکانی چاکسازی (آسیب شناسی و حرکات اصلاحی) بە پلەی یەکەم له زانکۆی ڕازی کرماشان وەرئەگیرێت.

ئەم لاوە بە توانا ولێهاتووە ئەڵێ: «ئەم دوو ساڵەی دوایی خوێندنم، بە گوڕو تینێکی وەها لێبڕانەوە بوو، کە له چەندین کۆڕ و کۆبوونەوەی ناوخۆ و دەرەوەی وڵاتدا چالاکی باشم نواند؛ بۆ پێشکەش کردنی وتار له بیست و چوارەمین کۆبوونەوەی نێونەتەوەیی وەرزشی بۆ بانکۆکی پایتەختی وڵاتی تایلەند بانگهێشت کرام.

ئەم نووسەرە ئێستا له شارەکانی سنە، مەریوان، مامۆستای زانکۆ و قوتابخانەکانە. بەرهەمی ڕەنج و تێکۆشانی ئەم نووسەرە بە هاوکاری چەند کەسێکی تر، کتێبێکە له ژێر ناوی «دایره المعارف، اختلالات و آسیب های ورزشی» کە چاپ و بڵاو بووەتەوە.

## ناسرخاوەری

کوڕی «موستەفا» و «عەینا» خاتوونە. له بنەڕەتدا خەڵکی گوندی «بایەوە»ی مەریوانە بەڵام له کاتی ئاوارەیی شەڕی نێوان ئێراق و ئێراندا، ساڵی ١٩٨٣ی زایینی له بنەماڵەیەکی ئایینی له شاری سنە چاوی بە ژیان هەڵێناوە.

قۆناغەکانی خوێندنی تا وەرگرتنی دیپلۆم لە بواری زانستە مرۆییەکاندا لە مەریوان خوێندوویەتی. ئەم نووسەرە یەکێ لە چالاکانی بواری فەرهەنگی مەریـوانە و وەک نووسین ئەم کتێبانەی بە زمانی فارسی لە ژێر چاپدایە:

- سیاه دانه، دانەی شفا بخش.
- سیواک از منظر اسلام و طب.
- جلوەهایی از فن بدیع در آیات قرآن.
- معجزات علمی در قرآن و سنت.
- اعجاز علمی در چند آیه ی قرآن.
- نمونه هایی از اعجاز علمی در سنت پیامبر.

**هادی ڕەحمان زادە**

هادی ڕەحمانزادە، ساڵی ۱۹۸۳ی زایینی لە مەریوان چاوی بە ژیـان هەڵێنـاوە. بـاوکی محەمـەد سـادق و دایکـی «کولسوم»خاتوونە. تا وەرگرتنی دیپلۆم لە مەریوان خوێندویەتی. بەکالۆریۆسـی کتێبـداری و ڕاگـەیانـدنی لە زانکـۆی تـەورێـز وەرگرتووە و ماستەری لە بواری «پێوەندییەکان» (ارتباطـات) لـە زانکـۆی عـەللامـەی تـاران تەواو کـردووە. ئێـستا، دانیـشتووی سـنە و کارمـەنـدی کتێبخانەی گشتی ناوەندی ئەو شارەیە.

**چالاکییەکان:**

۱ـ ئەندامی ئەنجومەنی فەرهەنگی ـ ئەدەبیی مەریوان.

۲ـ ئەندامی ناوەندی زانستی ـ فەرهەنگیی ڕۆنان.

۳ـ دەستەی بەڕێوەبەری ئەنجومەنی فەرهەنگی ـ ئەدەبیی مەریوان.

۴ـ بەرپرسی کومیتەی شێعری ئەنجومەنی فەرهەنگی ـ ئەدەبیی مەریوان.

۵ـ بەڕێوەبردنی خولی فێرکاریی زمانی کوردی لە مەریوان و زانستگاکانی ئێـران وەک مامۆستا.

۶ـ بەڕێوەبردنی خولی فێرکاریی ڕۆژنامەوانی لە ناوەندی زانستی ـ فەرهەنگی ڕۆنان.

٧- بەڕێوەبردنی کارگەی شێعر لە ئەنجومەنی فەرهەنگی - ئەدەبیی مەریوان.
٩- سەرنووسەری دووحەوتەنامەی خوێندکاریی ڕۆژەڤ، (زانکۆی تەورێز).
١٠- بڵاوکردنەوەی بابەتگەلی شێعر، چیرۆک، وتوویژ و لێکۆڵینەوە لە حەوتەنامەکانی سیروان، ئاسۆ، گۆڤاری سروە و زرێبار.
١١- بەشداری لە خولی هەشتەمی فستیڤاڵی گەلاوێژ (٢٠٠٤) لە سلێمانی و هەڵبژاردنی شێعری «نەهیچ زمانێک لەئەشقتان فێر» بۆ بەشی کێبەرکێی فستیڤاڵ و...

**ئیرەج قادری**

ئیرەج قادری، پانزەی سپتەمبەری ساڵی ١٩٨٤ی زایینی لە گەڕەکی لەیلاخی مەریوان لە دایک بووە. باوکی «حەسەن جۆشکار» و دایکی «عەینا خاتوون»ە. ساڵەکانی پێش خوێندن و قوتابخانەی بە بۆنەی شەڕی ئێراق و ئێرانەوە تەژی بووە لە گەڵ ئاوارەیی و دەربەدەری. سەرەتای ئاشنا بوونی پەنجەکانی لە گەڵ پێنووس و پیت تا وەرگرتنی دیپلۆم لە ساڵی ٢٠٠٢ لە شاری مەریوان خوێندوویەتی. ساڵی ٢٠٠٢ دا لە کۆلیژی وەرزشی زانکۆی تەورێز وەرئەگیرێت. ساڵی ٢٠٠٨ لە زانکۆی ئیسفەهان ماستەری هەمان بوار تەواو ئەکات.

وەک کاری فەرهەنگی، لە گەڵ گۆڤارگەلی «بڕیار» لە تەورێز، «چیا» لە ئیسفەهان و «تریفە» لە ئەراک وتاری پێشکەش کردووە. لە کانوونی «زاگرۆس»ی تەورێز وەکوو دەستەی دامەزرێنەر چالاکی نواندووە. خۆشەویستی زێدەکەی و هەست بە پێویستی پاراستنی ژینگە، هانیداوە، بە هاوکاری ئازیزانێکی‌تر ئەو بیرۆکەیەی کە پێشتر داڕێژا بوو، بۆ دامەزراندنی بە شێوەی فەرمی هەوڵی بۆ بدەن. هەر بۆیە وەکوو ئاخرین دەستەی دامەزرێنەری فەرمی چیا هاتووەتە نێو مەیدانی چالاکی ژینگەپارێزییەوە. ئێستەش وەک دەستەی بەڕێوەبەری خولی دووەمی «ئەنجومەنی سەوزی چیا» کار ئەکات و لە دەسپێکی بڵاڤۆکی «چیا» وەک دەستەی نووسەران خەریکی چالاکییە.

## شلێر زەمانی

لە سەرەتای هاوینی ساڵی ١٩٨٤ی زایینی لە گوندی «قەڵاجێ» لە دایک بووە. قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی هەر لەگوندەکەی خۆی و دواناوەندیشی لە شاری مەریوان تەواو کردووە. ناوبراو توانایی خۆی بە نووسینەکانی سەردەمی خوێندنی دەرئەخات و مامۆستایانی دڵسۆزیش هانی دەدەن و ورەی پێ ئەبەخشن. لە کێبەرکێی نووسین لە ناو هاوپۆلانیدا وەک یەکەم قوتابی قوتابخانەکەی ئەناسرێت و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ گەشە ئەکات. لە پۆلی دووهەمی دواناوەندیدا یەکەم بەرهەمی خۆی وەک کتێب لە ژێر ناوی « جوانان، چگونە و چرا؟» ( لاوەکان چۆن و بۆ چی؟) بڵاو دەکاتەوە. ئێستاش کتێبێکی لە ژێر ناوی «زمانی چشمان آسمان نیز برای مان خون گریه کرد» (زەمەنێک چاوەکانی ئاسمانیش فرمێسکی خوێنینی بۆمان هەڵڕشت) ئامادەی چاپە.

## کاروان شیخولئیسلامی (کارۆ)

سەرەتای هاوینی ١٩٨٤ی زایینی لە «مەریوان» لە دایک بووە. لە قۆناخی دواناوەندیدا لە خوێندن دابڕاوە و دوای ماوەیەک دابڕان چووەتە سلێمانی و لەوێ بە خوێندنی شەشەمی دوا ناوەندی، ئەم قۆناغەی تەواو کردووە. ماوەی ساڵ و نیوێک لە زانکۆی سلێمانی درێژەی بە خوێندن داوە و دواتر گەڕاوەتەوە بۆ ئێران.

ساڵی دووهەمی دواناوەندی پلەی پێنجەمی چیرۆک نووسی لە ناو بەشداربووانی هاوتەمەن لە سەرانسەری ئێران وەدەست هێناوە. ساڵی سێهەمی ناوەندی پلەی یەکەمی لە شێعردا لە نێو قوتابخانەکانی کوردستان وەرگرتووە. بە کورتە چیرۆکی «جگەرەیەک تا مەرگ» لە فستیڤاڵی نۆیەمی گەلاوێژی سلێمانی بەشداری کرد. هەر لە سلێمانی گۆڤارێکی بەناوی «تروسکەی ڕاز» دامەزراند و تا ژمارەی سێی لێ بڵاو بووەوە کە دواتر بەهۆی گەڕانەوەی بۆ ئێران درێژەی پێ نەدرا.

لەگەڵ ڕۆژنامەکانی ئاسۆ، هاووڵاتی، چاوەدێر و چەندین گۆڤار و ڕۆژنامەی

دیکە هاوکاری کردووە و بابەتی بۆ نووسیون.

**بەرهەمەکانی ئەم نووسەرە:**

١ـ «پاڕانەوەی هاوار»، کۆمەڵە شێعر.

٢ـ «دوایین ڕازەکانی ژیان»، وەرگێڕان، لە نووسینی « ئەندریۆ متیۆس» بابەتێکی دەروونناسی و کۆمەڵناسییە.

٣ـ «جگەرەیەک تا مەرگ» کۆمەڵە چیرۆک، ٢٠٠٧.

٤ـ «نامۆ و تەنیا» وەرگێڕانی ڕۆمان لە نووسینی « ژاکلین سۆزان» لە ژێر چاپ دایە.

٥ـ «شاراوەکانی شار»، « تۆ شێتی» دوو بەرهەمی کۆمەڵناسی و دەروونناسی کە بە زمانی چیرۆک و وتار لە دەستی نووسین دایە.

**کەیوان جامخانە**

ساڵی ١٩٨٤ی زایینی لە گوندی «سەڵەسی» مەریوان لە دایک بووە. باوکی «حسێن» خەڵکی ئاوایی «شاسوار» سەر بە ناوچەی سەرشیوی مەریوان و دایکی «لەیلێ» خەڵکی ئاوایی سەڵەسی یە. تا تەمەنی پێنج ساڵی، بە هۆی ئاوارە بوونەوە، لە ئاوایییەکانی شاسوار و سەڵەسی ژیاوە و پاشان لە شاری مە-ریوان نیشتەجێ بووە. تا تەواوکردنی قۆناغی دواناوەندی لە مەریوان دەرسی خوێندووە. ساڵی ٢٠٠٤ خوێندنی زانکۆی لە سنە دەست پێئەکات و ساڵی ٢٠٠٨ لە بەشی زانستی پەروەردەدا بەکالۆریۆسی وەرگرتووە. ساڵی ٢٠٠٩ لە کێبەرکێی زانکۆدا بەشداری کردۆتەوە و هەنووکەش لە هەمان زانکۆ خەریکی خوێندنی ماستەرە لە بەشی گەلاڵەداڕژانی پەروەردەدا. کەیوان هەست و سۆزی خۆی بە شێعر ئەهۆنێتەوە و نازناوی شێعری «زرێبار»ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە.

ئەم شاعیرە ئەڵێت: «ئەوەی کە منی بۆ لای شێعر و ئەدەبی کوردی هاندا، ملوانکەی شینی مامۆستا شەریف بوو کە بە منداڵی ئاواتم ئەخواست ڕۆژێک بە تەنیایی بیخوێنمەوە. بە ڕێکەوت ساڵی ٢٠٠٤ لە زانکۆی کوردستان چاوم بە مامۆستا شەریف کەوت. هەر ئەو ڕۆژە چوومەماڵیان و بۆ هەمیشە لە ماڵی شێعردا بووم بە میوان. تەنیا دونیایەکی کە من ئەتوانم بە ئازادی تێیدا بژیم و خاوەنی هە-

مووشتێك بم، دنیای شێعره. دونیایه‌ك كه به زمانی دایكیم تێیدا قسه بكه‌م و هه‌موو ده‌رده‌كانمی پێ ته‌رخان كه‌م».

«حه‌سره‌ت»

وام له حه‌سره‌ت شه‌وگارێكا
پێكه‌نینت
وه‌ك ئاهه‌نگی بێتهۆوێنی ئه‌ڵمانیایی
ده‌ریای دڵم
خه‌و لێ بخات
په‌نجه‌كانم تا به‌یانی له ناو قژتا
سێ تارێ بێ و
تار لێ بدات
چه‌ن حه‌ز ده‌كه‌م
تابلۆیه‌كی پڕ له ڕازی ئه‌وین ده‌بووی
وه‌ك «پیكاسۆ»
هه‌ر به‌و چه‌شنه‌ی خۆم حه‌ز ده‌كه‌م
بتنه‌خشێنم
شیعرێكی تازه بوویتایه
پڕ له ماچی دڵداره‌كان
بمبه «دانته»
بمبه «گۆته»
یان به «شێركۆ»
بتخولقێنم
به‌و ئاواته‌م له خۆشترین هۆنراوه‌كانی جیهاندا
تۆ په‌یداكه‌م
به ده‌نگی«ماملێ» و «زیره‌ك»
شه‌وی ته‌نیایی بتخوێنم...

**هەورامان بەهرامی**

هەورامان بەهرامی لە دایکبووی ساڵی ١٩٨٤ی زایینی هەورامانی تەختە. باوکی حامد خەڵکی هەورامان و دایکی خاتوو پەخشان خەڵکی هانەگەرمەڵەیە.

خوێندنی سەرەتایی لە قەڵاجێ دەست پێکردووە و دواتر لە سەوڵاوا دیپلۆمی وەرگرتووە. هەورامان ئەڵێت[1]: «هەر لە سەوڵاوا درگای ئەدەبی کوردیم دۆزییەوە و بۆیە هەتا هەتایە دەستی مەنسوور ڕەحمانی ماچ ئەکەم کە فێری زمانەکەمی کردم».

ساڵی ٢٠٠٣ لە بەشی کارناسی زانستی پەروەردە لە زانکۆی کوردستان وەرئەگیرێت. ئەم شاعیرە یەکێ لە دامەزرێنەرانی «بنکەی ئەهورا»ی زانکۆی کوردستان بوو و یەکەم ژمارەی گۆڤاری «ئەهوورا»ی لەو زانکۆیەدا بڵاو کردۆتەوە.

لە ساڵانی ٢٠٠٥ و ٢٠٠٦ دا، دەبیری «بنکەی شێعرو ئەدەب»ی زانکۆی کوردستان و سەرنووسەر گۆڤاری «ساماڵ» بووە. ئەندامی بەڕێوەبەرایەتی چەندین کۆنفراس و کۆبوونەوە ی بووە، بۆ وێنە: کۆنگرەی سیاوچەمانە، کۆنگرەی هەڵەبجە و کۆڕی ڕێزلێنان لە شاعیران و هونەرمەندانی وەك گۆران، شەریف حسێن پەنایی، جەلال مەلەکشا، عەباس کەمەندی، مەزهەرخالقی، شێرکۆ بێکەس، عەبدوڵڵا.

هەورامان چەندین شیعری لە گۆڤارە کوردیەکاندا بڵاوکراوەتەوە. کۆمەڵە وتارەکانی یەکەمین کۆنگرەی وێژەی کوردی زانکۆی کوردستان، لەو ناو براوەوە بڵاوبۆتەوە و ئێستاش وەرگێڕانی کتێبی «ڕێزمانی کوردی هەورامی» لەبەر دەستدایە.

تۆ نازانی.!
سێبەرت دیوە
هەر چی جەستەیە حاشای لێبکات؟!
سێبەرێ ،
هیچی لە خۆت نەچێت و

١. وتوویژ لە گەڵ نووسەر.

تەمەنێک بە جەستەتەوە شۆڕ بێت؟!
سێبەری،
هیچ هەتاوێ نەیشواتەوە؟!
سێبەرێکی یاخی،
یاخی لە خۆت.!
کە دا ئەنیشم، ئەفڕێت!
کە ئەفڕم، ئەنوێت!
کە ئەگریم،
قاقای پێکەنینی وەڕزم کات!
من تەنیام و لە سووچی ژوورەکەم
مەرگ بەدوای دەرفەتێ ئەگەڕێ، پەلامارم بدا؛
کەچی سێبەری یاخیم لە گەڵ پۆلێ کچا
وانەی دڵداری لە بەر ئەکەن!
جەستەی بریناوی من،کفر دەرئەدا و
ئەو نوێژی شوکر سەر ئەدا!
زۆر جار لێم ئەشێوێت
من، ئەوم؛ یا
ئەو، منە؟!
تۆ نازانی!
گرفتاری ئایەندەیەکم کە پڕە لە
تابلۆی تاپۆی زامی ڕابردوو و
برینێک کە گرفتارە لە لەشما و
جەستەیێ لە گۆڕستانی باران□!

## خەدیجە جەهانی

بەهاری ساڵی ١٩٨٥ی زایینی لە گوندی بەرقەڵا لە دایک بووە. کچی کاک فەرەج و خاتوو فاتمەیە.

خوێندنی سەرەتایی هەر لە ئاواییەکەی خۆیان دەست پێکردوو و قۆناغی دواناوەندیشی لە مەریوان تێپەڕاند. بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕۆیشتە سنە و بڕوانامەی بەکالۆریۆسی زمان و ئەدەبی فارسی لە زانکۆی کوردستان وەرگرت. لە تەمەنی پانزە ساڵییەوە دەستی داوەتە پێنووس و بە نووسینی شێعر لە گەڵ حەوتەنامەی سیروان و گۆڤارە کوردییەکانی زانکۆی کوردستان، وەک: ئەهوورا، ساماڵ و هەژان هاوکاری کردووە. ئەم نووسەرە لە ئەندامانی ئەنجومەنی فەرهەنگی ـ ئەدەبی مەریوانە و کۆمەڵە شێعرێکی ئامادەی چاپە.

**بەشێک لە شێعری «ڕۆژ نییە زەوی لە دەورم نەگەڕێ»**

گەنمە تاوانم!
جانتای بەفرین شۆڕە بۆ شار
خۆر پڕووکا
لە دەوری باوکم گەڕێم
بە باڵی کۆتر ڕیازیترا!
تەرازم کە لە بیابان
چاو شانامە!
بەرد لە سەردەنگم بەن ـ نابێ
داسەنیگا کوڵەو ناتگا:
«بۆچی هێشتت خۆشم بوێی
کە ئەتزانی ڕۆژێک بە جێم دێڵی و
[دەڕۆی...!»
بڕیار تیراژی نەماوە
لە چاپت ـ ئەدەم
مافە چاپی لە زیندانە

ئیتر نەفەر نیم
نفرینم...!

## شنۆ جەوانڕوودی

ئەم نووسەرە لە مەریوان چاوی بە ژیان هەڵێناوە. وەک خۆی ئەڵێت کچی یاقووت خاتوونە و ناوی باوکی محەممەدە.

شنۆی جەوانڕوودی لە زمانی خۆیەوە بناسین: «بە پێی ناسنامەکەم، ئەڵێن، بیستی فیبرییەی ساڵی ١٩٨٥ لە دایک بووم. بەڵام تا ئێستەش بڕوام نەکردووە لە دایک بووبم. لە مەریوان ژیاوم و حەوت ساڵان بووم کە سەربەستی دەورانی منداڵیم گۆڕییەوە بە قوتابخانەی سەرەتایی «ئازادی». ئێستە کە لە زانکۆی «پەیام نوور»ی مەریوان ماف ئەخوێنم، هەر نازانم بۆ بە منالی ئەوەندەم حەز لە خوێندن و ڕۆیشتن بۆ قوتابخانە بوو؟!

نۆ ساڵم بوو لە حەوشەکەمان لە تەنیشت دار گێلاسێکدا، بە تەواوەتی لەش و گیانم، هەستم کرد ئەشێ بە باڵای بەهاردا بخوێنم. بەڵام تەنانەت یەک وشەم بۆ نەوترا ... ساڵێکیان دوو لاپەڕەم لە سەر ناوی «کەس لە گوڵ نەبێزراوە» ڕەش کردەوە ئەمجا تەلیسمی نووسینم شکاند. پێش ئەوەی ئەنجومەنی ئەدەبی بناسم و لە وێ ببمە ئەندام، لای مامۆستای بەڕێزم «کاک لوقمان پیرخزرانیان» فێری چێژی وێنەکێشان بووم. پاشان بە پێشوازی دڵسۆزانەی هاوڕێیانی ئەنجومەنی ئەدەبییەوە دەستم بە هەوڵدان کرد بۆ نووسین. لە تەمەنی شانزە ساڵییەوە لە ئێوارە شێعرەکانی ئەنجومەندا بەشداریم کردووە. هەروەها بە هاوکاری چەند هاوڕێی شاعیر و هەستیار، یەک لەوان کاک ڕەئووف مەحموودپوور، چەند ژمارەیەکی بلاڤۆکی «باران»مان لە ئیدارەی ئاموزش و پەروەرشیی مەریوان ( بۆ یەکەم جار بە کوردی و فارسی) باراند. لە گەڵ گۆڤاری سروەدا هاوکاریم کردووە و کۆمەڵە شێعرێکم ئامادەی بڵاو کردنەوەیە».

کێ سەیرمەکا؟
دەستم زۆر ئەکات و نایەت
تازە شۆردوومە پارەکە

گوێم ئەڵێم دوکتورا!
بینووسە!
نەهاتم بۆ بنووسە یان
بیخۆمەوە؟
سەرجەم دەسمان زۆرشت ئەکات
بەدەم پێوە
جا بمپێوە
ئەو ڕێگایە لە بەرم کردووە ڕەوان
کێ سەیرمەکا؟
هەرا دەی، ڕووت نیم
دوکتور گیان
تۆ گوێ مەدە!
بەم دەنگیشە
بە دەم ـ با ـ وە بەدەس بیگرە
بەدەس بینێرە
بینێژە
گوێ مەدە دوکتور
بە منیش
تەنیا وریای کەم خەوی بە
کە ئەشۆریەت
قەیناکا تازە شۆردووتە
پارەکە بۆم
بینووسە بۆم
کێ سەیرمەکا؟
ون بوونی نییە ئەم ڕێگا
حەب و حوبی دەستەکانم بۆ بنوێنە
ڕەوانم کاوەی پێویستە

جەستەم
زەحاکە دوکتور گیان!
سەیرێکی نەکراوەیە
کچ

### شنۆ ڕەحیمی

ساڵی ١٩٨٥زایینی لە گوندی «چەشمیەر» لە بنەماڵەیەکی فەرهەنگی چاوی بە ژیان هەڵێناوە، باوکی مامۆستا عەبدوڵڵا و دایکی ئامینە خاتوونە. سەرەتای ئاشنا بوونی قامکەکانی لە گەڵ پێنووس ئەگەڕێتەوە بۆ قوتابخانەی زێدەکەی و تا تەواو کردنە قۆناغی ناوەندی هەر لەوێ ئەمێنێتەوە. درێژەی خوێندنی تا وەرگرتنی دیپلۆم لە «سەولاوا» ئە بێت. ساڵی ٢٠٠٨ بەکالۆریۆسی ئەدەبی فارسی لە زانکۆی پەیام نووری مەریوان وەرگرتووە. شنۆ خاتوون یەکێ لە چالاکی بواری ئەدەبییە و بە کوردی( شێوەزاری هەورامی) شێعر ئەهۆنێتەوە. لە گەڵ گۆڤار و ڕۆژنامەگەلی سیروان، دیدگاه، مەهاباد، نەوشەفەق، ڕاسان و ئەهوورا بە شێعر هاوکاری کردووە.

**«گێڵەوە»**

وێرەگایە سەرد
گێڵەوە
شێعرەم مەیێ پیرایتوە
بۆ بە واران پەی پیاسەو وێرەگاکات
بۆ بە نەرگس
گێڵەوە
شێعرەم کەروو بە هەوارت
کێنی
تۆ کێنی

بیەیت
«تابلۆ پەنجەو مانگێن
ویاڵۆنوو وارانێوە نەشمیلانەین
لەنجەو لاروو سەرزەمینین»
نەویەیت
سەرئێشەو شۆنی گرەوای
بێ وەرمی نیمە شەوین
گێڵەوە
دڵم بە تۆ دان
سەرەم پەی کۆمنایرە
پەی وەشیت دوعام کەردە
گێڵەوە
با واچوو
وەشەویسیچ بێخەش هەنە!!

**محەممەد ناسری**

ساڵی ١٩٨٥ی زاینیی لە گوندی «بناوەچڵە» مەریوان چاوی بە ژیان هەڵێناوە. باوکی تۆفیق و دایکی کولسووم خاتوونە. بەڵگەنامەی کاردانی زانستە تاقیکاریەکانی لە زانستگای سنەدا وەرگرتوە.

هەر لە سەردەمی خوێندنی ناوەندییەوە حەزی لە فێربوون و خوێندن بە زمانی کوردی بووە. خوێندنەوەی کتێبی «چێشتی مجێور»ی مامۆستا هەژار لە کاتێکدا کە هێشتا کوردی نەزانیوە هاندەری سەرەکی ئەو، بۆ فێربوونی کوردی بووە.

ماوەی دوو ساڵ لە ناوەندی فەرهەنگی ئەدەبی ڕێباز لە زانستگای سنەدا چالاکی نواندوە. ئێستاش خەریکی خوێندنی بەکالۆریۆسی ئەندازیارییە.

وەرگێڕان:

١- کاریگەریی، تێکەڵی و خۆیی بوون لە دە خولەکدا.
٢- بیرەوەریەکانی بێنەزیر بووتۆ
٣- لە دە حەفتەدا جوان ببنەوە
٤- وەرگێڕانی چەندین بەرهەم لە بواری ئەدەبی منداڵاندا لە فارسیەوە بۆ کوردی و...

## سورەیا ئەمینی

سورەیا ئەمینی کچی محەممەد، لە دایک بووی ساڵی ١٩٨٦زایینیە. بەڵام بە ڕای خۆی ئەوکاتە لە دایک بووە کە پێنووسەکەی لە سەر شەقامی پەمەیی کاغەزەکان پیاسەیان کرد. لە منداڵییەوە حەزی لە شێعر و شێعرنووسین کردووە.

هەوەڵین کتێبی شێعری بە ناوی «ڤیان» لە ساڵی ٢٠٠٣ بڵاو بووەوە کە دەسکەوتی شێعرەکانی تەمەنی پانزە تا حەڤدە ساڵی بووە. لە ساڵی ٢٠٠٣ هەوەڵین شێعری بە ناوی دڵنیا کە پێشکەشی کردبوو بە پێنج هەزار شەهیدی هەڵەبجە لە ڕۆژنامەی «پیام مردم» بڵاو بووەوە. سورەیا ئەمینی لە گەڵ چاپەمەنی گەلێکی وەک سیروان، ئاسۆشدا بە شێعر و وتار هاوکاری کردووە. ئەم نووسەرە ئێستا دانیشتووی مەریوانە.

## عەدنان بادزۆهرە

ساڵی ١٩٨٧ی زایینی لە سەردەمی شەڕی ماڵ وێران کەری ئێران وئێراق لە بنەماڵەیەکی دەست کورت و قەرەباڵغ لە گوندی «باخان» لە دایک بووە. تا وەرگرتنی دیپلۆم لە قووتابخانەکانی شاری مەریوان درێژە بە خوێندن ئەدات.

بە وتەی خۆی: «کتێبی نووسەرە گەورەکان و ڕۆمان لە گێژاوی خۆیاندا نووقمیان کردم.»

لە تەمەنی پازدە ساڵییەوە دەس بە نووسین ئەکات و چیرۆکێکی درێژ بە ناوی بە زندگی برگردیم (بگەڕێینەوە بۆ ژیان) چاپ و بڵاوی دەکاتەوە.

ناوبراو دووهەم بەرهەمی خۆی لە ژێر ناوی «چاوانی سپی ژنە پیانیست» ئامادە

دەکات کە ئیجازەی بڵاو بوونەوەی پێنادرێت. ئەمە کاردانەوەی نگەتیڤی لە سەر دائەنێ و بۆ ماوەیەک پێنووس دائەنێت و دەست لە سەردەست چەند جارێک تا سنووری خۆکوشتن پێش ئەچێ. دواتر ڕائەچڵەکێت و کتێبێکی تر لە ژێرناوی «وقتی فرشته ها گریه می کنند» ئەنووسێ کە ئێستا ئەویش لە بەردەست خوێنەراندایە. بادزۆهرە پیشەی شیرینی فرۆشی هەیە و ئێستا لە شاری مەریوان دائەنیشێ.

### هانا سەیفی

لە وەرزی زستانی ساڵی ١٩٨٨ی زایینی لە مەریوان چاوی بە ژیان هەڵێناوە. قۆناغی سەرەتایی تا دیپلۆم لە مەریوان تەواو ئەکات و فەوق دیپلۆم لە بەشی زمان و ئەدەبیاتی ئینگلیزی لە زانکۆی هەمەدان وەر ئەگرێت.

سەرەتای نووسینی ئەگەڕێتەوە بۆ قۆناغی ناوەندی. ساڵی ٢٠٠٢ یەکەمین کۆمەڵە شێعری کە تێکەڵاو بووە لە گەڵ بیرێکی قووڵی ئەویندارانە، لە ژێر ناوی «ارزانی چشمان تو» بە دوو زمانی کوردی و فارسی چاپ و بڵاو ئەکاتەوە.

ساڵی ٢٠٠٣ بیر و بۆچوونەکانی ژیانی ئەگۆڕێت و زمانی نوێ بۆ شێعرەکانی هەڵ ئەبژێرێت و لە چەندین مێهرەجانی شێعری قوتابیاندا لە شارەکانی سنە و هەمەدان بەشداری ئەکات و خەڵاتی پێ ئەبەخشرێ.

هانا ئێستا خەریکی وەرگێڕانی کۆمەڵە شێعری «قەڵا»ی جوانەمەرگ «ژیلای حسێنی» بۆ سەر زمانی فارسییە.

### غەزاڵ کەریمی

غەزاڵ ساڵی ١٩٩٠ی زایینی لە گوندی« قەڵاگا» لە بنماڵەیەکی مام ناوەندی چاوی بە ژیان هەڵێناوە. کچی« علی» و «مریەم» خاتوونە.

لە دوای شەش ساڵ تێپەڕ بوون بە سەر ژیانیدا، باوکی ماڵ

ئاوایی لە ژیان ئەکات و ئەرکی بە خێو کردنی ئەکەوێتە ئەستۆی دایکێکی لێهاتوو و برایەکی ئەمەک ناس.

تا کۆتایی دواناوەندی قۆناغەکانی خوێندنی لە زێدەکەی خۆی و شاری سەولاوا بڕیوە. شێعرەکانی عەبدوڵڵا پەشێو، شاملو، هێمن و هەژار ئەبن بە هاندەری بۆ دنیای شێعر و نووسین. ساڵی ٢٠٠٥ دەست لە مل پێنووس ئەکات و شێعرەکانی ئەکات بە دەستپێکی کرانەوەی قوتابخانە و زاخاودانی مێشکی هاوپۆلەکانی. بەری ڕەنجی ئەم کچە شاعیرە، کۆمەڵە شێعرێکە کە هێشتا چاپ و بڵاو نەبۆتەوە.

خوشکی ڕوخاو
تەرمی سووتاو
قەد نەبینراو
وای لە نێو تاوانی بێبەشیدا
لێت دەڕژێت مەینەتی لە دایک بوونت
گوناهت بوونی قژی درێژ و جلی نەبینراوتە
کەی دڵت شەقی برد توانی تاوان باران لە بن بێنیت
ئاگادار بە و خۆت مەخە نێو ئەو خەڵووزەی بۆت گەش کراوە
با ڕووناکی نەدات لە سەر جلی زەرقاویاندا
سارێژ بووە زامەکانیان کاتێ تۆیان ئاوا بینی
هەستانەوە بۆ بیسمیللا و بۆ هەڵپەڕکێ
پێشکەشکە پێیان حەیا و ئابڕو و نامووس
پێت ناکرێ پێکەنینی هیچ سووتاوێک

## هەیاس غەریبی

لە وەرزی زستانی ساڵی ١٩٩١ی زایینی لە هەورامانی تەخت مەکۆی ئەدیبان و خواناسان، لە بنەماڵەیەکی ئایینی و ئەدەب دۆست و دەست کورت چاوی بە ژیان هەڵێناوە. باوکی «جەمال» و دایکی «نەزیرە»خاتوونە. لە سەرەتای منداڵییەوە شێعری شاعیرانی پایەبەرزی هەورامان لە لایەن باوکیەوە بۆی ئەخوێنرێتەوە و ئەبێ بە هەوێنی شێعر و هۆنینەوە لە بیر و هزریدا. بە دەسپێکردنی خوێندنی سەرەتایی و ئاشنا بوون لە گەڵ پیتەکاندا، یەکەم هۆنراوەی بەبۆنەی «حەوتووی مامۆستا»وە، ئەهۆنێتەوە و مامۆستایانی دڵسۆزی قوتابخانەکەی ئەو بەهرەیەی تێدا ئەبینن و زۆرتر هانی ئەدەن. ئاشنا بوون لە گەڵ هۆنەران و هەڵبەستوانانی تر لە کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا کاریگەری ئەرێنی لە سەردائینێت و زۆرتر ڕوو لە دنیای شێعر دەکات. لە کۆڕ و کۆبوونەوە فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی و ئایینیەکاندا دەر ئەکەوێت و سەرنجی جەماوەر بۆ هۆنراوەکانی ڕائەکێشێ و پێگەی خۆی لە نێو هەڵبەستوانانی هاوچەرخدا ئەدۆزێتەوە و نازناوی «غەریبی» بۆ هۆنراوەکانی هەڵئەبژێرێت.

لە دوای تەواو کردنی قۆناغی ناوەندی بە شێوەی ڕەسمی واز لە خوێندنی قوتابخانە دێنێت و ڕو لە حوجرە و مزگەوت دەکات. بە وتەی خۆی: هۆکاری سەرکی لە ڕۆیشتن بۆ حوجرە ئەوە بوو کە، هەستی ناسک و هۆنراوەی هەست بزوێنی شاعیرانی پێشترم بە ئاشنا بوون لە گەڵ بنەما ئایینیەکان و زمانی عەرەبی ئەزانی، هەر بۆیە بە شێوەی ئازادیش درێژەم بە خوێندنی قوتابخانە داوە.

ئەم شاعیرە لاوە لە گەڵ هۆنینەوەی شێعر و هەڵبەستدا، خەریکی کۆکردنەوەی پەندی پێشینیانی دەڤەری هەورامان و چیرۆکی ئەفسانەیی و وشە ڕەسەنەکانی هەورامییە.

لە پێناسەی نەتەوەکەیدا ئەڵێ: «ئێمە ئەو کەسەین کە فەرهەنگ و تۆرەمان پێناسەمان ئەکات».

**«ئەشقی پاک»**

عەیبەن ئەشقی وێت بزانی بە پاک
وێنەش نەوانی تۆ نە سەر ڕووی خاک
هەر ڕۆ ئینتیزار تازە یارێ بی
چی حاڵەت هەر شەو تا نەهارێ بی
ئەشقش مەزانە مەردی بێ چارە!
ئەسیری دەستی نەفسی ئەمارە
چوون ئەگەر خودای ئەی پەنی ولاّت
نێعمەتی ئەشقش کەردێنی خەلاّت
وێنەی فەرهاد و مەجنوون بێ کارت
شیرینێ لەیلێ کەرێنی یارت
«غەریبی» دڵ پڕ نارەکەی ئەوسان
ئەشقش هەر ئەشقی یارەکەی ئەوسان

**«قەدیم یانەی دڵ»**

بازە دڵ پەرێت هەر وێرانە بۆ
با هەر تەشریفت لای بێگانە بۆ
ئەر بە ناوەشیەم کەیفوو تۆ سازا
زانە نازەنین وەشیم ئانە بۆ!
پەروا نەدارۆ! دڵەی بێ کەیفم
هەتا تۆ شەم بی هەر پەروانە بۆ
دووری مەتاوۆ کەم کەرۆ مەیلت
تۆ هەر نەدڵنی تا زەمانە بۆ
مەبرو تەماعت دیدەی بێ شەوقم
ئەر سەد کە گۆشم پڕ جە تانە بۆ
ئەر قابل زانی تاکە ڕۆی مەردەن
دڵەی «غەریبی» قەدیم یانەی بۆ

**شەوبا ڕەحیمی**

ساڵی ١٩٩٢ی زایینی لە گوندی «قەلاّگا» چاوی بە ژیان هەڵێناوە. باوکی «مامۆستا لەتیف» و دایکی «مریەم» خاتوونە.

سەرەتای ئاشنا بوونی لە گەڵ دێڕ و وشە ئەگەڕێتەوە بۆ

قوتابخانە زێدەکەی. وەک قوتابیەکی چالاک و لێهاتوو بوارەکانی خوێندن لە قەڵاگا و قەڵاجێ تا قۆناغی دواناوەندی بڕیوە.

زۆر زوو لە قۆناغی ناوەندیدا بە بیستنی شێعرەکانی شاملوو، شێرکۆ، سۆهراب، سوارە و شەفێعی کەدکەنی، لەگەڵ دنیای شێعر و ئەدەبیاتدا ئاشنا ئەبێت. ئەم کچە شاعیرە هەستی خۆی و ژانی کۆمەڵگای بە شێعر ئەهۆنێتەوە و بەری ڕەنجی لە بواری شێعردا، کۆمەڵەشێعرێکە کە هێشتا بۆی نەلواوە چاپ و بڵاوی بکاتەوە.

وەک داکەوتنی ڕەشی خۆم بۆ نێو سکی دایکم تووڕەم لە بوونم لێرەدا
ماندووم لە تەواوی تراژیدیاکانی عەشق
دڵ پڕ لە زوخم بۆ خوێنی ڕژاوی وڵات
بۆ ئێوارە بەرتەنگەکانی ئێوارەکەی و هەموو ئەو بەهارانەی
کە چاو لە دوای هەنارە سوورەکەی ئازادی بە جێی ئەسرین
چاو پڕ لە خوێن چاویان نووقاند
تاق تاق کەرەش لە سەردەمەکانی خوێندن دایە
وەلێ من نازانم گوایە ئێوەش نازانن
کە زاقی کام خۆشی و کام بەهارە
کە لە زستان هەنک هەنک خۆی گەیاندە ئەم خوێنستانە
ئاخ هێدی هێدی گیانم بەردا، گیانم کێشرا، گیانمان کێشراو بەردەوام هەر ئەکێشرێت.
وەلێ بۆچی چوونکە شەوێک شەربەتی نێو دەماری تۆ بووە شەوچەرەم
چوونکە شەوێک سەربڕینی وڵات کەلەپاچە بوو بۆ بەردڵی بەیانی
چوونکە جێگای مەحاکەمە تەجاوزێک بوو
چوونکە هەموو خەونەکانتان دادڕی لە چاوانمانەوە
نازانم بەختی کام ڕۆخانە سوور بووە کە ئێمەی بەرکەوت
ئاگرەی کام بێستان بوو؟ قیژەی کام جووخە گا بوو؟
وادەی لە سێدارەدان کام دەمەو بەیان بوو؟
یان شڵپ و هۆڕی کام شەپۆلە مەرگ بوو؟

نا ئەمە گوناحی من نیە دایە کە کەڵەکی چوار چێوەی کچ بوونم گەز بە گەز هەریەک جارە هارەی ڕووخانی لێوە هات
نا ئەمە تاوانی من نیە کە ئێشی ژن بوون تا ئاکامی هەڵجولانی هەناسەم لە گەڵایە
نا ئێمە قەت خوازیاری سەربڕینی دارسنۆبەر و پێشێل کردنی
قوڵینە زەیتوونەکان لە ژێر ساباتی عەشقدا نەبووین
ئیدی دەستم بەردەن ئەی خەونە زڕەکانی پڕ لە تەلیسمی کاڵی ساتەکان لێرە کەس فریادڕەسی هاوارەکان نیە
من تا ئێستا بۆ کێ دەدوێم

## سەرچاوەکان


- بنەماڵەی زانیاران، مامۆستا مەلا عەبدولکەریم مودەڕیس
- تاریخ مشاهیر کرد، بابا مەردۆخ ڕۆحانی
- دانشمندان کرد در خدمت علم و دین، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، وەرگێڕاوی ئەحمەد حەواری نەسەب
- تاریخ مەردۆخ، شێخ محەممەد مەردۆخ کوردستانی
- بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد، بەرگی ۱و۲و۳و۴و۵و۶و۷و۸، مامۆستا محەممەد عەلی قەرەداخی
- ئالبۆمی کەشکۆل، مامۆستا محەممەد عەلی قەرەداخی
- سەدەیەک تەمەنی نوورین، عبدلداییم مەعروف هەورامانی
- شاعران کورد پارسی گویی، سەید عەبدولحەمید حیرەت سەجادی
- خێزگەی سەیدی و خەرمانەی ئەدەب، ڕەئووف مەحموود پوور
- پەراوێزێک لە سەر ژیانی مەلا خزر ڕووار، جەمیل فارۆقی
- دیوانی مامۆستا قانع
- دیوانی مدرس کردستانی
- دیوانی صیدی، محەممەد ئەمین کاردۆخی
- باخچەی کوردستان، بەندی دووهەم لە دیوانی قانع
- یادی شاعیرانی کورد، حامد حیسامی
- چەپکە گوڵێ لە گوڵزاری عوسمانی
- نورالانوار، سەید عەبدولسەمەد تواری
- چەمکێک لە مێژووی مەریوان و هەورامان، حەمەی مەلا کەریم
- دیوانی مەلا حەسەنی دزڵی، ئەحمەد نەزیری
- مێژووی وێژەی کوردی، بەرگی ۱و۲، سدێق بۆرەکەی
- دیمانەی نووسەر لەگەڵ شاعیران و نووسەران یان بنەماڵەی ئەو بەڕێزانەی کە کۆچی دواییان کردووە.

## پێڕستی ناوەکان

**( Poets and Writers of Marivan and Hewraman)**

**Compiled and Edited By:**

**Fateh Mostafaei**

... دیتنی ژیانی پێشکەوتووی پڕ لە جم و جووڵ و هیوا و شانازی لە لای بەشێک لە وڵاتانی جیهان لە جەمسەرێک و داماوی و کڵۆڵی و چەق بەستوویی و تاریکی و نادیار بوونی ئاسۆی ژیانی داهاتوو لە جەمسەرەکەی تری جیهان دا کە تۆشی لە گەڵ دای، بەرەی تازەی پێگەیشتووی چاوکراوە لەم جەمسەرە دەباتە سەر هەڵدێری بێ هیوایی و دابڕان لە خۆی و فەرهەنگ و کەلەپوورەکەی. ئەم حاڵەتە دەروونی یە هەر ئێستا یەکێک لە گیروگرفتەکانی جیهانی سێهەمە کە ئێمەی کوردیش تێی دا دەژین و وای لێکردووین تەنانەت نەتوانین بە باشی کەڵک لە ئاڵ و گۆڕەکان و هەلە هەڵکەوتووەکان وەربگرین. کورتەی کەلام: خۆ لە بیر بردنەوە و خۆ بە هێند نەگرتن بۆ تاک و بۆ کۆ، بۆ گەل و نەتەوە، هۆکاری سەرەکی فەوتان و تێداچوونە و ئەرکی ڕووناکبیری دڵسۆز و زانا بەرگری کردن لە پەرەگرتنی بارودۆخی لەم چەشنەیە...

«لە پێشەکییەکەی ئەحمەد قازی»